# سەردەم 41

تشرینی یەکەم
2005
ســـــــاڵی شەشەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی


خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

کاری کۆمپیوتەری: تاڤگە فائق

سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد ڕەفیق



ناونیشان

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347

دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

www.sardam.info



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە


–سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

–تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

–هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

# ناوەرۆك



## فایلی ژمارە

## ئێدوارد سەعید



## وێستگەكانی سەردەم



**نرخی (1200) دینارە**

# قەیرانی مۆدێرنە و گەڕانەوەی دیۆنیزۆس

محەمەد مزوز
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**یەکەم:**

**"دیۆنیزۆس" کێیە؟**

لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا *Dionysos* خواوەندی مەی و مەستیە و لە ڕیزی گرنگترین خواوەندەکانی یۆناندایە.. بەشێوەیەکی سەیر دێتە دنیاوە و ژیانیشی پڕیبووە لە چەرمەسەری. لە هەلومەرجێکی زۆر ئالۆزدا لە دایك دەبێت و کوڕی *Zeus* خواوەند و *Semele* بووە (ئەمە ژنە و خواوەند نییە)، لەبەرئەوە باوکی بینیویەتی نەك دایکی. *Zeus*ی خواوەند *Dionysos* لە هەناوی خۆی دێنێتەدەرێ و بۆ ماوەی سێ مانگ لە جەستەیدا دەیهێڵێتەوە، بۆ ئەوەی سوڕی لەدایکبوونی خۆی بەشێوەیەکی سروشتی تەواو بکات. لە دایکبونی *Dionysos* بەمجۆرە دەبێتە مایەی ورووژاندنی ڕك و ئیرەیی *Hera* ی ژنی *Zeus*.

ئەوەش *Zeus* ناچار دەکات *Dionysos* بکات بە کچ و بیداتە دەست *Athamas* و *Ino* بۆ ئەوەی پەروەردەی بکەن. بەڵام *Dionysos* لە نەفرەت و توڕەیی *Hera* دەرباز نەبوو، کاتێك ئەقڵی لە *Athamas* و *Ino* سەندەوە و دێوانەی کردن. ئەمە *Dionysos*ی ناچار کرد سەری خۆی هەڵبگرێت و ڕوبکاتە ناوچە دوورەکان. لەم سەروبەندەدا و بە مەبەستی چەواشەکردنی *Hera*، *Zeus* هەستا بە گۆڕینی *Dionysos* بۆ گیسك و چەند حۆریەکی ڕاسپارد تا چاودێری بکەن و ئاگایان لێی بێت.

سەروەختێك *Dionysos* گەیشتە تەمەنی لاوێتی، نەفرەتی *Here* هەر بە دوایەوە بوو تا دوچاری دێوانەیی هات و وێڵی دنیابوو. بچوایەتە هەر شارێك، خەڵکی فێری شێوازی شەتڵکردنی ترێ و چۆنیەتی دروستکردنی مەی دەکرد. سەفەرە تراژیدیەکانی *Dionysos* لە نێوان میسر و سوریا و یۆنان و وڵاتی *Thrace* بەردەوام بوو. لە وڵاتی *Thrace* لە دێوانەیی قوتاری دەبێت و لە نهێنیەکانی *Cybele* شارەزا دەبێت و هەوڵدەدات (شەتڵکردنی ترێ و دروستکردنی مەی)، داخلێ بە مۆرجیاری و

ڕێنوماییەکانی ئەو خواوەندە بکات، بەڵام *Lycurgue*ی فەرمانڕەوای هەرێمی *Thrace* بەو کارە ڕازی نابێت و لە پای ئەمەدا *Les bacchantes* (شوێنکەوتوانی *Dionysos*)، زیندانی دەکات و *Dionysos* ناچار دەبێت هەڵبێت و پەنابەرێتە بەر *Thetis*. دواتر *Dionysos* دەتوانێت *bacchantes* *Les*ئازاد بکات و *Lycurgue* دیوانە بکا و *Thrace* بکاتە سەرزەمینێکی قات و قڕ. بەمجۆرە *Dionysos* ڕێی بکەوتایەتە هەر ولاتێك ڕینوماییەکانی خۆی پێدەگەیاندن، تا کار گەیشتە ئەوەی تەواوی ولاتانی سەردەریای سپی ناوەڕاست بوونە هەوادار و شوین کەوتوی ئەو. پاش ئەوە *Dionysos* بە کەژاوەیەك لە شوێنکەوتوانی و هەوادارانیەوە بەرەو هندستان بەڕێدەکەوێت، لە کاتی گەڕانەوەشیدا هێزی زۆری لەو ولاتانەدا نیشاندا کە فەتحیکردن و زۆر لە میللەتانیش ملیان بۆداو بڕوایان بە بۆچونەکانی هێنا.

*Dionysos* بەر لەوەی بەرەو شاخی ئۆلمپ سەر کەوێت تا لەلایەن خواکانەوە پێشوازی لێبکرێت دوای ئەوەی تەواوی مافەکانی خۆی وەرگرتەوە، دابەزیە قولایی دۆزەخ بۆ ئەوەی *Semele* دایکی لە سزادان ڕزگار بکات و سەری بخات بەرەو ئاسمان. ڕێنوماییەکانی *Dionysos* بە تەواوی ولاتی یۆناندا بلاو بووەوە و ناوی بوو بە سیمبولێك بۆ ئەو هێزی جۆش و خرۆشەی لە ناو دەنکە ترێکان و لە ناو سەرجەم ڕووەك و میوەجاتەکاندا هەیە. لە هەمان کاتدا بوو بە خوداوەندی باخچە و دارستانەکان و ئاو وەکی ڕەگەزێکی شل و سەرچاوەی سەرەکی ژیان.

ناوی *Dionysos* بوو بە ڕەمزێك بۆ ژیانی کەیف و سەفا و ئەو ئاهەنگانەی بە شەوقەوە *Les bacchantes* یادیاندەکردەوە، بەهۆی *Les bacchantes* ڕۆمانیەکان ناوی *Bacchus* یان بڕی بەسەر *Dionysos*دا. لەوەش گرنگتر یۆنانیەکان *Dionysos* بە خواوەندی پاراستنی هونەرە جوانەکان *Les beaux-arts* دەزانی، بە تایبەتیش ئەو تراژیدیا و کۆمیدیایەی لەو ئاهەنگانەوە سەرچاوەیان دەگرت کە *Les bacchantes* سازیاندەکرد. کارە هونەرییەکان *Les oeuvres dart* وێنەی *Dionysos* یان وەك خواوەندێکی گەنج نیشان دەدا کە تاجە گوڵینەیەکی لە لقی مێو و هێشووە ترێ لەسەر دەنا.

*Dionysos* ئەو خواوەندەی بە دیوانەیی ئاوارەی ولاتان بوو، بۆ ئەوەی خەڵکی فێر بکات چۆن وزەی ژیان *La Seve de La vie* بپارێزن، کە شێوازی مەی دروستکردن تەعبیری لێدەکات. لەسەرەتای ئاوارەبوونیەوە بە منداڵی، خواوەندەکان یۆنانیان خستە ژیانێکی ئەنگوستەچاوەوە یان وەکی ئەوەی *Holderlin* پێی دەڵێت: (شەوی خواکان). لەبەر ئەوەی دوای ڕۆیشتنی *Dionysos*، خواکانی تر بوون بە بونەوەرگەلێکی ژیر و مەعقول و ڕێگایان بە بەزم و ڕەزمی شەوانە نەدەدا و نکوڵییان لە وزەی ژیان کردبوو، بەمجۆرەش ئەگەر تەعبیرەکەی "برگسۆن" بەکاربێنین ئەوا دەتوانین بڵێین: زیندوێتی و خرۆشی *Ielan vital* پاکتاوکرابوو.

*Dionysos* خواوەندی وێڵگەردی، پێچەوانەی سەرجەم خواکانی دیکەیە، لەبەرئەوەی ڕەمزی دێوانەیی و بێئەقڵیە، ڕەمزی شەراب و مەیە کە هیچ بیرکردنەوەیەکی ئەقلانی و مەعقول ناهێڵێت. ئەوەی وای لە *Dionysos* کرد — سەرەتا بە ناچاری و دواتر بە خواستی خۆی—، ولاتی یۆنان جێبهێڵێت

بۆ ئەوەی لە دژی سستمەکانی ئەقڵ بجەنگێت و میللەتان لە دەست پەرستنی ئەو بەهایانە قوتار بکات کە خزمەت بە زیندەگی ناکەن.. هەروەها *Dionysos* خواوەندێکە خواوەندەکانی ئەقڵ ئیعترافی پێناکەن، لەبەر ئەوەی سیمبولی دێوانەیی و سەرشێتییە، رەمزی پایەماڵکردنی ئەرزشە میسالیەکانە، هێمایەکە بۆ خرۆشی و زیندویەتی، بە کورتیەکەی رەمزی ژیان و زیندەگییە.

## دووەم:

## پەیوەندی "دیۆنیزۆس" بە مۆدێرنەوە چییە؟

ئەوەی سەرنجمان بۆ پێگەی *Dionysos* لای یۆنان رادەکێشێت، بەو پێیەی ئیلهام بەخشی بلیمەتی یۆنانیە لە بواری ئەفراندنی هونەریدا، "فردریك نیچە"یە. هەر ئەویشە پەی بە بالا دەستی بەها میتافیزیکیەکان دەبات کە دژ بە ژیانە و بە درێژایی دوو هەزار ساڵ بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی داگیرکردووە. بالاّ دەستی ئەم بەها (ئەقلاّنیانە)، رەگوریشەکەی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمانی کۆن و لەگەڵ "سوکرات" و "ئەفلاتۆن"دا دەست پێدەکات، لەسەدەکانی ناوەراستیشدا مەسیحیەت دەیقۆزێتەوە و بەمجۆرە فیکری ئەوروپی داخڵ بە دۆخێکی نەزۆکی تیۆری و متبونێکی قوڵ دەبێت. بەلاّم سەروەختێك ئەوروپا پێدەنێتە سەردەمی نوێ، ئەقلاّنیەتێکی نوێ دێنێتە ئارا کە لەسەر ئاستی فەلسەفی "دیکارت" و لەسەر ئاستی فیکری زانستیش "فرانسیس بیکۆن" و لەسەر ئاستی فیکری سیاسی و کۆمەلاّیەتیش، بیریارانی رۆشنگەری بنەما سەرەکیەکانی دادەرێژن.

سەردەمی مۆدێرنە مرۆڤی ئەوروپی لە بوونەوەرێکی ئاینیەوە (مرۆڤی سەدەکانی ناوەراست)، دەگۆرێت بە بوونەوەرێکی ئەقلاّنی (مرۆڤی مۆدێرن). مۆدێرنەش بریتیە لەو خواستە توندوتیژەی هیچ سنورێك ناناسێت و ئارەزوکردنە لە کەشفکردنی ئەو نهێنیەی سەردەمانێك پێگەی ئیمانبوو: کێشەی مۆدێرنە لەگەڵ سەدەکانی ناوەراستدا بریتیە لە کێشەی ئەقڵ دژ بە ئیمان. بەلاّم ئەو مەعریفەیەی ئامانجی مۆدێرنە بوو مەعریفەیەکی تیوری نەبوو – بۆ نمونە وەکی لای یۆنان هەبوو–، بەڵکو مەعریفەیەکی عەمەلی بوو. ئامانجی کۆنترۆڵکردنی سروشت بوو تا مرۆڤ تێیدا ببێتە سەردار و سەروەر، پاش ئەوەی لە سەدەکانی ناوەراستدا کۆیلە بوو. بەمجۆرە بۆ یەکەمجار لە مێژووی فیکری مرۆڤایەتیدا مەعریفە و دەسەلاّت جوتبوون. ئەم پەیوەندییەی نێوان مەعریفە و دەسەلاّت دەرەنجامی عەمەلی لێدەکەوێتەوە و رەفتار و هوشیاری مرۆڤی خۆرئاوا دیسپلین دەکات، ئەم پرۆسەیەش لە سەرەتای سەدەی حەڤدەوە دەست پێدەکات. هەر لەم سەدەیەدا ناوە دیارەکانی ئەقلاّنیەتی ئەوروپی، لەسەر و هەموشیانەوە "رینییە دیکارت و فرانسیس بیکۆن" دێنە ئارا. "دیکارت" لەکتێبی (وتارێك دەربارەی میتۆد)دا سیمای ئەم ئەقلاّنیەتە دیاری دەکات و مەنهەجێکیشی بۆ دادەنێت. لە سەرەتای ئەو کتێبەدا "دیکارت" دەڵێت: (ئەقڵ ئەو شتەیە بە یەکسانی بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا بەشکراوە). ئەگەر مەسەلەکە بەو جۆرە بێت ئەوا ئەقڵ دەبێتە تاکە پێوەرێك بۆ حەقیقەت.

بنەمای یەکەمی فەلسەفەکەی بەمشێوەیەیە: (لە حوکمەکانمدا هیچیان پەسەند ناکەم، جگە لەو حوکمەی زۆر بە ئاشکرا بەرجەستە دەبێت، بە جۆرێك کە هیچ گومانێك لە خۆنەگرێت).

## دەشێت چی لەم بنەمایەدا بخوێنینەوە؟

(قبولی ناکەم..)! "دیکارت" یەکەمین کەسە ئەوروپییەکانی فێرکردبێت بڵێن: نا. لە کاتێکدا پێشتر -واتە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا- مرۆڤی ئەوروپی دەیوت: (بەڵێ، واتە ملکەچکردن بۆ دەسەڵات - دەسەڵاتی فیودالٚ/ کڵێسا/ بەهاکان). بەڵام "دیکارت" هات و وتی: نا! ئەو میتۆدەشی هێنایەئارا -میتۆدی گومانکردن-، بۆ ڕەتکردنەوەی میراتی فیودالٚ/ کڵێسا/ مەسیحیەت، بوو.

هاوکات لە بەریتانیا "فرانسیس بیکۆن" هات بۆ ئەوەی هەمان شت بڵێت، بەڵام لە بوارێکی تردا کە بواری زانستە سروشتیەکان بوو.. "بیکۆن" داوای دەکرد ئەو وەهم و خورافانە وەلاوە بنرێت کە ڕێگانادەن ئەقلٚ بگاتە ڕاستیەکان، واتە ڕێگانادەن ئەقلٚ ئەو یاسا فیزیاییانە بدۆزێتەوە کە سروشت ملکەچیانە، یان گوێ بیستی سروشت بین، بۆ ئەوەی تێیبگەین و دواتریش بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی بکەین.

بە کورتی ئەوروپا بە چەك و تفاقی ئەقلٚ و زانست داخلٚ بە سەردەمی مۆدێرن بوو، بەڵام بابزانین ئەو دەرەنجامانە چی بوون لەم پرۆسەیە کەوتنەوە؟ سەردەمی نوێ مژدەی ئازادکردنی مرۆڤی پێبوو لە دەست خورافاتی سەدەکانی ناوەڕاست، هەروەها مرۆڤی کردە سەرداری سروشت و دروشمگەلێکی وەك: ئازادی و یەکسانی و برایەتی و دادپەروەری و.. هتد، بەرزکردەوە. لێرەوە ئەقلانییەت هەژمونی بەسەر هەموو بوارەکاندا پەیدا کرد، هەر لە زانستەوە تا بواری سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی. لەلایەکی ترەوە مرۆڤ لە دەست دەسەڵاتی دەرەبەگ و دەسەڵاتی کڵێسا ڕزگاری بوو.. چەندین شۆڕشی سیاسی بەرپا بوو، سستمی دیموکراسی لە حوکمڕانی کردندا هاتە ئاراو پرانسیپەکانی زانستگەرایی تەشەنەیانکرد و دەرەنجامەکانی زانست بەسەر سروشتدا پراکتیزەکران، بەمجۆرەش تەکنۆلۆژیا پەیدا بوو. لەگەڵ پەیدابوونی تەکنۆلۆژیاشدا کەرەستە خاوەکان گۆڕان و کرانە شتومەك و بازاڕەکانیان پڕکرد. ئابووری گۆڕانی گەورەی بەسەردا هات و سەرمایەیەکی زۆر کەڵەکە بوو کە بووە مایەی زێدەبایی. بازاڕەکانی ناوخۆ توانای لەخۆگرتنی ئەو لێشاوی کاڵاو شمەکانەیان نەبوو کە سەرمایە گوزاری ئەوروپی بەرهەمی دەهێنان، بۆیە بیر لە دۆزینەوەی بازاڕی دەرەکی کرایەوە. دۆزینەوە جوگرافیەکان و هەروەها دۆزینەوەی باروت و چاپخانە، ڕێخۆشکەربوون لەبەردەم چونە دەرەوەی ئەوروپییەکاندا، بەمەبەستی دۆزینەوەی بازاڕی زیاتر بۆ ساغکردنەوەی کاڵاکانیان و دۆزینەوەی سەرچاوەی زیاتر بۆ بەدەست هێنانی کەرەستەی خاو. لە دەرەنجامی ئەمەدا دیاردەی کۆلۆنیالیزم پەیدا بوو، بەمەش کە میللەتانێکی زۆر کەوتنە ژێر دەستی گەلانێکی (شارستانی) کە هەڵگری بەهای ئەقلانییەت و پرانسیپی زانستی بوون، لە پای ئەمەدا جەنگێکی خوێناوی بەرپابوو. هەروەها کێشە و کێبەرکێکانی وڵاتانی ئەوروپی لەناوخۆیاندا، قەیرانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری گەورەی دروستکردو لە ئاکامیشدا فاشیزم و نازیزم پەیدابوون و قەڵای ئەقلانییەت لەو کیشوەرەدا هەرەسی هێنا.

لەبەرامبەر ئەو دۆخە ناهەموارەی کۆمەڵگەی خۆرئاوای تێکەوت، بیرمەندگەلێك پەیدابوون، کەوتنە گومانکردن لە ئەقلانییەت و لێپێچینەوە لە

زانستگەرایی. ئەو بیریارانە پێیان وابوو ئەو مەرگەساتەی بەسەر کۆمەڵگەی مۆدێرندا هاتووە، ئاکامی ئەو پەیوەندییە کۆنکرێتییەیە کە لە نێوان ئەقڵ و زانستدا دروست بوو، واتە کاتێك زانست لەسەر بنەماکانی ئەقڵی مۆدێرن بونیادنراو پاشان داوای ئەوە لە زانستکرا، ئاکامی گەڕان و پشکنینەکانی بخاتە بەردەست تەکنۆلۆژیا و پیشەسازی. سستەمی سەرمایەداری بۆماوەی سێ سەدە، دەسکەوتەکانی زانستی لە پێناو خزمەتکردن بە پرۆسەی پیشەسازی و بەرهەم هێنانی شتومەك بەکارهێنا، تەنها ئامانجیش خێراترکردنی پرۆسەی بەرهەم هێنان بوو. ئەوەی لەم ماوەیەدا بوو بە قوربانی چینی کرێکاران بوو..

لەم سەروبەندەدا بەڵێن و پەیمانەکانی مۆدێرنە ڕاست دەرنەچوون، مرۆۋ لە بری ئەوەی ئازاد بێت و ببێتە سەروەری سروشت، بوو بە کۆیلەی سەردارێکی نوێ، ئەو سەردارە نوێیەش (سەرمایە) بوو. کەپیتاڵیست وەکی خاوەنی کتێبی کەپیتاڵ دەڵێت: (مرۆۋ نییە، بەڵکو سەرمایەیەکی دیاریکراوە). ئەو قەیرانانەی ڕووبەڕووی سەرمایەداری بوونەوە، نەیانتوانی ئەو سستەمە لەناوبەرن، هەرچی جارێکیش ئاماژەی داکشان و بەرەو هەڵدێر چونی سستەمی سەرمایەداری بەدیار کەوتبێت، هەرزو کاڵبۆتەوە و جارێکی تر ئەو سستەمە بەگوڕوتینێکی تازەوە هاتۆتەوە مەیدان. هەرچەندە قەیرانەکان سەخت بوو بن و هەڵاوسان ڕوویدابێت و ڕێژەی بێکاری لەبەرزبوونەوەدا بووبێت، بەڵام دەست بە چاکسازی کراوەو پرۆژەی بوژاندنەوەی ئابووری خراوەتە گەڕ، بەمجۆرەش ڕێژەی بێکاری دابەزیوەو کەڵەکەبوونی سەرمایە زیادی کردووە و قازانجی زۆر بە دەست هاتووە. ئەم حاڵەتەکە تایبەتمەندی ئابووری سەرمایەدارییە، "لینین" پێیوابوو هەر ئەمەیە سەرمایەداری بەرەو لەناوچوون دەبات. بەهۆی ئەم حاڵەتی (نوچدان و هەستانەوە، پشێوی و جێگیریەوە)، ئابووری تەکنۆلۆژی و قازانج بوونە دوو دەسەڵاتی زەبەلاح بەسەر کۆمەڵگاوە. لەم فەزایەدا مرۆۋ خۆشی بووە کاڵایەك و وەك باقی کاڵاکانی تر، یاساکانی بەرهەم هێنان و دابەشکردن و بەرخۆری بەسەردا جێبەجێ دەبوو. بەهۆی پلە بەندی دەسەڵاتیشەوە بووە کائینێکی کۆنترۆڵکراو، کە ئەرکی جێبەجێکردنی بڕیارەکان بوو.

ئەم دۆخە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیرییە تازەیە، مرۆڤی دوچاری دادڕانێکی گەورە کرد. مرۆۋ ناچار بوو شوێن بە دەستهێنانی ئەو چێژ و لەزەتانە بکەوێت کە تەکنۆلۆژیا لە هەموو جێگەیەکدا دەیخستە ڕوو. لە سستەمی سەرمایەداریدا هەموو شتێك وەها نیشاندەدرێت کە چێژ و ئارەزووە، بەر لەوەی پێداویستی بێت. لێشاوێك لە چێژ و ئارەزوو هەیە، بەڵام کات بۆتە شتێکی دەگمەن، بەتایبەت گەر کاتی کار و کاتی پشودان و جێبەجێکردنی ئەرکەکانمان لێلادا. مرۆڤی نوێ - کەبەبێ خواستی خۆی- کەوتە بەردەم لێشاوێك چێژ و حەز و نەبوونی کات، ناچار بوو ئەو کاتە کەمەی بۆی دەمێنێتەوە دابەشی بکات، بۆ ئەوەی بتوانێت دەستی بەو حەز و ئارەزوانە ڕابگات. هوشیاری مرۆڤی نوێ بە کات، دەرەنجامی نغرۆ بوونیەتی لەناو لێشاوێك حەز و ئارەزوودا، بێئەوەی کاتی پێویستی هەبێت تا بتوانێت لەو شتانە بەهرەمەند بێت و لێیان تێر بێت. بەو پێیەی ئابووری تەکنۆلۆژی بەردەوام لە هەوڵی خوڵقاندن و دروستکردنی جۆری تازەی

شمەك و ئامرازی چێژ بینیندایە، مرۆڤی نوێ ناچارە عەودالّی كاری زیاتر و زۆرتر بێت، تا بتوانێت بەو شتانە ڕابگات و بەدەستیان بهێنێت. تێئاوارەبوونی مرۆڤ و لە دەستدانی مرۆڤ بوونی خۆی و گۆڕانی و بوونی بە كالاّ، وای لە "جۆرج لوكاچ" كرد بلّێت: (مرۆڤ بۆتە كائینێكی بەشت بوو). ئەوكاتەشی مرۆڤ بەشت بوو، لە بوونەوەرێكی كۆمەلاّیەتیەوە بوو بە كائینێكی تەنها و گۆشەگیر و پەیوەندیە كۆمەلاّیەتیەكان ئیفلیج بوون.

لەپای نەبونی مەرجی ئینسانی لە پەیوەندییەكانی دنیای مۆدێرندا، بیریارانی پۆست مۆدێرنە گەڕان لە مرۆڤ و گێڕانەوەی ڕەهەندە لە دەست چووەكانی ئینسانیان بەكارێكی پێویست زانی. ئەمەش پێویستی بەوە بوو پرۆسەیەكی وا لە دەرەوەی بەها باوەكان –واتە لە دەرەوەی بەهای بەرهەم هێنان و بەرخۆریدا– دەست پێبكەن، ئەویش لە پێناو بەگژاچونەوەی دەسەلاّت و كۆی ئەو بەهایانەی مرۆڤبونی مرۆڤیان پایەمالّكرد.

ئەگەری گێڕانەوەی ئەو مرۆڤە ونبوەش، پەیوەستە بە دژایەتیكردنی ئابووری قازانج *Economie de profit* و دامەزراندنی ئابووری زیان *Economie de perte*، لەگەلّ گۆڕینی بەكاربردنی شمەك *Consommation* بە بەكاربردنی ووزە *Consumation*. ئەمە خواستی "جۆرج باتای"یە بۆ مومارەسەكردنی (ئەزمونی نێو خواهی). بۆ گەیشتن بەم ئەزمونەش، دەبێت بە زیان دژایەتی قازانج و بەبەكاربردن دژایەتی بەرخۆری بكەین. واتە هەرچی وزەی غەریزی لە جەستەو ڕۆحی مرۆڤدا هەیە، لە ڕێی مومارەسەی ئیرۆتیكی و مەستی و شیعر و مۆزیك و هونەرەوە، بە تاڵبكرێتەوە. ئەزمونی نێو خواهی لە باریدایە ناوەرۆكی مرۆڤمان بۆ ئاشكرا بكات كە پرۆسەی بەشتبوون خەفەی كردبوو، هەر ئەم ئەزموونەش دەتوانێت ئەو هێز و توانا شاراوانەمان لە ناخی مرۆڤدا نیشان بدات كە ئابووری قازانج و بەرخۆری پەكی خستبوون. لەبەرئەوە مرۆڤ بۆ بەدەست هێنانەوەی شوناسی خۆی، پێویستە سەفەر بەناخی خۆیدا بكات و هێز و وزە شاراوەكانی ناوەوەی بخاتە ڕوو، هەر ئەم پرۆسەیەش دەتوانێت بوونمان ئاشكرا بكات. لەبەرئەوەی بوون لە شوێن و جێگەیەكی دیكەدا نییە، بەڵكو ئەوەیە ئێمە لە ڕێی ئەزمونكردنەوە پەی پێدەبەین. لێرەدا دەبێت بڵێین ئەمە ئەزمونێكی سۆفیگەرانە نییە و لە هیچ خاڵێكدا ناچێتەوە سەری، بەڵكو تەواو پێچەوانەی یەكترین. بۆ نمونە ئەزمونی سۆفیگەری لەسەر بەفێرۆ نەدانی وزە و نەوروژاندنی غەریزە لە ناخی مرۆڤدا كاردەكات، لە كاتێكدا ئەزمونی ئیرۆتیكی داوای بەتاڵكردنەوەی تەواوی وزە و تواناكان دەكات و دەیەوێت لە ڕێی شیعر و مۆزیك و هونەرەوە، بەكاریان بەرێت. بە كورتیەكەی ئەزمونی نێوخواهی هەوڵێكە بۆ پەیڕەوكردنی ڕێنومایییەكانی *Dionysos*، چونكە هەر *Dionysos* دەتوانێت ئەو وزەو توانستانە ڕزگار بكات كە ئابووری قازانج سەركوتی كردوون. هاوكات بلاّوكردنەوەی ڕێنومایییەكانی *Dionysos* لە باریدایە بەگژ ئەقلاّنیەت و زانستدا بچێتەوە، ئەو ئەقلاّنییەت و زانستەی مرۆڤیان كردە (ماهیەتێكی میتافیزیكی) كە هەموو پەیوەندیەكی بە بوونەوە پچڕاوە.

**سێیەم:**

**ڕەگوڕیشەی مۆدێرنە:**

دابەشــكردنـــی مرۆڤ بــۆ ماهیەت یــاخود

جەوهەرێکی ڕۆحانی لەلایەك و جەستەیەکی بێزراو لەلایەکی ترەوە، بەرهەمی ئەو پڕۆژە ئەقڵانی و زانستیەیە کە سەردەمی مۆدێرنەی لەسەر دروست بوو.. فەلسەفەی خودگەرایی ئەم کەلێنە قوڵەی کردە ئینسان، ئەو کاتەی وشیاری مۆدێرن بە گوێرەی پێداویستییەکانی ئەو سستمە لە دایکبوو کە دەربارەی حەقیقەت و کرۆکی حەقیقەت قسە دەکات.

ئیتر مرۆڤ بوو بە جەوهەرێکی میتافیزیکی – واتە بوو بە کۆژیتۆ–و چووە چوارچێوەیەکی داخراوەوە کە هیچ پەیوەندیەك بەجیهانی دەرەوەو بە ئەوانی ترەوە نایبەستێتەوە. ڕەنگە ئەم هوشیارییە ماهیەتگەرایە بێت هەستی چونەوە ناوخۆ و گۆشەگیری لای مرۆڤ دروست کردبێت، ئەمەش ئەو گرفتەیە مرۆڤی مۆدێرن بە دەستیەوە دەناڵێنێت. ئەمە بۆ خۆی کێشەیەکی میتافیزیکیە و دابڕانێکی قوڵ لە نێوان (من/ ئەویتر، خود/ جیهان، دەرون/ جەستە، جیهانی پیرۆز/ جیهانی سروشت)دا، دروستدەکات. کاتێك زانستیش دێت ئەم کێشەیە قوڵتر دەکاتەوە، چونکە پێیوایە جیاکردنەوەی خود لە بابەت پێداویستیەکی میتۆدیە بۆ گەیشتن بە حەقیقەت.

لە بواری زانستە سروشتیەکاندا، بابەتیبوون بوو بە پێوەری بەرهەم هێنانی حەقیقەت و ئەمەش خواستی زانایانی ئەو بوارە بوو. بۆ ئەوەی ئەم بابەتیبوونەش دەستەبەر بێت، دەبوو خودی لێکۆڵیار لە بابەتی لێکۆڵینەوەکەی جیاببێتەوە، واتە بەیەکجار سروشت لە خود جیابکرێتەوە.. ئەقڵانیەت و زانست لە پێناو بەرهەم هێنانی بوونەوەرێکدا دەست تێکەڵ دەکەن کە لە جیهان دابڕابێت، لەم پرۆسەیەشدا مرۆڤ دەبێتە قوربانی.

چاوخشانەوە بەو بەڵگەنەویستە مەزنانەی ئەم زانستگەراییەی لەسەر دامەزراو ئەقڵی مۆدێرنی لەسەر دروست بوو، ئاشکرای دەکات ئەم زانستە چ ڕێگایەکی گرتۆتە بەر. هەروەها دەریدەخات تا چەندە دەرەنجامەکانی تەکنۆلۆژیا لەگەڵ ئەو سەرەتایانەدا دەگونجێت کە ئەقڵی زانستی نوێی لەسەر دروست بوو. لێك شیتاڵکردنی ئەقڵی نوێی خۆرئاوا و خستنەڕووی مەبەست و ئامانجە گشتیەکانی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە، کارێکە "هۆرکهایمەر و تیودۆر ئەدرنۆ" خۆیانی بۆ تەرخاندەکەن و لە کتێبە هاوبەشەکەیاندا (دیالەکتیکی ئەقڵ)، دەکەونە تاوتوێکردنی.

"هۆرکهایمەر و ئەدرنۆ" لەو کتێبەیاندا دەستەواژەیەك لە "فرانسیس بیکۆن"ی باوکی زانستی نوێ دەخوازن کە پوختەی پرۆژە تازەکەی بەیاندەکات: (باڵادەستی و سەرکەوتنی مرۆڤ بەندە بە مەعریفەوە و ئەمەش شتێکی حاشا هەڵنەگرە)، نرخی ئەم مەعریفەیەش نە لەو حەقیقەتەدایە کە پێیدەگات و نە لەو بەڵگە نەویستانەشدایە لەسەری دروست دەبێت، (بەڵکو لە پراکسیس و کارکردندایە، لە دۆزینەوەی ئەو وردەکاریانەدایە لەوەوبەر شاراوەبوون و دۆزینەوەیان بواری ئەوە دەڕەخسێنێت، ئاڕاستەی بوون بکرێت). کەواتە ئامانجی مەعریفەی نوێ تیۆری نییە، بەڵکو عەمەلییە، واتە کۆنترۆڵکردنی بوون و ملکەچ پێکردنیەتی: (مەعریفە و دەسەلات هاوواتان).

پاککردنەوەی جیهان لە سیحر و ئەفسانە، ئەمە پڕۆژەی سەردەمی ڕۆشنگەرییە. لێرەوە زانستی نوێ دژایەتیەکی توندی کۆی ئەو شتانە دەکات کە ناچنە ژێر باری دیاریکردن و دەستنیشان کردنەوە: (هەموو ئەو شتانەی

دابەشناكرێن بەسەر ژمارەیەكی دیاریكراوداو دواجاریش ناچنەوە سەر ژمارەیەك، ئەم شتە بۆ ئەقڵ جگە لە وەهم و خورافەیەك شتێكی تر نییە).

پەیبردن بە وردەكارییە شاراوەكان و دورخستنەوەی نهێنی و وەلاوەنانی ئەفسانە، لە بەرامبەریشدا پەنابردن بۆ چەندایەتیكردن و پێوانەكردن، ئەمە ئەو ئاقارەیە ئەقڵی زانستی مۆدێرن لەناو مێژووی فیكری مرۆڤایەتیدا سەرەتاكانی داڕشت. بەڵام لێكدانەوەكانی "هۆركهایمەر"و"ئەدۆرنۆ" دورتردەڕۆن و باس لەوە دەكەن ئەقڵی زانسی ئەگەرچی ئەفسانەی نەهێشت، بەڵام سەرەنجام گەیشتە ئەوەی جارێكی دی ئەفسانە بەرهەم بێنێتەوە. (تەنانەت ئەو ئەفسانانەی قوربانی دەستی ڕۆشنگەری بوون، خۆیان لە خۆیاندا بەرهەمی ڕۆشنگەرین).

ئەگەر یەزدان دروستكەری جیهان بێت، ئەوە مرۆڤەكە شوێنی دەگرێتەوە تا بەرپرسیاری مەزن بەرامبەر بە جیهان لە ئەستۆ بگرێت، ئەمەش بەهۆی لێهاتوی ئەقڵی خۆیەوە! ڕۆڵی مرۆڤ لەم دنیایەدا بە ڕۆڵی یەزدان دەچێت، مادامەكی مرۆڤ دەیەوێت دنیا كۆنترۆڵ بكات و خۆی ئاڕاستەی بكات. بەمجۆرە "هۆركهایمەر" و "ئەدۆرنۆ" دەگەنە ئەوەی بڵێن: (لە ئێستادا ئەفسانە لە ئەقڵدایە)، ئەو ئەو ئەقڵەی لە بەرامبەر شتەكاندا بۆتە دیكتاتۆرێك. زاناكان ئیعتراف بە هیچ شتێك ناكەن گەر شایەنی پێوانە كاری نەبێت و نەچێتە ژێر باری مەعریفەی وردەوە، بەجۆرێك وا بێت بە ئاسانی ئاڕاستە بكرێت و بخرێتە خزمەتی مرۆڤەوە. تەكنۆلۆژیاش ئەو ناوەندەیە بەم ئەركە هەڵدەستێت، ئەركی گۆڕینی شت بۆ كاڵایەك كە شیاوی ئەوە بێت لە بازاڕدا كڕین و فرۆشی پێوە بكرێت.

لێك شیتاڵكردنی ئەقڵی زانستی ئەوەمان بۆ ئاشكرا دەكات كە ئەو دەرەنجامە ترسناكانەی زانست پێیان گەیشت، هەر لە سەرەتاوە لەو بنەمایانەدا بووە كە ئەم زانستەی لەسەر دروست بووە. مەعریفەی زانستی وەك مەعریفەیەكی تیوری نەمایەوە و ئامانجیشی تەفسیركردنی بونی سروشتی یان ئینسانی نەبوو، بەڵكو مەبەستی كۆنترۆڵكردن و دەستبەسەراگرتنی شتەكان بوو. لە كاتێكدا ئامانجی بیركردنەوەی میتۆلۆژی بریتیبوو لە ئاشكراكردنی هارمۆنی و پێكەوە گونجانی شتەكان و تەقەللایەكە بە مەبەستی دۆزینەوەی خاڵی هاوبەش لە نێوان چارەنوسی مرۆڤ و چارەنوسی گەردوندا.

وەكی پەرچەكردارێك بەرامبەر مۆدێرنە، "مارتن هایدگەر"ی فەیلەسوفی ئەڵەمانی دەستیكرد بە لێكشیتاڵكردنێكی گشتی میتافیزێكی خۆرئاوا، بەمكارەش پڕۆژەكەی "فردریك نیچە"ی تەواو كرد. لەبەرئەوەی مێژووی میتافیزیكای خۆرئاوا بریتیە لە مێژووی ئەقڵی خۆرئاوا، بۆیە "هایدگەر" ڕاستەوخۆ دەچێتەوە سەر ڕەگوڕیشە دێرینەكانی، تا ئەو بنەمایانە ببینێتەوە كە ئەم ئەقڵەی لەسەر دامەزراوە. كەشفكردنی ئەم بنەمایانە تەنها ڕێگایەكە بۆ ئەوەی بتوانین پایەكانی میتافیزیكا لەق بكەین. لێرەوە "هایدگەر" پێیوایە ئەقڵی خۆرئاوا لەسەردەمی "ئەرستۆ"وە بگرە لەگەڵ "ئەفلاتۆن" و "سوكرات"دا، لەسەر فۆرمی لۆژیكی — وێنەیی دامەزراوە. هەروەها لەو قۆناغەدا جیاكردنەوەی بابەتی مەعریفە لەو خودەی توانای ناسینی هەیە، ئەنتۆلۆژیای دیاریدەكرد.

لە كاتێكدا لەسەردەمی پێش "سوكرات"دا لەسەر بنەمایەكی جیاواز دامەزرابوو، لە كایەیەكی

جیاوازیشدا دەهات و دەچوو. حەکیمەکانی سەرەتا هەوڵیان دەدا سروشت تەفسیر بکەن، بەڵام بەو جۆرە لە سروشت نەگەیشتبوون کە ئێمە لە مڕۆدا تێیگەیشتوین.

*Physis* یان سروشت لای حەکیمەکانی یۆنان مانای (گشتی) دەگەیاند، ئەم (گشتە)ش یەزدان و مرۆڤ و بوونەوەرە زیندوو بێگیانەکانی دەگرتەوە.. ئاسمان و زەوی و هەرچی شتێك لە نێوانیاندایە، تەنانەت فیکر و ڕۆح و مۆراڵیش، ئەوان بە تەواوی ئەم شتانەیان دەوت: *physis*. کاتێك لەو قۆناغە دوورەدا دەکەوینە سۆراخکردنی ڕەگوڕیشە میتافیزیکیەکانی ئەقڵ، دەبینین دەلالەت لە شتێکی تر دەکات کە ناچێتەوە سەر ئەوەی ئێمە ئەمڕۆ بە تێرمی (ئەقڵ) پێناسەی دەکەین. لە زمانی یۆنانیدا چەمکی ئەقڵ بەرامبەر بە چەمکی *Logos* دێت و ڕەگوڕیشە زمانەوانیەکەی دەچێتەوە سەر فیعلی *Legein*. لە سەردەمی "ئەفلاتۆن" و "ئەرستۆ"دا، فیعلی *Legein* مانای ئەوەی دەگەیاند (قسە دەکات یان دەدوێت). هەر لەوڕەگەشەوە چاوگی ئاخاوتن و گوتار هەڵێنجراوە.

کەواتە لۆگۆس واتە ئاخاوتن یان گوتار کە بەشێوەیەکی دروست بیرکردنەوەی مرۆڤ ئاڕاستە دەکات، لە پێناو پەیبردن بە ڕاستیدا. "ئەرستۆ" لای خۆیەوە هەوڵێکی زۆریدا بۆ ئەوەی یاسا گەلێکی گشتی وەها فۆرمەلە بکات کە ئاخاوتن یاخود گوتار بکاتە (ئامێرێك کە زەینیەتی مرۆڤ لە هەڵە بپارێزێت).

*Organon* ئەرستۆیی بەمانای گۆڕینی گوتار دێت بۆ لۆژیك، واتە گۆڕینی *Logos* بۆ *Logique*. لە کاتێکدا فیعلی *Legein* لای حەکیمەکانی پێش "سوکرات" مانای کۆکردنەوەو لە خۆگرتنی دەگەیاند و هەر لەو ڕەگەشەوە چاوگی کۆکردنەوە هەڵێنجراوە.

*Logos* لای ئەوان بە مانای (کۆکردنەوە) دەهات، نەك گوتار یاخود لۆژیك. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارێکی سەرەکی کە *Physis* مانای گشت و گشتگیری *Totalite* دەگەیاند و تەواوی بوونەوەرەکانی دەگرتەوە، بەچاوپۆشی لەوەی سروشتی چییە و چ جۆرێکە. ئەقڵی خۆرئاوا وەختێك دروست بوو کە لەسەر لۆژیك دامەزرا، بەڵام ئەی لە چ ساتەوەختێکدا لۆژیك دروستبوو؟ لەو ماوەیەدا کە فەلسەفەی یۆنانی بەرەو کۆتایی دەچوو، دەبوو بە مەسەلەیەکی سیکولائی، واتە مەسەلەی دیسپلین و ڕێکخستن. لۆژیك ئەو کاتە لای یۆنانییەکان پەیدا بوو کە کەلێن کەوتە نێوان فیکرو بوونەوە، ئەم کەلێنەش "ئەفلاتۆن" دروستیکردوو "ئەرستۆ"ش بەئەنجامی گەیاند. لێرە بەدواوە لۆژیك چەسپاو فیکری پێوانەکار دامەزرا.. ئەقڵی خۆرئاوایی هەڵهات. هەر لە سەرەتای ئەم دامەزراندنە تیۆریەی فیکرەوە، ڕێگە نەدرا حەقیقەت لە هیچ شوێنێکی تر جگە لە لۆژیك نیشتەجێ بێت. حەقیقەت لەوجودەوە گۆڕا بە ئاخاوتن. واتە لە فیزیسەوە بۆ لۆژیك، ئیدی دۆزی لۆژیکی بوو بە شوێن دالدەی حەقیقەت. بواری حەقیقەتیش فیکرە: فیکریش تاکە سەرچاوەی حەقیقەتە. لێرەوە فەلسەفە میسالیەکان سەریان دەرهێنا، بەجۆرێك حەقیقەت لە چەند سستمێکی مەحکەمدا دیلکرا، کە بۆی نەبوو لە دەرەوەی مەساری ئەو زیندانەوە هاتوچۆ بکات.

لەوەش زیاتر مرۆڤ بوو بەماهیەتێکی فیکری و خودێکی میتافیزیکی، کە گەوهەرێکی بیرکەرەوەیە: واتە کوژیتۆ (من بیر دەکەمەوە).

"دیکارت"ی ڕابەری ئاقاری ئەقلانییەت لە فەلسەفەی مۆدێرندا، ئەوە کۆژیتۆ دێنێتە ئاراو وەکی ئەو زەمینە کۆنکرێتیە نیشانی دەدات کە یەقینی لەسەر دادەمەزرێت. یەقینی یەکەم ئەوەیە: من — بیردەکەمە *Le moi- Pensant* لەسەر ئەمەش تەواوی یەقینەکانی دیکە دادەمەزرێت. مرۆڤ دابەشبوو بەسەر دەرون و جەستەدا، دەرون لەناو سستمدا زیندانی کراو جەستەش کرایە دەرەوەی یەقین واتە دەرەوەی سستم.

فەلسەفەی خودگەرایی دوای"دیکارت" لە هەوڵی ئەوەدا بوو زەبری سستم کەمکاتەوە و ئەو کەلێنە گەورەیەی نێوان خود و بابەت، دەرون و جەستە، فیکر و بوون، پڕبکاتەوە.. بەڵام بێسوود بوو! لەبەر ئەوە "هایدگەر" پێیوایە تاکە ڕێگایەك بۆ دەرچوون لەو حاڵەتە، لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی ئەو سستمە ئایدیالیستیانەیە کە مرۆڤ لە ناویاندا دیلکراوە.

## چوارەم:

## دەربارەی ئاسۆی تێپەڕاندنی مۆدێرنە

قوتارکردنی مرۆڤ لەو سستمەی کردویەتی بە ماهیەتێکی میتافیزیکی، دەشێت لە دەرەوەی زمانی لۆژیك و زمانی ئەقڵدا دەستەبەر بێت. ئەویش بە گەڕانەوە بۆ هونەر و زمانی شیعر، ڕەنگە لێرەدا ڕەهەندی وجودیانەی مرۆڤ بەدەرکەوێت. حەکیمەکانی پێش "سوکرات" بە زمانی (لۆژیکی وێنەی) تەعبیریان لە مرۆڤ و بوون نەدەکرد، بەڵکو بە چامەی شیعری و بە زمانی ڕەمز ئەو کارەیان دەکرد. بەڵام کاتێك "ئەرستۆ" هات شیعری خستە نزمترین ئاستی پۆلبەندی ئاخاوتن، لەبەرئەوەی شیعر لە کایەی حەقیقەتدا نابزوێت، بەڵکو لە کایەی میتافۆردا دەخولێتەوە.

فەلسەفە پاش "ئەرستۆ" سوارملی زمانی لۆژیك بوو، مرۆڤیشی گۆڕی بۆ دۆزێکی لۆژیکی کە لە بابەت و گوزارە پێکدێت. لەبەرئەوە ئازادی مرۆڤ مەیسەر نابێت، ئەگەر بێتو ئەو ڕێگایە نەگۆڕین کە گەیاندییە کۆیلایەتی، واتە ئاخاوتنی لۆژیکی بە ئاخاوتنی هونەری بگۆڕین: لێرەشەوە *Dionysos* (خواوەندی هونەرەجوانەکان) خۆیمان نیشان دەدات.

لەم سەرو بەندەدا وەکی "هاپرماس" پێیوایە، "دێریدا" دێت بۆ ئەوەی بەردەوامی بە پرۆژەکەی "مارتن هایدگەر" بدات و کاری "میشێل فۆکۆ"ش جگە لە فراوانترکردنی پرۆژەکەی "جۆرج باتای"، شتێکی تر نییە. بەڵام "فۆکۆ" لە هەوڵی ئەوەشدا بوو تیۆریایەك دەربارەی دەسەڵات *Le Pouvorir* بێنێتە ئاراو باس لە جومگەکانی دەسەڵات بکات لە پەیوەندیدا بە دێوانەییەوە *La Folie*. لەبەرئەوەی دیوانەیی گوتارێکی دژە ئەقڵە و نەیاری سەرسەختی ئەو سستمەشە ئەقڵی لەسەر دروست دەبێت.

"میشیل فۆکۆ" ویستی ماف ئاخاوتن و گوزارشت لە خۆکردن بداتەوە بە شێتێتی، دژ بەو گوتارە ئەقلانییەی شێتێتی لە چوارچێوەی نەخۆشی *Pathologique* پۆلێن دەکات. ئیعتیبار گێڕانەوە بۆ شێتێتی لە پەیوەندیدا بە بەرهەم هێنانەوە، ئەوە دەردەخات سستمی سەرمایەداری تا چ ڕادەیەك کاری کردووە بۆ دروستکردنی بەهاگەلێك کە بەشێوەی ناباو نائاسایی سەیری دۆخی دێوانەیی دەکەن.

لەدوای ئەوەی سیفەتی پیرۆزی لە شێتێتی داماڵرا (چیتر *Dionysos*ی دیوانە خواوەند نییە)، سستمی سەرمایەداری دێوانەی ڕەوانەی زیندان و

نەخۆشخانەکان کرد تا ببێتە بابەتێك بۆ زانستی پزیشکی ئەقڵی *La psychiatrie*. شێت دوای ئەوەی بوو بە بابەتێك بۆ زانستی نوێ، پۆلیس (پاش دەسگیرکردنی)، وەکی نەخۆشێك دەیدایە دەست پزیشك. کەواتە زانستی نوێ بابەتی شێتی بە پێی هەلومەرجێکی ئەپستمۆلۆژی دیاریکراو کەشف نەکرد، بەڵکو دەسەڵات وەك کێشەیەك/ دۆسیێیەك/ ئافەرۆزە کراوێك، خستیە بەردەستی..

"فۆکۆ" ئاشکرای کرد دەسەڵات هەر کەسێك سزا دەدات و پەراوێزی دەخات، گەر بزانێت ملکەچی نابێت و وەك ئەوێکی دی و ناباوێك سەیر دەکات. واتە هەر کەسێك لە لۆژیکی (ئەقڵی کۆمەڵایەتی) لابدات کە لە سەر بەهای بەرهەم هێنان دروست بووە، دەخرێتە بازنەی پەراوێزکراوەکان.

"ژاك دێریدا" لای خۆیەوە ڕێبازی ڕەخنەگرتن لە میتافیزیکای گرتە بەر (واتە لەبەریەکهەڵوەشانی ئەقڵی خۆرئاوا)، ئەو ڕێگایەی "مارتن هایدگەر" ڕچەشکێنی بوو. ئەو ئەرکەی "دێریدا" پێیهەڵدەستێت بریتیە لە تێکوپێکدانی ئەو سستەمە میتافیزیکیەی ئەقڵی پەتی بونیادی ناوە، هەروەها نەهێشتنی کۆسپ و جیاوازی لە نێوان گوتارە جیاجیاکاندا. بۆنمونە لە ڕووی چۆنایەتیەوە جیاوازی لە نێوان گوتاری فەلسەفی و گوتاری ئەدەبیدا نییە، بەڵکو لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئێمە لەبەردەم تێکستێکی گشتیداین *Texte general*. تێکست یاسایەکی هەیە کە پابەند پێیەوە، ئەویش یاسای نوسینە، بەچاوپۆشی کردن لە نوسەرەکەی. لەبەرئەوە گرنگترین شتێك کە دەبێت ئاگامان لێی بێت بگۆ (واتە خود) نییە، بەڵکو وتراو (نوسراو/ درکێندراو)ە، بۆ هەڵێنجانی یاسا گشتیەکان. ڕێساکانی نوسین *La grammatologie* ئەو یاسایانەن پێویستە زمان بخوڵقێنن *La grammaire*، ئەمەش لە پێناو نەهێشتنی دەسەڵاتی خود و لێك شیتاڵکردنی سستمدا.

خولیای تێکشکاندنی خود (ئیتر خودی ئاقڵ بێت یان قسەکەر)، "فۆکۆ" و "دێریدا" ناچار دەکات بەشەرمێکەوە بونیادگەری هەڵبژێرن و کاری پێبکەن. خود ئیتر خودێکی ئاقڵ بێت و مومارەسەی چاودێری کردنی شێتی بکات، یاخود قسەکەر بێت و دەسەلات بەسەر بەرهەمدا پراکتیزە بکات، لە هەردوو حاڵەتەکەدا خودێکی کارایە کە مانا ئالودەکات و دەشارێتەوە. لێرەوە جاڕدانی (مەرگی مرۆڤ) کارێکی پێویست بوو بۆ دەربازبوون لە فەلسەفەی خودگەرایی و ئازادکردنی مانا: لێرەدا هیچ بکەر و خودێك نییە سستم و حەقیقەت بەرهەم بهێنێ.

ئەو ڕێگا میتافیزیکیەی "دێریدا" بە دوای شوێن پێی "هایدگەر" دا تەییکرد و ئەو ڕێگای دێوانەیی "فۆکۆ" بەدوای "جۆرج باتای"دا پێیداڕۆیشت، هەردووکیان لە "فردیك نیچە" وە سەرچاوە دەگرن: هەموو ڕێگا ئەلتەرناتیڤەکان دەچنەوەسەر "نیچە"! لەبەرئەوەی ئێمە گەر ڕێگای دێوانەیمان گرتەبەر و بەهۆی ئەزمونی ناو خواهییەوە لە هەوڵی کەشفکردنی ڕەهەندە ئۆنتۆلۆژییەکانی ئینساندا بووین، ئەوا دەگەین بە: (زەرادەشت و دێوانەی مەیدانی گشتی و مۆزیك و شعر و هونەر). بە مانایەکی تر ئێمە گەر بەدوای تیۆریای دەسەڵات بکەوین لای "فۆکۆ"، ئەوا دەگەینە ئیرادەی هێز لای "نیچە"، دوای ئەوەی بە چەمکی *La Souvereinete* لای "باتای" گوزەر دەکەین. بەڵام ئەگەر ڕێگای میتافیزیکیمان گرتە بەرو بە تێکشکاندنی جیاوازی چۆنایەتی نێوان

ڕەگەزە ئەدەبیەکان دەستمان پێکرد لای "ژاك دێریدا" و بە جەنگی "مارتن هایدگەر" لە دژی گەورە فەیلەسوفان (ئەوانەی خاوەن سستمی فەلسەفین) گوزەرمانکرد، ئەوا دەگەینە شەڕ و ڕەخنەکانی "نیچە" لە هەریەك لە "سوکرات" و "ئەفلاتۆن" و "ئەرستۆ" و شوێنکەوتنوانیان.. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت گوتاری پۆست مۆدێرنە تەنها یەك ڕێگا دەگرێتە بەر، سەرەڕای جیاوازی بیر و بۆچونەکان، ئەو ڕێگایەش ڕێگای ئۆنتۆ – میتافیزیکییە و سەرچاوەی سەرەکیشی "فردریك نیچە"یە.

## پێنجەم:

## دەربارەی ئاسۆی تێپەڕاندنی تێپەڕاندن

فەیلەسوفی ئەڵمانی "یۆرگن هابرماس" جیاواز لە فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرنە بیر لە چارەسەرکردنی قەیرانی مۆدێرنە دەکاتەوە. لەم پێناوەشدا ئەو خولیای هێنانە ئارای ڕێگا چارەیەکی ترە وەك ئەلتەرناتیڤێکی قەیرانی مۆدێرنە و چارەسەرێکی گونجاو بۆ دەربازبوون لە فەلسەفەی خودگەرایی. ئەم ڕێگا چارەیەی "هابرماس" دەیخاتە ڕوو، دەرەنجامی بەبنبەست گەیشتنی ئەو ئەلتەرناتیڤانەی ترە کە ڕەگوڕیشەیەکی نیچەوییانەیان هەیە. چونکە بە بڕوای "هابرماس" ئەو دەرەنجامانەی ئەوانە پێیگەیشتن زۆر بەدترە لەو قەیرانەی مۆدێرنەی تێکەوتووە. ئەو پەرچە کردارە توندە دژ بە ئەقلانییەت و زانستی مۆدێرن، وایکرد خاوەنەکانیان بچنە بەرەی نائەقلانیەت و سەنگەری دژایەتیکردنی مۆدێرنە هەڵبژێرن. هاوکات دژایەتیکردنی زۆری سستم، بووە مایەی وێرانکردنی ئەو خودەی لەناو سستمەکەدا بەندکرابوو، کارێك کەوایکرد مرۆڤ لە پرۆژەکانی فەلسەفەی پۆست مۆدێرنەدا غایب بێت. ئەوانە بێئاگابوون لەوەی تێکشکاندنی سستمەکان لەناوبردنی مرۆڤیشی لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچی: واتە ئاو و منداڵەکەیان پێکەوە دەرهێنا.

"هابرماس" پێیوایە ئەلتەرناتیفێکی گونجاو بۆ ئەقڵی مۆدێرن، نائەقلانیەت نییە، بەڵکو (ئەقڵی کۆمینیکا سیۆنخوازییە – *Laraison le communicationne*). واتە پێویستە بەدوای ئەلتەرناتیڤێکدا بگەڕێین بۆ جۆری ئەقڵ، نەك سەر لە بەر ئەقڵ وەلاوە نێین. ئەو ئەقڵە پەتیەی مرۆڤی گۆڕی بۆ گەردیلەیەکی ڕۆحی یاخود بۆ ماهیەتێکی میتافیزیکی، دەشێت بەئەقڵێکی دیکەی بەراورد بکەین کەدەتوانێت ئەم گەردیلە تەنها و گۆشەگیرانە پێکەوە ببەستێتەوە، ئەو ماهیەتانەی لەپشت بوونەوە حەشاردراون. کەواتە مەسەلەکە ئەوە نییە، چۆن چۆنی سستمەکان تێکبشکێنین؟ بەڵکو ئەوەیە چۆن خود لە زیندانی سستمەکان ڕزگار بکەین؟

شکستی گوتاری پۆست مۆدێرنە، بەڵگە نییە بۆ شکستی گوتاری فەلسەفی، بەڵکو بەڵگەیەکە بۆ شکستی فەلسەفەی خود. ئەم شکستە ڕووبەڕووی زانستە مرۆڤایەتیەکانیش بووەوە، لەبەر ئەوەی ئەویش ویستی مەعریفەیەکی (زانستی) دەربارەی خود بەرهەم بێنێت. ئارەزووی خودناسی بووە هۆی شکستی گوتاری مەعریفی، هەروەها بووە هۆی خودناسیش.

فەلسەفەکانی خودگەرایی بەوە گەیشتن، مرۆڤیان لەناو سستمێکی میتافیزیکیدا زیندانیکردو لە جیهانیان دابڕی و بوونیان لێیداماڵی.. هەرچی زانستە و مرۆڤایەتیەکانە

سەرەنجام گەیشت بەوەی مرۆڤ بکاتە کۆیلە — لە کاتێکدا ئامانج ئازادکردنی بوو-.. ئەو دەرەنجامانەی زانستە مرۆڤایەتیەکان پێیگەیشت، ئەگەری کۆنترۆڵکردن و دەستبەسەرداگرتنی مرۆڤی زیاترکرد، ئەمەش کاری دەسەلاتی ئاسانکرد بۆ ئەوەی قودرەتی دیسپلینکردنی هەبێت. ئەقڵی کۆمینیکاسیۆنی — وەك چارەسەرێکی دی بۆ قوتاربوون لە فەلسەفەی خودگەرایی-، مەبەستی ئەوە نییە مەعریفەیەکی زانستی دەربارەی خود یان بابەت بەرهەم بهێنێت، بەڵکو ئامانجی ئەوەیە زەمینەیەکی گونجاو بۆ لێك تێگەیشتنی ئینسانەکان بسازێنێت و لەو گۆشەگیری و تەنهاییە دەریانبێنێت.

ئامانجی ئەقڵی کۆمینیکاسیۆنی دروستکردنی پردی پەیوەندییە بۆ بەیەکگەیاندنی (من بەوانی تر) و سۆراخکردنە لەو ئامرازانەی گونجاوە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەو پرۆسەیە. ئەمەش بە دروستکردن و بەهێزکردنی فەزایەکی فەنتازی لای مرۆڤ دەکرێت، ئەم فەنتازیایەش کە پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانی لەسەر دادەمەزرێت و هەر ئەویشە دەتوانێت پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان لە نێوان کەسێك و کەسێکی تردا، شیاو بێت. لەبەرئەمە "هابرماس" جیا لە فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرنە، دەگەڕێتەوە سەر مەجەعیەتێکی دی لە ڕۆشنبیری خۆرئاوادا، ئەو مەجەعیەتەش سەرچاوە سەرەکیەکەی "هیگڵ"ی فەیلەسوفە، چونکە ئەوە "هیگڵ"ە لە ڕێی دیالەکتیکەوە هەوڵیداوە، پەیوەندی لە نێوان من و ئەوی تردا دابمەزرێنێت. بەهۆی میتۆدی دیالەکتیکیەوە، دەکرێت ئەو خودەی لە قولایی سستمدا خۆی حەشارداوە، وەرچەرخێتە سەر هاودژی خۆی، واتە ببێتە بابات، بەمەش دەتوانێت ئازادی خۆی بەئەنجام بگەیەنێت. بەلام "هیگڵ" کاتێك جوڵەی دیالەکتیکی ڕاگرت، سەر لە نوێ جارێکی تر سستم داخراو ئەمەش ئەو شتەیە دواتر "مارکس" ڕەخنەی لێدەگرێت وپێیوایە دیالەکتیکی هێگڵی لنگەوقوچ وەستاوە و دەبێت ڕاست بکرێتەوە. "مارکس" دەڵێت: (ئینسانەکان دەتوانن لە ڕێی کارە ببن بە بوونەوەر گەلێکی پەیوەندیخواز، بەم پێیەش مرۆڤ لە ماهیەتێکەوە دەگوڕێت بۆ پراکسیس، ئەقڵیش دەبێت بە مێژوو، بەمجۆرە تێدەگەین چۆن ماتریالیزم لە دیالەکتیکدا دالدە بۆ خۆی دەدۆزێتەوە.

لەبەرئەوەی دیالەکتیك لە باریدا بوو خود لە سستم ڕزگار بکات، ئەویش لە ڕێی گۆڕینی خود بۆ هاودژی خۆی. هاوکات ئەمە ئەوەشمان بۆ ڕوندەکاتەوە بۆچی فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرنە دەچنەوە سەر "نیچە" و ناگەڕێنەوە بۆ "هیگڵ"، سەرەڕای ئەوەی لای "هیگڵ" و لە دیالەکتیك (ئاغا و کۆیلە)دا، تیۆریای دەسەلات و سەروەریمان دەسگیر دەبێت. هەروەها لەوەش دەگەین بۆچی کاتێك ڕەخنە لە ئەقڵ دەگرن، ناگەڕێنەوە بۆ "کانت"، لە کاتێکدا "کانت" یەکەمین کەسە ڕەخنەی لە ئەقڵی پەتی گرتبێت.

"کانت" هەوڵیدا سنور بۆ ئەقڵ بکێشێت و ڕێگەنەدات ئەو سنورانە ببەزێنێت کە بۆی دیاریکراوە، ئەمەش مانای سنوردانانی لەبەردەم فەلسەفەی ڕۆشنگەریدا دەگەیاند، ئەو فەلسەفەیەی بەشێوەیەکی هەڵەشانە تاوی دایە خۆی و ئەقڵی لە سەرجەم بوارەکاندا بەکاربرد، بەبێ هیچ جیاوازی کردنێك لە نێوان ئیمان و زانستدا. فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرنە بۆ نەگەڕانەوە بۆ لای "ئیمانوێل

کانت"؟ لەبەرئەوەی "کانت" بەهۆی وتەزاگەلێکی ئەقلآنییەوە ڕەخنەی لە ئەقڵ گرت، واتە لەسەر زەمینی ئەقڵ ڕاوەستا بوو، نەك سەرزەمینی نا – ئەقڵ.

لەبەرامبەر بانگەشەی (مەرگی مرۆڤ و پایانی فەلسەفە و لێکشیتاڵکردنی ئەقڵ و لایەنگیری کردنی نائەقلآنییەت)دا، "یۆرگن هابرماس" بەشێوەیەکی هێمنانە و لەسەرخۆ دەڵێت: (لەم دەساڵەی دوایدا، ڕەخنەگرتن لە ئەقڵ بەشێوەیەکی ڕادیکالانە، بۆتە مۆد). ئەم مۆدە تەنانەت پەراوێزەکانی مۆدێرنەشی گرتۆتەوە، بەتایبەت لە بواری ئەدەبدا و دەتوانین بە زەقی کاریگەری ئەو نوسینانەی "دێریدا" ببینینەوە کە پشتیان بە بونیادگەری و زمانەوانی بەستووە.. بەمجۆرە چوینە ناو پەیوەندیەکی یەکلایەنە لەگەڵ مۆدێرنە تا پێشوازی لەو شتانە بکەین کە تازە و جوان و سەرنجڕاکێشن!

## سەرچاوە

گۆڤاری (فکر و نقد) – ژمارە (21).

# کۆمەڵناسی


## ئانتونی گیدنز

**لە فارسییەوە: کۆسار فەتاحی**


### پێشەکی دانەر

### دەربارەی ئەم کتێبە

ئەم کتێبە لەو بڕوایەوە سەرچاوەی گرتووە کە کۆمەڵناسی دەورێکی سەرەکی لە کەلتووری فیکری ئەم سەردەمەدا دەگێڕێ و بە ناوەندی زانستە کۆمەڵایەتیەکان دەژمێردرێ. پاش چەندین ساڵ وانەوتنەوە لە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵناسیدا هاتمە سەرئەو باوەڕەی کە پێویستە کتێبێك لە سەر بنەماکانی کۆمەڵناسی ئامادە بکەم کە بەشێك لە پێشکەوتنەکان و گۆڕانکارییەکانی نێو ئەم لقە بە زمانێکی سادە لە خۆ بگرێ. ئەم کتێبە تەنیا هەوڵدانێك نیە لە پێناو نووسینی کتێبێکی وانەیی دیکەدا، بەڵکوو نیشانەی هەوڵدانێکە بۆ رێکخستن و نووسینەوەی هەندێ لە روانگەو مەسەلە سەرەکییەکانی ئەم بوارە.

من ویستوومە کتێبێك بنووسم کە هاوکات لە گەڵ تازە بوونیدا، هەموو ئەو بابەتە سەرەکییانە شرۆڤە بکات کە کۆمەڵناسانی ئەمڕۆ بایەخی پێ دەدەن. ئەگەرچی بەشێکی زۆری نووسینەکانی من لە رابردوودا پەیوەندییان بە تیۆرییەکانی کۆمەڵناسییەوە هەبووە، هەرگیز پێم وانەبووە کە باسە تیۆرییەکان تەنیا سەبارەت بە خۆیان سوود بەخشن. پشت بەستن بە بەڵگە هینانەوەی تیۆری تەنیا ئەو کاتە دەتوانێت بە کەڵك بێت کە بتوانێ بابەتە ئەزموونییەکان روون بکاتەوە. لەم دەقەدا هەوڵم داوە کە ئەو بوارە راڤە بکەم کە لە باری تیۆرییەوە گەلێك پێشکەوتنی بەرچاوی لەم سەردەمەدا بە خۆیەوە بینیوە. بەڵام باشترین شێوە بۆ ئاگادار بوون لە پەیوەندییەکانی نێوان تیۆری و توێژینەوە هەوڵی چالاکانەیە بۆ تێگەیشتن لە بنیادە کۆمەڵایەتییەکان. کەوابوو من پێم لە سەر خوێندنەوەی کێشەکان و لایەنە دیارەکانی کۆمەڵناسی داگرتووە. لەم کتێبەدا هەوڵم نەداوە کە ئەوچەمکانە بێنمە بەرباس کە لە رادەبەدەر ئاڵۆزن. بەو حاڵەش ئەو ئەندێشەو دەرەنجامانەی کە لە دەسکەوتەکانی ئەم لقەوە بە دەست هاتوون لە سەرانسەری کتێبەکەدا هەڵسەنگێنراون. هیوادارم

ئەم هەڵسەنگاندنە بە هیچ جۆرێك بەمانای لایەنگری کردن لە روانگەیەکی تایبەت لێك نەدرێتەوە، بەڵکوو شیکاری‌و شرۆڤەکردنی گرنگترین روانگەکان بەشێوەیەکی مەعقوول‌و ژیرانە بووبێت.

## بابەتە سەرەکیەکان

ئەم کتێبە کۆمەڵێك بابەتی سەرەکی رێك خستووە کە هەر کام لەو بابەتانە لەگەڵ ئەو شتەی کە من هیوادارم ببێتە تایبەتمەندی ئەم بەرهەمە، لە پەیوەندی دایە. یەکێك لەم بابەتانە پەیوەندی نێوان تاك‌و کۆمەڵە. هزری کۆمەڵناسانە بەر لە هەر شتێك یارمەتیمان دەدات تا خۆمان بناسین، کە ئەمە خۆی دەتوانێت یارمەتیمان بدات تا باشتر لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان تێبگەین.

خوێندنەوەی کۆمەڵناسی دەبێ ببێتە ئەزموونێکی رزگاریدەر: کۆمەڵناسی هەستی هاودەردی‌و هێزی هزرو خەیاڵمان فراوان دەکات، بەرچاومان روون دەکاتەوە تا سەرچاوەکانی کرداری‌خۆمان ببینین، و دەبێتە هۆی تێگەیشتنێکی قووڵتر لەو بەستێنە کەلتوورییانەی کە جیاوازن لە کەلتووری خۆمان. خوێندنەوەی کۆمەڵناسی تا ئەو شوێنەی دژی روانگەی تاك ڕەهەندانە خەبات دەکات فێرمان دەکا تا لە فرە کەلتووری تێبگەین، وا دەکات بتوانین لە کرداری بنیادە کۆمەڵایەتییەکان تێبگەین‌و پەرە بە هەوڵەکانی رزگارکردنی مرۆڤ دەدات.

بابەتی دووهەم مەسەلەی جیهانە لە حاڵی گۆڕاندا. کۆمەڵناسی لە جەرگەی ئەو گۆڕانکاریانەدا سەری هەڵدا کە نەزمی کۆمەڵایەتی روو لە پیشەیی بوون، رۆژئاوای بە یەکجاری لە شێوەی ژیانی کۆمەڵگا نەریتییەکان دابڕی. ئەم دونیایەی کە بەم جۆرە پێك هاتووە، گرنگترین بابەتی شرۆڤەکردنی کۆمەڵناسییە. رەوتی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی هەروا بە خێرایی دەڕواتە پێش‌و لەوانەیە ئێمە لە بەردەمی گۆڕانکارییەکی بنچینەییدا بین وەك ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە کۆتاییەکانی سەدەکانی هەژدەو نۆزدەدا روویاندا. کۆمەڵناسی لە ئاستی نیشاندانی وێنەی گۆڕانکارییەکانی رابردوو تێگەیشتن لەرەوتی گۆڕانکارییەکانی ئەمڕۆ بەرپرسیارە.

سێهەم، بابەتی ئەم کتێبە بابەتێکی تەواو بەراوردکارانەیە. ناکرێ تەنیا لە رێگای تێگەیشتن لە بنیادە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگایەکی تایبەتەوە فێری هەڵسەنگاندنی کۆمەڵناسی بین. ئەگەرچی من زیاتر باسی کۆمەڵگای بەریتانیام کردووە بەڵام ئەم جۆرە باسانە بەردەوام لە گەڵ بابەتە جۆراوجۆرو بەرفراوانەکانی نێو کۆمەڵگاو کەلتوورەکانی‌تردا هاوسەنگ بووە. ئەم بابەتانە ئەو لێکۆڵینەوانە دەگرێتەوە کە لە وڵاتانی‌تردا کراون، بەڵام من بەگشتی ئاماژەم بەو بابەتانەش کردووە کە پەیوەندییان بە یەکیەتی سۆڤیەت‌و کۆمەڵگاکانی ئەورووپای رۆژهەڵاتەوە هەیە. بەڵام ئیترناتوانین وڵاتە پیشەسازییەکان بە شێوەیەکی سەربەخۆو جیا لە جیهانی سێهەم بخوێنینەوەو لەبەر ئەوە ئەم کتێبە زۆر زیاتر لە کتێبە کۆمەڵناسییەکانی‌تر بایەخی بە وڵاتانی جیهانی سێهەم داوە. جگە لەمە، من بە جیددی پێ لەسەر پەیوەندی نێوان کۆمەڵناسی‌و ئەنترۆپۆلۆجیا دادەگرم کە مەیلەکانیان بە شێوەیەکی بەربڵاو تێکەڵ بەیەك بوون. بە لەبەرچاو گرتنی ئەو پەیوەندییە نزیکانەی کە ئەمڕۆ هەموو وڵاتانی جیهان پێکەوە دەبەستێت‌و هەروەها هەڵوەشانەوەی راستەقینەی بەشێکی زۆری جۆرەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی نەریتی، ئیتر ناکرێ وەك

جاران کۆمەڵناسی و ئەنترۆپۆلۆجی لەیەك جیا بکرێنەوە.

چوارەم، ئەم کتێبە لە پێویستی *هەڵوێستی مێژوویی* لە هەمبەر کۆمەڵناسی ئاگادارە. ئەمە شتێکی زیاتر لە پڕکردنەوەی ئەو بەستێنە مێژووییەیە کە کارەساتەکان تێیدا روو دەدەن. ئەم جۆرە زانیارییانە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە رەنگە خوێندکاران تەنانەت زانیارییەکی وایان لە سەر مێژوو نوێ نەبێت، بێگومان شتێکی پێویستە. یەکێك لە گرنگترین گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵناسی لەم چەند ساڵەی دواییدا شرۆڤەکردنەوەی مێژوو بووە. نابێت ئەم مەسەلەیە تەنیا بە مانای بەکار هێنانی روانگەیەکی کۆمەڵناسانە بۆ مێژوو لێك بدرێتەوە، بەڵکوو دەبێ وەك میتۆدێك چاو لێ بکرێ کە لە بنەڕەتدا یارمەتیمان دەدات کە باشتر لە دەزگاکانی سەردەم تێبگەین. بەرهەمە نوێیەکان لە کۆمەڵناسی مێژوویدا بە شێوەیەکی بەربلاو کەڵکیان لێ وەرگیراوەو بەم شێوەیە چوارچێوەیەك بۆ ئەو شیکارییانە دادەنێت کە لە زۆربەی پاژەکاندا هاتووەتە کایەوە.

پێنجەم، لە تەواوی ئەم کتێبەدا سەرنجێکی تایبەت دراوەتە کێشە رەگەزییەکان. بە شێوەیەکی گشتی خوێندنەوەی رەگەز وەك بوارێکی تایبەت لە کۆمەڵناسیدا لە بەرچاو دەگیرێ —و پاژێکی ئەم کتێبە(پاژی شەشەم) تەرخان کراوە بۆ بیرکردنەوەو لێکۆلینەوە لەسەرئەم مەسەلەیە. بەڵام کێشەکانی تایبەت بە پەیوەندییە رەگەزییەکان بایەخێکی بنچینەیی وەهایان بۆ شرۆڤە کردنی کۆمەڵناسی هەیە کە ناکرێ وەك بەشێکی لاوەکی چاوی لێ بکرێن. کەوابوو بەشێکی زۆری پاژەکانیتر پەیوەندییان بە کێشەی رەگەزەوە هەیە.

شەشەم، یەکێك لە گرنگترین بابەتەکانی ئەم کتێبە بە جیهانیبوونی ژیانی کۆمەڵایەتییە. زۆر دەمێك بوو لە کۆمەڵناسیدا دەوترا کە دەتوانرێ هەریەك لە کۆمەڵگاکان بە شێوەیەکی جیاو سەربە خۆ لەوانیتر بخرێتە بەر توێژینەوە. ئەم بابەتە تەنانەت لە رابردووشدا هەڵە بوو. ئەمڕۆ دەتوانین بە زەقی ئەو خێراییە ببینین کە لە پرۆسەی بە جیهانیبووندا دەرکەوتووە. بۆ نموونە ئەم خێراییە لە پەیوەندییە بازرگانییەکانی نێوان وڵاتاندا بە روونی دیارە. بەڵام هێشتا دەرەنجامەکانی ئەم بە جیهانیبوونە پەرەگرتووە تەنانەت لە کتێبە تایبەتەکانی کۆمەڵناسیدا بە تەواوەتی هەڵنەسەنگێنراوەو بە گشتی لە ئاستی کتێبە سەرەتایەکاندا بە یەکجاری پشت گوێ خراوە. پێداگرتن لە سەر بەجیهانیبوون لەم کتێبەدا پەیوەندییەکی نزیکی بە پێکەوە بەسترانی دونیای یەکەم و دووهەم و سێهەمەوە هەیە.

## داڕشتنی ئەم کتێبە

ئەم کتێبە بە هیچ شێوەیەك بە باسێکی رووت وئەبستراکت لە بارەی چەمکە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵناسی دەست پێنەکراوە. لە بەرانبەردا، چەمکەکان لە پاژە پەیوەندیدارەکاندا روونکراونەتەوەو هەوڵم داوە لە تەواوی کتێبەکەدا ئەندیشەکان، چەمکەکانو بیرۆکەکان لە رێگای هێنانەوەی نموونەی دیارو بەرچاو روون بکەمەوە. ئەگەرچی زۆرجار ئەم نموونانە لە توێژینەوە کۆمەڵناسییەکانەوە وەرگیراون، بەگشتی بۆ روونکردنەوەی بابەتەکان کەڵکم لە هەندێ سەرچاوەی وەك راپۆرتی رۆژنامەوانیش وەرگرتووە. هەوڵم داوە تا ئەو شوێنەی بۆم دەکرێ شێوازی نووسینەکە سادەو راستەوخۆ بێتو هەر

لە هەمان کاتدا هەوڵم داوە کە کتێبێکی سەرنجراکێش و"پڕ لە شتی تازە"بێت. لە پڕۆگرامی خوێندنی زانکۆدا هیچ بابەتێ نیە کە بە قەت کۆمەڵناسی سەرنجراکێش و روشنگەرو باسهەڵگر بێت، بە مەرجێك كە بە باشی بوترێتەوە.

پاژەکانی ئەم کتێبە بە چەشنێك ریزکراون کە خوێندکار بتوانێ بەرەبەرە باشتر بە سەر بوارە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵناسیدا زاڵ بێت، لە هەمان کاتدا ئەو خاڵەم لە بەرچاو بووە کە ئەم کتێبە بە چەشنێك بێت کە بە ئاسانی لەگەڵ پێویستییەکانی قۆناغە تایبەتییەکاندا بێتەوەو بە باشی کەڵکی لێوەربگیرێت. کەوابوو دەتوانین هەندێ لە پاژەکان وەلا نێین و یان لە خوێندنەوەیدا پولینکردنێکی جیاوازی بۆ بکەین بە بێ ئەوەی کە بابەتە سەرەکییەکە زیانی پێبکەوێ. هەر پاژێك تارادەیەك بە شێوەی سەربەخۆ نووسراوەو لە هەندێ رووەوە پەیوەندی بە پاژەکانی ترەوە هەیە.

ئەو شەش پاژە بە شێوەیەکی بەربڵاو بوارە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسی دەگرنەخۆ. بەشی یەکەم کە تەنیا یەك پاژ دەگرێتەوە باس لە مەسەلە سەرەکییەکانی ئەم لقە دەکات. بەشی دووهەم تایبەتە بە کەلتووری کۆمەڵگا و تاکەکەس و پەیوەندی دوولایەنەی نێوان کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکان و ئەزموونی شەخسی بە رەچاو کردنی رەگەز وەك بابەتێکی سەرەکی شەن و کەو دەکرێ. پاژەکانی ئەم بەشە بریتین لە کەلتوور، سەرهەڵدانی کۆمەڵگای جۆراوجۆری ئینسانی، هەڵسوکەتی کۆمەڵایەتی لە ژیانی رۆژانەدا، هاودەنگی و تاوان و جینایەت. لە بەشی سێهەمدا بابەتەکانی نایەکسانی، دەسەلات و ئایدۆلۆژیا لێکدراونەتەوە. لەم بەشەدا ئەم بوارە سەرکییانەی کۆمەڵناسی باسیان لە سەرکراوە: دابەشکردنی چینەکان، نەتەوەو ئەتنیك، گرووپ و رێکخراوەکان، سیاسەت و دەوڵەت و شەڕو هێزی سەربازی. بەشی چوارەم تایبەتە بە دامودەزگا کۆمەڵایەتییەکان و شیکردنەوەی کاریگەری ئەوانە لەسەر لایەنە هەستیارەکانی کرداری ئینسانی. پاژەکانی سەر بەم بەشە تایبەتن بە هاوسەرێتی و بنەماڵە، پەروەردەو فێرکردن و ئامرازەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، کارو ژیانی ئابووری. بەشی پێنجەم ئەو پاژانەی لە خۆ گرتووە کە بەجەختێکی تایبەتییەوە باس لە مەسەلەی گۆڕانکاری دەکا و، بە جیهانیبوون، ژیانی شارنشینی لەئەوڕۆدا، حەشیمەت، لەش ساغی و پیری، شۆڕش و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان شەن وکەو دەکا. ئەم بەشە بە باسێکی گشتی دەربارەی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتییەوە کۆتایی پێ دێ.

سەرەنجام لە بەشی شەشەمدا میتۆدەکانی توێژینەوەو ئەو روانگە تیۆرییە سەرەکییانە شیدەکرێنەوە کە لە کۆمەڵناسیدا بەکار دەبرێن. ئەگەرچی ئەم بابەتە کەوتووەتە کۆتایی کتێبەکە، بەڵام دەکرێ لە هەر قۆناغێکدا بخوێنرێتەوە.

### پوختەی پاژەکان و فەرهەنگی وشەکان

هەر یەك لەم پاژانە بە جۆرێك رێکخراوە کە هەم(خوێنەر) بۆ لای خۆی رابکێشێ و هەم بە شێوەیەکی رێك و پێك لە بابەتەکە تێبیگەینێ. لە کۆتایی هەر پاژێکدا پۆختەیەکی تەواوی بابەتەکە وێڕای ئەو چەمك و زاراوە سەرەکی و گرنگانە نووسراون کە لەو پاژەدا هاتوون. هەموو ئەم چەمك و زاراوانە لە فەرهەنگی وشەکانی کۆتایی کتێبەکەدا هاتوون کە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندە بۆ فێربوون. ... .

**تویێژینەوەی زیاتر:**

**سەرچاوەکان بۆ خوێندنەوە و کتێب ناسین**

کتێبخانەکان خاوەن سەرچاوەیەکی زانیاری زۆرن کە خوێندکاران دەتوانن بە مەبەستی گەڕان، یان تێگەیشتنی زیاتری ئەو مەسەلانەی کە لێرەدا باس کراون کەڵکیان لێوەر بگرن. لە تەواوی دەقەکەدا کەڵك لەم سەرچاوانە وەرگیراوەو لە ژێدەری کۆتایی کتێبەکەدا لیستی تەواوی ئەوانە هێنراوە. جگە لەمە، هەر پاژێك بە هێنانی لیستێك لەو سەرچاوانە کۆتایی پێ دێ کە بۆ خوێندنەوە پێشنیار کراون‌و پاشکۆیەکی کورتیشم لە کتێبەکە زیاد کردووە کە سەرچاوەکان‌و چۆنیەتی بەکار هێنانیان دەخاتە روو.

**بۆ خوێندکاران:**

**چۆن کەڵک لەم کتێبە وەربگرن**

ئەم کتێبە بە هاوڕێی خۆتان بزانن، نەك دوژمن ! درێژبوونی ئەم کتێبە لە گشتگیر بوونیدایە. پێویست ناکا لەوە بترسن کە دەبێ هەموو پاژەکە بخوێننەوە، یان دەبێ بە پێی ڕێکخستنی پاژەکان کتێبەکە بخوێننەوە. هەر یەك لە پاژەکان دەکرێ کەم‌وزۆر بە سەربەخۆ چاو لێبکرێ. ئەگەر ئەم کتێبە پەیوەندی بە قۆناغێك لە قۆناغەکانی خوێندنتانەوە هەیە، ئەو پاژانەی کە پێویستان پێیانە بە شێوەیەك بیخوێنن کە مامۆستا دەیڵێتەوە.

بەشی شەشەم (مێتۆدەکان و تیۆرییەکانی کۆمەڵناسی) وەك سەرچاوەیەك بۆ شیکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە لە پاژەکانی‌تری کتێبەکەدا هاتوون بخوێننەوە. ئەگەر پێتان خۆش بێت دەتوانن ئەم بەشە، هەر وەك لە دەقەکەدا دەرکەوتووە ، دوای بەشەکانی‌تر بخوێننەوە. ئەو کەسانەی کە بەرلە کردنەوەی ئەم کتێبە هیچ شتێك لە کۆمەڵناسی نازانن، هەروەها ئەو کەسانەی کە بۆ خوێندنەوەی ئەم کتێبە باگراوەندێکیان هەیە، باشتر وایە بەر لەوەی بچنە سەر پاژی یەکەم – یان تەنانەت دوای ئەو پاژە – پاژەکانی 21 و22 بخوێننەوە. ئەم کارە، واتە ناسینی میتۆدەکان‌و تیۆرییەکان بۆ خویندنەوەی پاژەکانی تر یارمەتیتان دەدا.

## پاژی یەکەم

### سەرەتایەك بۆ کۆمەڵناسی

کۆمەڵناسی چاوهەڵدێرێکی دیارو هەرە رۆشنگەر دەربارەی ئاکاری مرۆڤ بەرووماندا دەکاتەوە. فێربوونی کۆمەڵناسی، واتە وازهێنان لە پێناسەکردنی شەخسی بۆ جیهان‌و بینینی ئەو کاریگەرییە کۆمەڵایەتیانە کە ژیانی ئێمە پێك دێنن. کۆمەڵناسی، ئەزموونی تاکەکەسی رەت ناکاتەوە یان بە سووك چاوی لێناکا، بەڵام بە پێکهێنانی حەساسیت لە هەمبەر ئەو جیهانە بەرینەی چالاکی کۆمەڵایەتی کە پەیوەندی بە هەموومانەوە هەیە، ئێمە بە شێوەیەکی قووڵتر تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکانی خۆمان‌و خەڵکی دیکەش دەناسین. لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا چاو بەسەر مەسەلە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵناسیدا دەخشێنین‌و پەیوەندی نێوان ئەو مەسەلانەو بابەتەکانی تری زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەخەینە بەرباس. فێربوونی کۆمەڵناسی، پرۆسەی گەڕانە بە دوای خۆماندا. کەس ناتوانێ کۆمەڵناسی بخوێنێتەوە بە

بۆ ئەوەی کە لە سەر قەناعەتە شەخسییەکانی خۆی گومانی لا دروست نەبێ.

1

کۆمەڵناسی: کێشەکان و ڕوانگەکان

کۆمەڵناسی: مەسەلەکان و ڕوانگەکان –

کۆمەڵناسی دەربارەی کردارەکانمان چیمان فێردەکا؟

کۆمەڵناسی دەڵێ چی؟ چەند نموونە – پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و کرداری ئینسانی

ئەوین و هاوسەریەتی – فراوانکردنی ڕوانگەی کۆمەڵناسانە

لەش ساغی و نەخۆشی – ئایا کۆمەڵناسی زانستە؟

نموونەیەکیتر: تاوان و سزا – بابەتی بوون (عینیت)

ئاکامەکان: ناوەرۆکی کۆمەڵناسی – بایەخی پراکتیکی کۆمەڵناسی

گۆڕانکاری لە دونیای ئەمڕۆدا – تێگەیشتنی بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکان

کۆمەڵناسی و " باوەڕە باوەکان" – ناسینی جیاوازییە کەلتوورییەکان

پرسیارەکانی کۆمەڵناسی – هەڵسەنگاندنی ئاسەواری نەخشەدانانەکان

پرسیارە ڕاستەقینەکان – بردنە سەری توانای خۆناسی

پرسیارەکانی گونجاندن – دەوری کۆمەڵناس لە کۆمەڵدا/ بە ئاکام گەیشتن/ پۆختەی باسەکان

پرسیار لە مەڕ پێکهاتن

پرسیارە تیۆرییەکان

ئاکامە خوازراو و نەخوازراوەکانی کرداری ئینسانی

ئێمە ئەمڕۆ – کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم – لە جیهانێکدا دەژین کە تابڵێی مەترسیدارەو لە هەمان کاتیشدا لێواولێوە لە سەرسووڕهێنەرترین مزگێنییەکان بۆ داهاتوو. جیهانێک کە لە ناو شەپۆلێک گۆڕانکاریدایە، جیهانێک کە زراوی لە ئەگەری سەرهەڵدانی شەڕی ناوکی چووەو لەبەردەم هێرشی رووخێنەرانەی تەکنۆلۆژیای سەردەم بۆ سەر ژینگەدایە. لەگەڵ ئەوانەشدا ئێمە ئەوەندە ئامرازو کەرەستەمان لە بەردەستدایە کە دەتوانین بە سەر چارەنووسی خۆماندا زاڵ بین و ژیانی خۆمان وەها باشتر بکەین کە باوباپیرانمان بە خەیاڵیشیاندا نەدەهات. ئەم دونیایە چۆن پێك هات؟ بۆچی هەلومەرجی ژیانی ئێمە لەگەڵ هەلومەرجی ژیانی باوباپیرانمان جیاوازە؟ گۆڕانکارییەکانی داهاتوو بە چ ئاڕاستەیەکدا دەمانبەن؟

ئەم پرسیارانە مەسەلەی بنەڕەتی کۆمەڵگای ئێمەن، زنجیرەیەك کە بەم شێوەیە دەورێکی سەرەکی لە کەلتووری فیکری ئەمڕۆدا دەگێڕێ.

کۆمەڵناسی، واتە خوێندنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی، گرووپ و کۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکان" خوێندنەوەیەکی هەست بزوێن و سەرنجڕاکێشە کە خودی ئێمە وەکو بوونەوەرە کۆمەڵایەتییەکان بابەتی سەرەکی ئەو خوێندنەوەیەن. کۆمەڵناسی پانتاییەکی ئێجگار بەربڵاوی هەیەو لە شیکردنەوەی هەڵسوکەوتی خەڵکی شەقامەوە بگرە تا تاوتوێ کردنی پرۆسە کۆمەڵایەتییە جیهانییەکان، (هەر هەمووان) دەگرێتەوە. هێنانەوەی چەند نموونەیەك یارمەتیمان دەدا تا بە شێوەیەکی سەرەتایی لە کرۆك و ئامانجەکانی تێبگەین.

کۆمەڵناسی باسی چیدەکا؟

چەند نموونەیەک ئەوین و هاوسەرێتی

بۆچی تاکەکان دەبنە ئەویندارو ژیانی هاوبەش پێك دێنن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە

سەرەتادا زۆر ئاسانە. عەشق دەربڕی خوشەویستییەکی جەستەیی و شەخسییە کە دوو کەس بەرانبەر بەیەکتر هەستی پێدەکەن. ئەم سەردەمە لەوانەیە بەشێك لە ئێمە گومانمان لەسەر ئەو بۆچوونە هەبێ کە دەڵێ عەشق "ئەبەدی"یە، بەڵام بەگشتی پێمان وایە کە"عاشق بوون" لە هەست و سۆزە گشتییەکانی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ. بۆ ئەو دوو لاوەی کە عاشق دەبن زۆر سرووشتییە کە بیانەوێ ژیانی هاوبەش پێکبێنن و لە پەیوندییەکانیاندا بە دوای دامرکاندنەوەی ئارەزووە شەخسی و جنسییەکانیاندا بگەڕێن.

بەڵام ئەم روانگەیە کە بەو شێوە راشکاوانەیە، لە راستیدا بەتەواوەتی نائاسییە. ئەویندداربوون ئەزموونی هەموو ئینسانەکان نیەو زۆر کەم رێ دەکەوێ کە پەیوەندی بە پێکهێنانی ژیانی هاوبەشەوە هەبێ. دەکرێ بڵێین کە چەمکی عەشقی رۆمانسیانە تا پێش ئەم سەردەمەی دوایی لە رۆژئاوادا پەرەی نەگرتبوو و هیچکات لە زۆربەی کەلتوورەکانیتردا نەبووە. تەنیا لەم سەردەمەی دواییدایە کە عەشق، هاوسەرێتی و حەزە جنسییەکان پێکەوە گرێ دراون. لە سەدەکانی ناوەڕاست و سەدەکانی دوایشدا، تاکەکان لە بنەڕەتدا بۆ مانەوەی مافی خاوەنداریەتی یان دارایی لە دەست بنەماڵە یان بارهێنانی منداڵان بۆ کارکردن لە مەزرای بنەماڵەییدا ژیانی هاوبەشیان پێکدەهێنا. هەندی جار لەوانە بوو کە ژن و پیاو دوای زەماوەندکردن ببنە هاوڕێی نزیکی یەکتر، بەڵام ئەم حاڵەتە زیاتر دوای زەماوندکردن دروست دەبوو نە بەر لەوە. پەیوەندی جنسی لە دەرەوەی هاوسەرێتیەوە هەبوو، بەڵام ئەو هەستانەی کە ئێمە دەیبەستینەوە بە عەشقەوە کەمتر لە نێو ئەم پەیوەندیانەدا هەبوون. عەشق لە باشترین دۆخی خۆیدا عەیبێکی حاشاهەڵنەگرو لە خراپترین دۆخی خۆیدا بە جۆرێك نەخۆشی دەزانرا *(Montero, 1977, p. 123)*.

عەشقی رۆمانسی بۆ یەکەمجار وەك یەکێك لە تایبەتمەندییە بەزمگێڕییە جینسییەکانی دەرەوەی چوارچێوەی ژن و مێردایەتی کە ئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتی بۆ کەیف وخوشی، خۆیان پێوەی سەرقاڵ دەکرد، لە کۆڕو دیوەخانی پاشاکاندا دەرکەوت و تا دوو سەدە لەوە پێش لە چواچێوەی ئەو کۆڕو دیوەخانانە تێنەپەڕیو وەك شتێکی دیارو بەرچاو لە ژیانی هاوبەش جیا دەکرایەوە. پەیوەندی نێوان ژن و پیاو لە نێو شازادەکاندا – بێگومان لە چاو چاوەڕوانییەکانی ئەوڕوی ئێمەدا – بە گشتی سارد و سنووردار بوو. دەوڵەمەندەکان لە خانووی مەزندا دەژیان، ژن و پیاو هەرکامەو دیوی نووستنیان جیا بووو نۆکەرو کارەکەری خۆیان هەبووو کەم وابوو بە تەنیا پێکەوە بن. تێکەڵاوی جینسی کارێکی بە رێکەوت بووو هیچ پەیوەندی بە هاوسەریتییەوە نەبوو. بڕیاری هەڵبژاردنی هاوسەر لە نێو هەردوو چینی داراو نەداردا لە دەست بنەماڵەو کەسوکاردا بوو، و خودی ئەو کەسانەی ئەو کارەیان دەکرد هیچ دەورێکیان لەو کارەدا نەدەگێڕا. (ئەم مەسەلەیە ئێستاکەش لە نێو زۆر کەلتووری نا روژئاواییدا هەیە.)

کەوابوو نە عەشقی رۆمانسی و نە پەیوەندی ئەو عەشقە بە هاوسەرێتییەوە ناتوانن وەك تایبەتمەندییە "رەها"کانی ژیانی مرۆڤایەتی بناسرێن، بەڵکوو لە ژێر کاریگەرییە گشتگیرە کۆمەڵایەتیەکاندا پێك دێن. ئەمانە ئەو کاریگەریانەن کە کۆمەڵناسان لێیان دەکۆڵنەوە – و تەنانەت لەو ئەزموونانەشدا دەردەکەون، کە

بەرواڵەت تەواو شەخسین. زۆربەمان بە پێی تایبەتمەندییەکانی ژیانی خۆمان لە جیهان تێدەگەین. کۆمەڵناسی بوونی روانگەیەکی بەربڵاو بۆ دەربڕینی هۆکاری کردارەکانمان وەك پێویستییەك دەسەلمێنێ.

### لەش ساغی و نەخۆشی

لە روانگەی ئێمەوە لەش ساغی و نەخۆشی ئەو مەسەلانەن کە بە گشتی پەیوەندیان بە حاڵەتی سروشتی لەشەوە هەیە. کەسێك هەست بە ئێش و ئازار دەکا، یان تای لێدێ، ئەم حاڵەتە چۆن دەتوانێ پەیوەندی بە کاریگەری بەربڵاوتری وەك کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەبێ؟ لە راستیدا، هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان کاریگەرییەکی قووڵیان لەسەر ئەزموون و سەرهەڵدانی نەخۆشی و هەروەها چۆنیەتی دژکردەوەی ئێمە لە ئاست نەخۆشیدا هەیە. خودی چەمکی "نەخۆشی" کە دەبێتە هۆی تێکچوونی سیستمی سروشتی کارکردنی لەش لە هەموو کۆمەڵگاکاندا تێگەیشتنی جیاوازی هەیە. لە روانگەی هەندێ لە کەلتوورەکانەوە نەخۆشی و تەنانەت مردنیش لە هێزە ئەهریمەنییەکانەوە سەرچاوە دەگرن، نەك لە هۆکارێکی سروشتی چارەسەردارەوە *(Evans-Pritchard 1950)*.

لە کۆمەڵگای ئێمەدا زانا مەسیحییەکان بەشێکی زۆری ئەو بیرکردنەوانە رەت دەکەنەوە کە بە پێی مەعریفەی مەسیحییەت چاو لە نەخۆشی دەکەن، واتە ئەو بڕوایە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی رۆحانی و کامڵە و نەخۆشکەوتنی لە تێگەیشتنی خراپی راستییەکانەوە سەرچاوە دەگرێ و دەبێتە هۆی ئەوە کە تووشی هەڵە بێت.

هیواداربوون لە ژیانداو ئەگەری تووشبوون بە نەخۆشییە سەختەکانی وەك نەخۆشییەکانی دڵ، شێرپەنجە و هەوکردنی سینگ تێکڕا لە ژێرکاریگەری جیددی تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییەکاندان. هەتا خەڵك ژیانیان باشتر بێ، ئەگەری ئەوە کە لە قوناغێکی ژیانیاندا بە دەست نەخۆشییەکەوە بناڵێنن، کەمتر دەبێ. جگە لەوە چەند رێسایەکی دیارو پێناسەکراو هەن دەربارەی ئەوەی کە لە کاتی نەخوشیدا دەبێ چ بکەین. کەسێك کە نەخۆش دەکەوێ ناتوانێ هەموو یان بەشێکی بەرچاوی ئەرکەکانی بەجێ بگەیەنێ، بەڵام دەبێ نەخۆشییەکە بە رادەی پێویست بە جیددی بزانرێ تا ئەو کەسە بێ رەخنە و لۆمەی دەوروبەر داوای ئەو ئیمتیازانە بکا. کەسێك کە وا دەنوێنێ بە دەست نەخۆشییەکی سووکەوە ئازار دەکێشێ، یان نەخۆشییەکەی بە تەواوی نەناسراوە ، رەنگە بە کەسێکی درۆزن بزانرێ – واتە ئەو کەسە بۆی نیە کە ئەرکەکانی ژیانی رۆژانەی بەرێوە نەبا *(Segal,Cockerham1986,1976)*

### نموونەیەکی تر: تاوان و سزا

ئەم راپورتە دڵتەزێنەی خوارەوە پەیوەندی بە دوایین ساتەکانی ژیانی کەسێکەوە هەیە کەبە تاوانی پیلاندان بۆ لە نێو بردنی پاشای فەرەنسە لە ساڵی 1757دا سزای کوشتنی بە سەردا درابوو. سزای ئەو پیاوە رۆژرەشە ئەوە بوو کە گۆشتی جەستەی لێبکرێتەوە و تێکەڵاوێك لە رۆنی قرچاوو مۆم و گۆگرد بکرێتە سەر برینەکانی. پاشان دەبوا چوار پەلی جەستەی بە هۆی چوار ئەسپەوە لێك بترازێنرێت و چوار لەت بکرێ و دواتر ئەندامە براوەکانیش بسووتێنرێن. زابتێکی زێرەڤان راپۆرتێکی دەربارەی بەرێوەچوونی سزاکە نووسیوە:

جەلاد شیشێکی ئاسنینی کرد بە نێو قازانێکی گەورەی پڕ لە رونی قرچاوداو بە دڵفراوانییەوە رژاندی بەسەر برینەکاندا. پاشان ئەوگوریسانەی کە دەبوا لە ئەسپەکان ببەسترێن، بە سەرە گوریسی کورتتر لە کابرای تاوانباریان ئاڵاند. پاشان هەر پەلێکی کابرایان بە ئەسپێکەوە بەست ..... ئەسپەکان زەختێکی زۆریان دەکرد، هەریەکەوە لە لایەکەوە راستەوخو دەستێك یان قاچەکیان رادەکێشا و هەر جەلادێکیش لەغاوی ئەسپێکی رادەکێشا. دوای تێپەڕینی چارەکە سەعاتێك، هەر ئەو رێورەسمە دووپات بووەوەو سەرەنجام دوای هەوڵێکی زۆر ناچار بوون شوێنی ئەسپەکان بگوڕنەوە، بەم شێوەیە کە ئەو ئەسپانەی کەوتبوونە لای قاچەکانەوە، بچنە شوێنی دەستەکان، بۆ ئەوەی لە بنەوە لێیان بکەنەوە. ئەم شێوەیە دوای چەند جار دووپاتبوونەوە سەرنەکەوت.

دوای چەند هەوڵێك، سامسۆنی جەلادو جەلادێکیتر کە مەقەستی پێ بوو، سەرو چەقویەکیان لە گیرفانیان دەرهێنا و لە جیاتی ئەوەی قاچەکان لە جومگەوە لێبکەنەوە، جەستەیان لە رانەکان جوێ کردەوە، هەر چوار ئەسپەکە تەکانێکیان داو هەر دوو رانەکەیان لێکردەوەو بە دوای خۆیاندا رایانکێشا، واتە سەرەتا رانی لای راستو پاشان ئەویتر. لە دواییدا هەردوو دەست و شان وپیلیشیان هەر بەو شێوەیە لێکردەوە. جەلادەکان ناچار بوون تا سەر ئێسك گۆشتەکە ببڕن. ئەسپەکان زەختێکی زۆریان کردو سەرەتا دەستی راستو پاشان دەستی چەپیان لێکردەوە. *(Foucault, 1979, pp.4-5)*. قوربانییەکە تا لێ کردنەوەی دوایین ئەندامی لەشی هەر زیندوو بوو.

ئەم جورە سزادانانە تا پێش سەردەمی نوێ شتێکی نائاسایی نەبوون. بە جۆرێك کە "جان لوفلەند" بەم جۆرە باس لە شێوە نەریتییەکانی بەرێوەچوونی سزای کوشتن دەکا:

لە سەردەمی کۆندا ئەم جۆرە سزادانانە بە جۆرێك دانرابوو، کە تاوانبارەکە لە ماوەی سزادانەکەدا تاکوو دەمرێ ئاگای لە خۆی بێت. کوشتن لە رێگای زیادکردنی بەربەرەی ئەو کێشە قورسانەی کە لە سەر سینگ دادەنران. وردوخاشکردن لە ژێر چەرخدا، لە خاچدران، خنکاندن، بە زیندوویی سووتاندن، ئەنجن ئەنجن کردنی گوشتی لەش، شەقار شەقارکردنی ئەو شوێنانەی لەش کە نابنە هۆی مردن، راکێشانو لە شەتەکدان، و شێوەی دیکە ماوەیەکی زۆری دەخایاند. تەنانەت لە سێدارە دان لەمێژووی خۆیدا تەکنیکێکی لەسەرەخو بوو. کاتێك کە تەنیا کورسییان لە ژێر پێی تاوانبارەکەدا لادەبرد، یان تەنیا سەری چاڵی ژێر پێیان بەتاڵ دەکرد، تاوانبار بە هێواشی دەخنکاو بەر لە گیانکەندن ماوەیەك لوول دەبوو... بۆ کورتکردنەوەی ئەو ماوەیە جاری وا جەلاد دەچووە ژێر لەشی تاوانبارەکەو ڕایدەکێشا *(Lofland, 1977, p. 311)*.

بە زۆری ئەو ئێعدامانە بە بەرچاوی ئاپۆڕای خەڵکەوە ئەنجام دەدران --- ئەو شێوەیە تا سەدەی هەژدەهەمیش لە هەندێ لە وڵاتاندا هەر مابوو. ئەو کەسانەی کە بڕیار بوو ئێعدام بکرێن، بە عەرەبانەیەکی سەر ئاوەڵا بە نێو شەقامەکاندا دەیانگەڕاندن تا وەك بەشێك لە شانۆیەکی بە ناوبانگی بانگەشەکەرانە پێشوازییەکی باشیان لێبکرێو ئیتر خەڵك بە پێی جۆری لێکدانەوەی خۆیان لەسەر قوربانییەکە بە تایبەت بە هەلهەلە کێشان یان بە هوتاف کێشان، یان بە شادی یان

تووڕەیی هەستیخۆیان دەردەبڕی. جەلادەکان ناوبانگێکی زۆریان هەبوو و تا رادەیەك وەك ئەستێرەکانی سینەمای ئەم سەردەمە ناوبانگو لایەنگریان هەبوو.

لەم سەردەمەدا ئێمە ئەو جۆرە سزادانانە بە کارێکی زۆر ناشیرین دەزانین. رەنگە کەم کەس هەبێت کە بە راستی چێژ لە تەماشاکردنی کەسێك ببا کە خەریکە ئەشکەنجە دەدرێ یان بە شێوەیەکی زۆر درندانە دەکوژرێت، بێ لەبەرچاو گرتنی هەر تاوانێك کە رەنگە ئەنجامی دابێ. یاسای سزادانی ئێمە لە سەر بنەمای لە بەندیخانە هاویشتنی تاوانبار دامەزراوە، نەك ئازاردانی جەستەیی،و سزای ئێعدام لە زۆربەی ولاَتە رۆژئاواییەکاندا بە یەکجاری هەڵوەشاوەتەوە. بۆچی ئەم گۆڕانکاریانە پێك هاتن؟ هۆی چی بوو سزای بەندیخانە جێگای شێوەی کۆنترو توندو تیژانەتری رابردووی گرتەوە؟

لەوانەیە پێمان وابێ کە خەڵك لە رابردوودا درندەتر بوون، لە حاڵێکدا ئێمە خۆمان بە ئینسان دەزانین. بەلاَم ئەم جۆرە بۆچوونانە ناتوانێ کۆمەڵناسێك رازی بکا. بەکار هێنانی توندوتیژی بە شێوەیەکی فەرمی چەندین سەدە لە ئەورووپادا سەقامگیر ببوو. تێگەیشتنی خەڵك لە سەر ئەو جۆرە کردەوانە لە کتووپڕێکدا گۆڕانی بەسەردا نەهات. گەلێك فاکتەری کۆمەڵایەتی گرنگتر لە ئارادا بوون کە پەیوەندییان بەو پرۆسە مەزنانەی گۆڕانکارییەوە هەبوو کە لەو سەردەمەدا روویان دەدا. کۆمەڵگاکانی ئەورووپا لەو سەردەمەدا دەگۆڕان بۆ کۆمەڵگای پیشەیی و مەدەنی. سیستمی لادێی بە خێرا جێگای خۆی لە گەڵ سیستمێکدا دەگۆڕییەوە کە تێیدا خەڵکێکی زیاتر لە فابریکەو کارگەکاندا کاریان دەکردو روویان دەکردە دەوروبەری شارەکان کە بە خێرایی پەرەیان دەسەند. دانانی چاودێری کۆمەڵایەتی بە سەر ئەو گرووپانەدا کە لە شارەکاندا پێگەیان هەبوو، بە شێوەی جاران نەدەکرا. ئەم شێوە سزادانانە کە پشتیان بە ترساندنو دەرس دادانی خەڵك دەبەست، تەنیا بۆ ئەو کۆمەڵگا بچووکانە دەگونجان کە بە تەواوی داخراو بوونو تاوانەکان جۆراوجۆر نەبوون.

بەندیخانەکان وەك بەشێك لە رەوتێکی گشتی لە پێناو دامەزراندنی هەندێ رێکخراودا کە تاوانباران تێیاندا لە پشت دەرگا داخراوەکانەوەو جیا لە جیهانی دەرەوە رادەگیران -- وەك ئامرازێك بۆ رێکوپێك کردنو چاوەدێری کردن بە سەر هەڵسوکەوتیاندا – پەرەیان گرت. ئەو کەسانەی لە بەندیخانەکاندا رادەگیران، سەرەتا تەنیا تاوانباران نەبوون، بەڵکوو کەسانی بێ خانەولانە، نەخۆشەکان، بێکاران، کەسانی ناتەواو و شێتەکانیشی دەگرتەوە. بەلاَم دواتر بەندیخانەکان لە شێتخانەو نەخۆشخانەکان جیا کرانەوە. لە بەندیخانەکاندا دەبوا تاوانباران سەرلە نوێ پەروەردە بکرێنەوەو بکرێن بە هاولاَتییەکی شایستە. لە جیاتی ئەوەی کە سزادان بە بەرچاوی خەڵکەوەو بۆ نیشاندانی ئاکامە ترسناکەکانی تاوانکاری بێت، لە پێناو بارهێنانی هاولاَتییەکی گوێڕایەڵدا کەوتووەتە کار. ئەو شتەی کە ئەمڕۆ ئێمە وەك روانینێکی مرۆڤانەتر لە هەمبەر مەسەلەی سزادان لێی تێدەگەین، زیاتر دەرەنجامی ئەو گۆڕانکاریانە بوو، تا ئەوەی کە لە بنەڕەتدا هۆی ئەو گۆڕانکاریانە بێت. ئەو گۆڕانکاریانە کە لە شێوەی هەڵسوکەوت لەگەڵ تاوانباراندا پێك هاتن، بەشێك بوون لەو پرۆسانە کە بوونە هۆی وەلانان و فڕێدانی ئەو سیستمانەی

که به درێژایی چەندین سەدە لە لایەن خەڵکەوە قبووڵ کرابوون. ئەم کۆمەڵگایانەی کە ئەمڕۆ ئێمە تێیاندا دەژین لە ئەنجامی ئەم پرۆسانەوە پێك هاتوون.

### ئاکامەکان: مەغزای کۆمەڵناسی

لێرەدا دەتوانین تەواوی ئەو نموونانە تاوتوێ بکەین کە تاکوو ئێستا باسمان لێکردوون. لە هەرکام لەم نموونانە — واتە عەشق ، ژیانی هاوبەش‌و حەزی جنسی، لەش ساغی‌و نەخۆشی‌و سزادانی تاوانکاران — دا بۆمان دەرکەوت کە ئەوەی وێدەچێ بە هەست‌و سوزی ئینسانی وێنا بکرێ، لە راستیدا بە شێوەیەکی بەربڵاو لە ژێر کاریگەری فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکاندایە. تێگەیشتن لەوەی کە ژیان بە چ شێوەیەکی وردو هەر لەو کاتەشدا قووڵ‌و ئاڵوز بەستێنەکانی ئەزموونی کۆمەڵایەتی ئێمە ئاوەژوو دەکا، لە روانگەی کۆمەڵناسییەوە بایەخی سەرەکی هەیە. کۆمەڵناسی سەرنجی تایبەتی دەداتە ژیانی کۆمەڵایەتی لە جیهانی ئەمڕۆدا — جیهانێك کە لە ئەنجامی ئەو گوڕانکارییە بەربڵاوانەوە پێك هاتووە کە لە ماوەی دوو سەدەی رابردوودا لە کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکاندا روویان داوە.

### گوڕانکاری لە جیهانی ئەمڕۆدا

دووسەد ساڵ لەوەوپێش گۆڕانکاری بەربڵاو بەسەر شێوەکانی ژیانی مرۆڤدا پێك هاتووە. بۆ نموونە، ئێمە لە گەل ئەو راستییەدا راهاتووین کە زۆربەی خەڵك کاری کشت‌وکاڵ ناکەن‌و لە جیاتی ژیان لە گوندە بچووکەکاندا لە شارۆچکە و شارە گەورەکاندا دەژین. بەڵام ئەمە تا ئەم سەردەمە نوێیە هەرگیز وانەبووە. لە سەراسەری مێژووی مرۆڤایەتیدا، زۆرینەی خەڵك ناچاربوون بۆخۆیان ئامرازەکانی ژیانیان بەرهەم بێنن‌و لە نێو گرووپی بچووك یان گوندی بچووکدا بژین. تەنانەت لە سەردەمی زێڕینی پێشکەوتووترین شارستانییەتە کۆنەکانی — وەك رۆمی کۆن یان چینی کۆن — یشدا کەمتر لە 10 لەسەدی خەڵك لە شارەکاندا دەژیان‌و خەڵکی‌تر تێکڕا خۆراکیان بەرهەم دێنا. ئەمڕۆ لە زۆربەی کۆمەڵگا پیشەییەکاندا ئەم رێژەیە بە تەواوی ئاوەژوو بووەتەوە: بەگشتی زیاتر لە 90 لەسەدی خەڵك لە شارەکاندا دەژین‌و تەنیا 2 تا 3 لە سەدی خەڵك لە سەر مەزراکاندا ئیش دەکەن.

گۆڕان تەنیا لایەنە رواڵەتییەکانی ژیانی ئێمەی نەگرتووەتەوە، ئەم گۆڕانکاریانە بە شێوەیەکی بنەڕەتی شەخسییترین‌و تایبەتیترین لایەنەکانی ژیانی رۆژانەی ئێمەیان گۆڕیوەو بەردەوام دەیگۆڕن. لە درێژەی یەکێك لەو نموونانەی پێشودا دەتوانین بڵێین کە پەرەگرتنی ئامانجە خەیاڵییەکانی عەشقی رۆمانسی پەیوەندییەکی پتەوی بە تێپەڕین لە قۆناغی گوند نشینییەوە بەرەو ژیانی پیشەسازی‌و شارنشینییەوە هەبوو. بە کۆچکردنی خەڵك بۆ دەورووبەری شارەکان‌و بەشداربوون لە بەرهەمهێنانی پێشەسازیدا، هاندەرە ئابوورییەکان — واتە پێویستی چاوەدێریکردن بەسەر میرات‌و ئیشکردن لە سەر زەویدا وەك کەرتێکی بەرهەم هێنانی بنەماڵەیی — ئیتر هاندەری هاوسەریەتی نەبوون. ئەو ژن‌و ژنخوازییە خێڵەکییانە کە بە بڕیاری گەورەو ریش سپیی نێو بنەماڵەو خزم‌و کەسەکان پێك دەهاتن، وەك جاران باویان نەما. گەنجەکان لە سەر بنەمای ئەوینداری‌و بە مەبەستی دۆزینەوەی رێگاچارەیەك بۆ دامرکاندنی هەستەکانیان بە شێوەیەکی بەربڵاو کەوتنە پێکهێنانی پەیوەندی ژن‌ومێردایەتی. چەمکی

"عاشقبوون" وەك سەرەتايەك بۆ بەستنی پەيمانی هاوسەرێتی لەم بوارەدا سەری هەڵدا. (بۆ باسی زياتر سەيری پاژی 12: خزمايەتی ، هاوسەريەتی و بنەماڵە بكە).

هەروەها پێش سەرهەڵدانی پزيشكيی نوێ ، ئەورووپييەكانيش وەك بەشێكی زۆر لە ولاتە ناڕۆژئاواييەكان دەيانڕوانييە لەش ساغی و نەخۆشی. تەنيا لە سەرەتای سەدەی نوزدەهەمدا بوو كە مێتودی پێشكەوتوو بۆ ناسين و دەرمانكردنی نەخۆشييەكان، وێڕای ئاگاداربوون لە بايەخی پاك‌وخاوێنی بە مەبەستی پێشگرتن لە سەرهەڵدانی نەخۆشييە سەختەكان سەريان هەڵدا. بيركردنەوەكانی ئەمڕۆی ئێمە دەربارەی لەش ساغی و نەخۆشی وەك بەشێك لە گۆڕانكارييە كۆمەڵايەتييەكان كە زۆربەی لايەنەكانی بيروبڕوای ئێمەيان دەربارەی ژينگەو سروشت خستە ژێر كاريگەری خۆيانەوە، سەريان هەڵدا.

كۆمەڵناسی بە هەوڵ و كۆششی ئەو بيرمەندانە دەست پێدەكا كە تێئەكوشن تا لە گۆڕانكارييە سەرەتاييەكانی دەسپێكی بە پيشەيی بوونی ئەورووپا تێبگەن و هەروەها تاقانە لقی سەرەكييە كە سەرقاڵی شرۆڤە كردنی مەغزای ئەو كاريگەريانەيە. ئەم سەردەمەی ئێمە جياوازييەكی بنەڕەتی لەگەڵ سەردەمەكانی پێشوودا هەيە، كۆمەڵناسی لەسەريەتی يارمەتيمان بدا تا لە جيهان و داهاتووە كۆمەڵايەتييەكەی تێبگەين.

### كۆمەڵناسی و "باوەڕە باوەكان"

خوێندنەوەی كۆمەڵناسی دەبێتە هۆی ئەوە كە لەسەر خۆمان، ئەو كۆمەڵگايەی تێيدا دەژين و ئەو كۆمەڵگايانەش كە لە رووی زەمەن و بارودۆخەوە لەگەڵ كۆمەڵگاكانی ئێمەدا جياوازيان هەيە، زانياری بەدەست بێنين. دەرەنجامەكانی خوێندنەوەی كۆمەڵناسی هەم باوەڕە باوەكانی لەمەڕخۆمان و خەڵكی‌تر دەباتە ژێر پرسيارو هەم دەوڵەمەنديان دەكا.

ئەم وتانەی خوارەوە لەبەر چاو بگرن:

1-عەشقی رۆمانسی بەشێكی سروشتی ئەزموونی مرۆڤايەتييە و هەربۆيە لە هەموو كۆمەڵگاكاندا بەرچاو دەكەوێ و پەيوەندييەكی توندوتۆڵی لەگەڵ هاوسەرێتيدا هەيە.

2-تەمەنی مرۆڤ پەيوەندی بە شێوەی ژيانييەوە هەيە و جياوازييە كۆمەڵايەتييەكان كاريگەرييەكی ئەوەندە زۆری بەسەرەوە نيە.

3-لە سەردەمەكانی پێشوودا بنەماڵە بەشێكی نەگۆڕ بوو، بەلام ئەمڕۆ رێژەی "بنەماڵە لێكدابڕاوەكان" ئێجگار زۆر بووە.

4-لە هەموو كۆمەڵگاكاندا هەندێ كەس خەمبارو خەمۆكن، كەوابوو لە سەراسەری جيهاندا رێژەی خۆكوشتن كەم و زۆر يەكسان دەبێت.

5-لە هەموو شوێنێكدا زۆربەی خەڵك رێز لە سامانی ماددی دەگرن، و ئەگەر هەلی پێشكەوتن لە ئارادا بێت هەوڵ دەدەن پێشبكەون.

6-بەدرێژايی مێژووی مرۆڤايەتی شەڕ هەبووە. ئەگەر ئەمڕۆ ئەگەری سەرهەڵدانی شەڕی ئەتۆمی هەڕەشەمان لێدەكا، لەبەر ئەو راستييەيە كە ئێنسانەكان خاوەن غەريزەيەكی شەڕەنگێزانەن كە هەميشە رێگايەك بۆ خۆدەرخستن نيشان دەدا.

7-پەرەگرتنی كۆمپيوتەرو تەكنۆلۆژيا لە بەرهەمهێنانی پيشەييدا دەبێتە هۆی دابەزاندنی نێوندی كاری رۆژانەی زۆربەی خەڵك.

هەريەك لەم بۆچوونانە ناڕاست و جێی گومانن و تێگەيشتن لە هۆی ناڕاست بوونيان يارمەتيمان دەكا تا بتوانين لەو پرسيارانە تێبگەين

کە کۆمەڵناسەکان لە توێژینەوەکانیاندا دەیهێننە گۆڕێ – و هەوڵ دەدەن وەڵامی بدەنەوە. (ئەم بابەتانە لە پاژەکانی دواتردا بە درێژی شرۆڤە دەکرێن) .

1–هەروەک بینیمان ئەو ئەندێشەیە کە پێی وایە دەبێ پەیوەندی ژن ومێردایەتی لە سەر بنەمای عەشقی رۆمانسی بێت، چەمکێکی نوێیە کە لە سەردەمە دێرینەکانی ولاتە رۆژئاواییەکان ، یان لە کەلتوورەکانیتردا نەبووە. لە راستیدا عەشقی رۆمانتیک لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا نەناسراوە.

2–بێگومان فاکتەرە کۆمەلایەتییەکان کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر درێژبوونی تەمەنی مرۆڤ هەیە. لە بەر ئەوە کە شێوەکانی ژیانی کۆمەلایەتی دەوری سافییەک دەبینن بۆ تێپەڕبوونی فاکتەرە ژینگەییەکان کە دەبنە هۆی نەخۆشی، بێ هێزی یان مردن. بۆ نموونە خەڵکی هەژار لەچاو دەوڵەمەندەکاندا بە شێوەیەکی نێونجی تەندروستییەکی کەمتریان هەیە، چونکە بە گشتی رەوشی خواردنیان باش نیە، شێوەی ژیانیان وایە کە دەبێ هێزێکی زۆری جەستەیی بەکاربێنن و خزمەتە پزیشکییەکانیان لەئاستێکی خوارەوە دایە.

3–ئەگەر چاوێک بە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بگێڕین، رێژەی ئەو منداڵانەی کە یەک بنەماڵەو یەک دایکوباوکیان هەبووە، رەنگە هەر بە قەدەر ئەمڕۆ زیاد بووبێ، چونکە ژمارەیەکی زۆرتری ئەوانە لە تافی لاویدا، و بە تایبەت ژنان لە کاتی منداڵبووندا دەمردن. تەلاقدان و جیابوونەوە هۆی سەرەکی پەیدا بوونی "بنەماڵە لێکدابڕاوەکان"ە، بەلام رێژە گشتییەکە جیاوازییەکی زۆری هەیە.

4–بێگومان رادەی خۆکوژی لە هەموو کۆمەڵگاکاندا وەک یەک نیە. تەنانەت ئەگەر تەنیا ولاتە رۆژئاواییەکان لەبەرچاو بگرین، دەبینین کە رادەی خۆکوژی لەم ولاتانەدا بە شێوەیەکی بەربڵاو جیاوازیان پێکەوە هەیە. بۆ نموونە رادەی خۆکوژی لە بەریتانیادا چوار ئەوەندەی ئیسپانیایە، بەلام تەنیا یەک لە سێی رادەی هەنگاریایە. لە سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، واتە لە سەرەکیترین قۆناغی بە پیشەیی بوونی کۆمەڵگا رۆژئاواییەکاندا رادەی خۆکوژی زیادبوونێکی زۆری بەخووە بینی.

5–ئەو بایەخەی کە ئەمڕۆ خەڵک لە کۆمەڵگاکاندا بۆ سەروەت و پێشکەوتن دایدەنێن بە گشتی گۆڕانێکی نوێیە. ئەم دیاردەیە پەیوەندی بە سەرهەڵدانی "فەردییەت" لە رۆژئاوادا هەیە. ئێمە ئەمڕۆ بە گشتی هەر ئەو بایەخە بۆ پێشکەوتنی تاکەکان دادەنێین . لە زۆرێک لە کەلتوورەکانیتردا ئەو چاوەڕوانیە لە تاکەکان دەکرێ کە بەرژەوەندی کۆمەڵگا بخەنە سەرووی حەزو ئارەزووەکانی خۆیانەوە. سامانی ماددی لە بەراورد لەگەڵ باقی بەهاکانیتری وەک بەها ئایینییەکاندا نرخێکی ئەوەندەی بۆ دانانرێ.

6–ئینسانەکان نەتەنیا غەریزەی شەڕەنگێزانەیان نیە، بەڵکوو ئەگەر غەریزە وەک مودێلێکی نەگۆڕ و بە میراتماوەی کردار چاو لێبکەین، لە بنەڕەتدا غەریزەیان نیە. سەرەرای ئەوە، لە زۆربەی مێژووی مرۆڤایەتیدا، ئەو کاتەی خەڵک بە شێوەی خێڵەکی دەژیان، شەڕکردن وەک ئەمڕۆ نەبوو. هەرچەند کە هەندێ لەو خێلانە شەڕەنگێز بوون، بەلام زۆربەیان وانەبوون. هیچ سوپایەک لە ئارادا نەبوو، و کاتێک کە شەرێک رووی دەدا، بە ئەنقەست هەوڵ دەدرا کەس نەکوژرێت و یان کەمتر بکوژرێت. ئەمڕۆ شەڕ پەیوەندی بە پرۆسەی "پیشەیی بوونی شەڕ"ەوە

هەیە کە بە گشتی لایەنێکی گرینگی بە پیشەیی بوونە.

7-ئەم گریمانە تا رادەیەك لەگەڵ گریمانەکانی‌تردا جیاوازی هەیە، چوونکە ئاماژە بە داهاتوو دەکا. بۆ ئەوەی کە لانیکەم لەم بارەوە بە پارێزەوە بجوڵینەوە، بەڵگەی پێویست لەبەر دەستدا هەیە. ئەو ئامێرانەی کە بەتەواوی ئەلەکترونین هێشتا ژمارەیان کەمەو ئەو ئیشانەی کە لە ئاکامی هاتنی ئامێرە ئەلەکترونییەکاندا وەلا دەنرێن، لە وانەیە بە ئیشی نوی کە لە شوێنی دیکەدا پێك دەهێنرێن جێگەیان پڕ بکرێتەوە. ئێمە هێشتا ناتوانین بە تەواوی دڵنیا بین‌و یەکێك لە ئەرکەکانی کۆمەڵناسی ئەوەیە بە شێوەیەکی جیددی ئەو بەڵگەنامە راستەقینانە چاو لێبکا کە لەم پەیوەندیانەدا هەیە. روون و ئاشکرایە کە ئەو دەرەنجامانەی کە لە توێژینەوە کۆمەڵناسییەکانەوە بەدەست هاتوون هەمیشە لەگەڵ بیرو بڕوای خەڵکدا دژایەتییان نیە. ئەو ئەندێشانەی کە پشتیان بە بڕوا باوەکان بەستووە، زۆرجاران دەبنە هۆی بنیاتنانی سەرچاوەکانی بینایی (بصیرت) دەربارەی ئاکاری کۆمەڵایەتی. بەڵام ئەوەی کە دەبێ پێی لەسەر دابگرین، ئەوەیە کە کۆمەڵناس دەبێ ئەوە بتوانێت پرسیارو گومان بخاتە سەر هەرکام لە باوەڕەکانمان لە پەیوەندی لەگەڵ خۆماندا - ئەگەرچی زۆریش دڵمان پێ خۆش بن. بەم جۆرە کۆمەڵناسی یارمەتی بە دەوڵەمەندکردنی هەر شتێك دەکا کە لە هەر کات‌و شوێنێکدا بڕوایەکی باوە. بەشێکی زۆر لەو شتانەی کە ئێمە بە بڕوایەکی باویان دەزانین واتە، ئەو شتەی هەر کەسێك دەیزانێت - بۆ نموونە ئەوە کە رادەی تەڵاق لە دوای شەڕی جیهانی دووهەمەوە تاکوو ئێستا گەلێك زیادی کردووە - لە ئاکامی توێژینەوەکانی کۆمەڵناسان‌و باقی زانایانی کۆمەڵایەتییەوە بەدەست هاتوون. ئەنجامدانی توێژینەوەی جۆراوجۆر لە پێناو وەدەستخستنی ئامارو زانیاری سالانە دەربارەی مۆدێلەکانی هاوسەرێتی‌و تەڵاق بە شێوەیەکی رێك‌وپێك کارێکی پێویستە. هەر ئەم کارەش لە پەیوەندی لەگەڵ بەشێکی بەرچاو لە بوارەکانی تری زانستدا کە پشتیان بە بڕوا باوەکان بەستووە، کارێکی دروستە.

## پرسیارەکانی کۆمەڵناسی

### پرسیارە راستەقینەکان

هەندێ لەو پرسیارانەی کە کۆمەڵناسەکان دەیهێننە ئاراوەو هەوڵ دەدەن وەڵامیان بدەنەوە، تا رادەیەکی زۆر راستەقینەن. لەبەر ئەوەی کە ئێمە ئەندامی یەك کۆمەڵگاین، هەمووومان پێشتر تا رادەیەك زانیاری باشمان لەسەر ئەو شتانە هەیە. بۆ نموونە لە بەریتانیادا هەندێ یاسا هەن کەهەموان دەبێ رەچاویان بکەن‌و ئەگەر بە پێچەوانەی ئەو یاسانە بجووڵێنەوە وەك تاوانبار دەکەونە بەردەم مەترسی سزادان. بەڵام لەوانەیە کەسێکی مام ناوەندی ئاگاداریەکی ئەوتۆی لە سەر یاسا،و مەغزاو شێوەکانی تاوان نەبێ. بەشێکی بەرچاوی لایەنەکانی تاوان‌و سزای عادلانە پێویستی بە توێژینەوەی راستەوخۆو رێکوپێکی کۆمەڵناسانە هەیە. کەوابوو لەوانەیە بپرسین: لە نێو تاوانەکاندا کامەیان زیاتر باوە؟ رێژەی ئەو کەسانەی کە تاوان ئەنجام دەدەن‌و بە هۆی پۆلیسەوە دەگیرێن چەندەیە؟ چەند کەسیان سەرەنجام حوکمیان لەسەر دەدرێ و دەکەونە بەندیخانە؟ پرسیارە راستەقینەکان زۆر لەوە ئاڵۆزترو دژوارترن کە مرۆڤ بیریان لێدەکاتەوە. بۆ نموونە ئاماری رەسمی

تاوانەكان بۆ نیشاندانی ئاستی راستەقینەی تاوانكاری جێی بڕوا نین.

### پرسیاری بەراوردكاری

ئاشكرایە كە زانیارییە راستەقینەكان دەربارەی كۆمەڵگایەك زیاتر كۆمەڵێك لە كاریگەرییە هەرە گشتیەكان نیشان دەداو ئەوەمان پێ نیشان نادا كە ئێمە تا چ رادەیەك لە گەڵ دیاردەیەكی ئاورتەدا بەرەورووین. كۆمەڵناسان بە گشتی دەیانەوێ پرسیاری بەراوردكاری بێننە ئاراوە، و بوارێكی كۆمەڵایەتی لە نێو كۆمەڵگایەكدا ببەستن بە بوارێكیترەوە یان ئەو نموونانە لە كۆمەڵگا جیاوازەكانەوە وەرگیراون لەگەڵ یەكتردا بەراورد بكەن. بۆ نموونە سیستمە یاساییەكانی بەریتانیا و ئەمریكا جیاوازییەكی بەرچاویان پێكەوە هەیە. لەم بارەوە دەكرێ نموونەی پرسیارێكی بەراوردكاری بەم شێوەیە بێت: تا چ رادەیەك مۆدێلەكانی كرداری تاوانكاریو چاودێری پۆلیس لەم دوو وڵاتەدا لە یەكترجیاوازن؟ (لە راستیدا هەندێ جیاوازی گرنگ لە نێو ئەوانەدا بەرچاو دەكەوێ.).

### پرسیار لەمەڕ پێكهێنان

لە كۆمەڵناسیدا نەتەنیا دەبێ كۆمەڵگاكانی سەردەم پێكەوە بەراورد بكەین، بەڵكوو پێویستە دوێنێ و ئەوڕۆش لە گەڵ یەكتردا بەراورد بكەین. ئەو پرسیارانەی كە كۆمەڵناسەكان دەیانخەنە روو، پرسیاری پێكهێنانن. بۆ تێگەیشتن لە مەغزای جیهانی ئەوڕۆ دەبێ شێوەكانی ژیانی رابردوو لەبەرچاو بگرین و هەروەها ئاقاری سەرەكی پرۆسەی گۆڕانكارییەكان تاوتوێ بكەین. بەم شێوە دەتوانین لەوە بكوڵینەوە كە بۆ نموونە بەندیخانە سەرەتاییەكان چون پێكهاتن — بابەتێك كە پێشتر ئاماژەمان پێكردووە.

### پرسیارە تیورییەكان

پرسیارە راستەقینەكان — یان ئەو پرسیارانەی كە بە زۆری كۆمەڵناسەكان پێیان باشە پێی بڵێین پرسیاری ئەزموونی — پەیوەندییان بە چۆنیەتی سەرهەڵدانی دیاردەكانەوە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا كۆمەڵناسی تەنیا هەموو راستییەكان لە خۆدا كۆ ناكاتەوە، ئەگەرچی زۆریش گرنگ بن. هەروەها ئێمە دەمانەوێ بزانین هۆی سەرهەڵدانی راستییەكان چیە، و بۆ ئەم كارە پێویستە فێر بین كە چۆن پرسیاری تیۆری بێنینە گۆڕێ، تا بتوانین لە رێگای تێگەیشتن لەو هۆكارانەی كە دەبنە تەوەری سەرەكی هەر توێژینەوەیەكی تایبەت، راستییەكان بە شێوەیەكی راستودروست روون بكەینەوە. دەزانین كە پیشەیی بوون كاریگەرییەكی بەرچاوی لەسەر پێكهاتەی كۆمەڵگاكانی ئێستا داناوە. بەڵام ئەم پیشەییبوونە لە چ هەلومەرجێكدا سەری هەڵداوە و سەرچاوەكانی كامەن؟ بۆچی هەركام لەو كۆمەڵگایانە بە پرۆسەیەكی جیاوازدا گەیشتوونەتە پیشەییبوون؟ بۆچی پیشەییبوون هاوكات بووە لەگەڵ گۆڕان لە شێوەكانی سزادانی تاوانباران یان سیستمی بنەماڵەو هاوسەرێتیدا؟ بۆ وەڵامدانەوە بەم پرسیارانە دەبێ پانتایی بیرو زەینمان فراوان بكەین. تیۆر چەندین جۆر لێكدانەوەی جیاواز دروست دەكا كە دەتوانن بۆ دەربڕینی رەوشە ئەزموونییەكان بەكار بهێنرێن. بۆ نموونە تیۆرێك دەربارەی پێشەییبوون هەوڵدەدا تا تایبەتمەندییە سەرەكییە هاوبەشەكانی نێو پرۆسەكانی گەشەكردنی پیشەییبوون دیاری بكا و تێدەكوشێ ئەوە نیشان بدا كە لە روونكردنەوەی

گۆڕانێکی لەو چەشنەدا کام یەك لە تایبەتمەندییەکان بایەخێکی زیاتریان هەیە. روون و ئاشکرایە کە هیچکات ناتوانین بە تەواوی پرسیارە راستەقینەو تیۆرییەکان لێك جیا بکەینەوە. ئێمە تەنیا کاتێك دەتوانین تیۆرێکی گرینگ بێنینە ئاراوە کە بە ڕێگای خوێندنەوەیەکی ئەزموونیانەدا تاقی بکەینەوە.

ئێمە پێویستمان بە تیۆرییەکان هەیە تا لە تێگەیشتنی راستییەکاندا یارمەتیمان بدەن. بە پێچەوانەی وتەی خەڵکەوە راستییەکان خۆیان نادوێن. بەشێکی زۆری کۆمەڵناسەکان لە بنەڕەتدا ئیش لە سەر مەسەلە ئەزموونییەکان دەکەن، بەڵام لەوەناچێ کارەکەیان کارێکی روشنگەرانە بێت، مەگەر ئەوەی کە پشتیوانییەکی تیۆری بێت بۆ لێکولینەوەکانیان. ئەم مەسەلە تەنانەت لە سەر ئەو توێژینەوانەش وەڕاست دەگەڕێ کە بە ئامانجێکی پراکتیکی تەواوەوە جێبەجێ دەبن.

بە گشتی پراگماتیستەکان بە شێوەیەکی رەشبینانە چاو لە تیۆردانەران دەکەن، و لەوانەیە پێیان خۆش بێت کە خۆیان لەوە بە کاراتر بزانن کە پێویستیان بە ئەندێشە ئەبستراکەکان هەبێ، بەڵام تێکڕای بڕیارە عەمەلییەکان لەسەر هەندێ گریمانەی تیۆری دامەزراون. بۆ نموونە ئەو کەسەی کە خەریکی کارو کاسپیە رەنگە بایەخێکی ئەوتۆ بە تیۆر نەدا، لە گەڵ ئەوانەشدا هەڵگرتنی هەر هەنگاوێك بەرەو چالاکی بازرگانی پێویستی بە گریمانە تیۆرییەکان هەیە، تەنانەت ئەگەر ئەم گریمانانە زۆر جاریش دەرنەبڕدرێن. بەم جۆرە ئەو کەسە لەوانەیە وابزانێ کە مووچەخۆرەکان زیاتر لە هەر شتێك ئاستی حەقدەستەکەیان هانیان دەدا بۆ کارکردن. ئەمە نەتەنیا روونکردنەوەیەکی تیۆریانەی کرداری ئینسانییە — بەڵکوو وەك توێژینەوە کۆمەڵناسییە پیشەییەکان دەری دەخەن — روونکردنەوەیەکی ناراستیشە.

## ئاکامە خوازرا و نەخوزازراوەکانی کرداری ئینسانی

کۆمەڵناسی لە نێوان مەبەستە عەمەلییەکانی ئێمە — واتە ئەوەی مەبەستمانە بیکەین —و ئەو ئاکامە نەخوازراوانەی کە لە ئەنجامی کردارەکانی ئێمەوە بەدی دێن، جیاوازیەکی گرینگ دادەنێ. لەوانەیە ئەو مەبەستانەی لە پێناویاندا تێدەکۆشین لەگەڵ ئەو ئاکامانەی کە بەدی دێن، جیاوازییەکی زۆریان پێکەوە بێ. لەم ڕێگەوە ئێمە دەتوانین زانیارییەکی زۆر لە سەر کۆمەڵگاکەمان بەدەست بێنین. بۆ نموونە قوتابخانەکان بەو مەبەستە دادەمەزرێن کە منداڵان فێری خوێندن و نووسین بکەن و ڕێگەیان بۆ خۆش بکەن تا زانیاری نوێ بە دەست بێنن. لە گەڵ ئەمانەشدا بوونی قوتابخانەکان هەندێ دەرەنجامیان لێدەکەوێتەوە کە ئەوەندە دیارو جێی مەبەست نین. قوتابخانەکان دەبنە هۆی ئەوە کە منداڵان تا تەمەنێکی دیاریکراو لە بازاڕی کار دوور بن. هەروەها لە بەر ئەوەی کە سیستمی خوێندن بە پێی رادەی خوێندەوارییان منداڵان بەرەو مەیدانی کاری جیاواز دەبا، هەوڵدەدا نایەکسانییەکان بەهێز بکا.

لەوانەیە زۆربەی گۆڕانکارییە مێژوییەکان نەخوازراو بن. بەر لە شوڕشی 1917ی روسیا گرووپە سیاسییە جیاوازەکان هەوڵیان دەدا ڕێژیمی ئەو کات بڕوخێنن. بەڵام هیچکامیان — و یەك لەوان حیزبی بلشڤیك کە سەرەنجام گەیشتە دەسەڵات — پرۆسەی شوڕشیان، کە بە کردەوە هاتە کایەوە، پێشبینی نەکردبوو. کۆمەڵە کێشەو تێکهەڵچوونێك بوونە هۆی هاتنە کایەی پرۆسەیەکی گۆڕانکاری

کۆمەڵایەتی وەها کە لەوە قووڵتر بوون کە هەرکەسێك لە سەرەتادا دەیویست پێکی بێنێ ( *SKOCPOL,1969)*

جاری وایە کردارێك کە بۆ مەبەستێکی تایبەتی ئەنجام دەدرێ، لە کردەوەدا ئاکامێکیتری لێدەکەێتەوە کە دەبێتە لەمپەر لە بەردەم گەیشتن بە ئامانجەکەدا. چەند ساڵ لەمەوپێش لە شاری نیویورکدا چەند یاسایەك پەسند کران کە خاوەنی باڵەخانە کاولەکانی ناچارکرد تا بیناکانیان بگەیەننە ئاستی ستاندارد. مەبەست ئەوە بوو کە بارودوخی نیشتەجێ بوونی توێژە کەم داهاتەکان باشتر بکرێ. بەڵام ئاکامەکان بە ئاقارێکیتردا کەوتنەوە. خاوەن باڵەخانە کاولەکان بە جارێ وازیان لە باڵەخانەکانی خویان هێنا، یان بۆ مەبەستێکیتر کەڵکیان لێوەرگرت. بە شێوەیەك کە کێشەی دابینکردنی شوێنی گونجاو بۆ نیشتەجێبوون لە جاران زیاتر بوو *(SIEBER,1981,P.64)*. دەتوانین بە گەڕانەوە بۆ سەر مەسەلەی بەندیخانەو ئاسایشگەکان ، نموونەیەکی باشتر بۆ بەراوردکردن بدۆزینەوە. لە ماوەی چەند ساڵی رابردوودا لە بەریتانیاو چەند وڵاتێکی دیکەی روژئاواییدا پرۆسەی دابڕینی تاوانباران لە کۆمەڵگە تا رادەیەك ئاوەژوو بۆتەوە. لە پێناو هەوڵدان بۆ پێکهێنانی "چاودێری کۆمەڵایەتی" بە سەر تاوانباران‌و نەخۆشە دەروونییەکاندا، هەندێ کەس لە بەندیخانەو نەخۆشخانەکان ئازاد کران تا لە دونیای ئازاددا بژین. بەڵام ریفورمیستە لیبراڵەکان کە پشتی ئەم نوێگەرییەیان دەگرت بە هۆی ئاکامەکانی ئەو کارەوە تا رادەیەك ناهومێد بوون. بە شێکی بەرچاوی نەخۆشە دەرونییەکانی پێشوو تووشی هەژارییەکی لە رادەبەدەربوون و نەیانتوانی لەو دونیا ئازادەدا بژین. ئەم ئاکامانە بۆ ئەوان گەلێك کارەساتاوی بوو.

ئێمە دەبێ بە پێی تێکەڵکردنی ئاکامە خوازراوو نەخوازراوەکان هەم لە بەردەوامبوون‌و هەم لە گۆڕانی ژیانی کۆمەڵایەتی کەسەکان تێبگەین. ئەرکی کۆمەڵناسی ئەوەیە کە هاوکێشەی نێوان وەبەرهێنانەوەی کۆمەڵایەتی‌و گۆڕانکاری تاوتوێ بکا. وەبەرهێنانەوە باس لەوە دەکا کە کۆمەڵگاکان چۆن بە درێژایی زەمەن بەردەوام دەبن‌و گۆڕانکاریش ئاماژە بەو گۆڕانانە دەکا کە لەو کۆمەڵگایانەدا پێك دێن. کۆمەڵگە ئامێرێکی کۆمەڵایەتی وەك کاتژمێر یان ماشێن نیە کە بە هۆی داینامۆکانەوە بەردەوام دەبێت. وەبەرهێنانەوەی کۆمەڵایەتی لەبەر ئەوە دێتە کایەوە کە لەو شتەدا کە خەڵك رۆژبە رۆژو ساڵ بە ساڵ ئەنجامی دەدەن‌و لە شێوەکانی کردەوەی کۆمەڵایەتیدا بەردەوامی هەیە. گوڕانکارییەکان تا رادەیەك لەبەر ئەوە روو دەدەن کە خەڵك بە ئەنقەست خوازیاری وەدی هاتنیان‌و تا رادەیەك – هەروەك لە نموونەی شۆڕشی روسیادا دەردەکەوێ – لە بەر ئەو ئاکامانە روودەدەن کە کەس پێشبینیان ناکا، یان حەزناکەن بێنەدی.

### کۆمەڵناسی دەربارەی کردارەکانمان چیمان پێ دەڵێ؟

ئێمە هەمووومان، وەك ئەندامانی کۆمەڵگە، زۆر شت دەربارەی خۆمان‌و ئەو کۆمەڵگەیە دەزانین کە تێیدا دەژین. ئێمە بە گشتی پێمان وایە کە بە باشی لە هۆی کردەوەکانی خۆمان تێدەگەین، بە بێ ئەوەی پێویستمان بەوە بێ کە کۆمەڵناسەکان ئەو هۆیانەمان پێ بڵێن‌و ئەمەش تا رادەیەك راستە. بەشێکی زۆری ئەو کارانەی کە رۆژانە ئەنجامیان

دەدەین، لەبەر ئەوەیە کە لە پەیمانە کۆمەڵایەتییەکان تێدەگەین. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تێگەیشتنە خۆبەخۆییە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی هەیە و یەکێك لە ئەرکەکانی کۆمەڵناسی دەستنیشانکرنی ئەو چوارچێوەیە.

بە پێی ئەو باسانەی کە تا ئێستا کردوومانە دەتوانین مەغزای ئەم چوارچێوەیە روون بکەینەوە. هەروەك پێشتر دیتمان خەڵك بە شێوەیەکی هەڕەمەکیانە حوکم لە سەر خۆیان و لە سەریەکتر دەردەکەن کە دواتر دەرئەکەوێ ئەو حوکمانە هەڵەن یان ناتەواون، یان لە نائاگاییەوە دراون. توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکانیش یارمەتیمان دەدەن کە چوارچێوەی دادوەرییەکانی خۆمان بناسین و هەر لەو کاتەشدا ئەو توێژینەوانە دەبنە هۆی ئەوە کە باشتر بتوانین خۆمان و دەوروبەرمان بناسین. یەکێکی تر لەو یارمەتییە بنەڕەتیانە کە کۆمەڵناسی بە ئێمەی دەکا، نیشاندانی ئەو مەسەلەیە کە ئەگەرچی ئێمە لە بەشێکی زۆری ئەو کارانە ئاگادارین کە ئەنجامیان دەدەین و لە هۆیەکانی ئەنجامدانیان تێدەگەین، بە زۆری شتێکی ئەوتۆ لە سەر دەرەنجامی کردەوەکانی خۆمان نازانین. ئاکامە نەخوازراو و پێشبینی نەکراوەکان تەواوی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیمان دەخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. شرۆڤە کردنی کۆمەڵناسانە لەو پەیوەندییە وردو دەقیقانە دەکوڵێتەوە کە لە نێو تایبەتمەندییە بە هەڵکەوت *(INTENTIONAL)* و بە ئەنقەستەکانی *(UNINTENIONAL)* دونیای کۆمەڵایەتیدا هەیە.

## پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئاکاری مرۆڤ

چەمکێکی گرینگ کە یارمەتیمان دەدا تا لەو پەیوەندییانە تێبگەین، چەمکی پێکهاتەی کۆمەڵایەتییە. ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییانە کە ئێمە تییاندا دەژین تەنیا بریتی نین لە کۆمەڵێك کردارو رووداوی کتوپڕ. خەڵك لە هەڵس وکەوت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیاندا هەندێ رێوشوێنی بنەڕەتی و مودێلی دانراو *(POTTERINING)* پەیڕەو دەکەن. چەمکی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئاماژە بەم رێ و شوێنانە دەکا. تا رادەیەك سوودبەخشە ئەگەر تایبەتمەندییە پێکهاتەییەکانی کۆمەڵگاکان وەك قەبارەی بینایەك وێنا بکەین. بینایەك دیوار و عەرزو سەقفی هەیە، کە پێکەوە رواڵەت یان فورمێکی تایبەتی پێدەبەخشن. بەڵام ئەگەر ئەم خوازەیە زۆر بە وردی بەکار ببرێ دەتوانێ تووشی سەرلێشێوانێکی زۆرمان بکا. سیستمە کۆمەڵایەتییەکان لە رەفتارو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان پێك هاتوون: ئەوەی کە لەوپەیوەندییانەدا دەبێتە مۆدێلی پەیڕەو کراو دووپاتبوونەوەی ئەو رەفتارو پەیوەندییانەیە لە قۆناغ و شوێنی جیاوازدا. بەم شێوەیە چەمکەکانی بەرهەمهێنانەوەی کۆمەڵایەتی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لە شرۆڤەکردنی کۆمەڵناسانەدا پەیوەندییەکی زۆر نزیکیان پێکەوە هەیە. پێویستە ئێمە کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان وەك ئەو بینایانە وێنا بکەین کە هەربەو خشتانە نوێ دەبنەوە کە لێیان دروست بوون. کردەوەکانی ئێمە لە ژێر کارتێکەری تایبەتمەندییە پێکهاتەییەکانی ئەو کۆمەڵگایەدان کە شوێنی گەورە بوون و ژیانی ئێمەیە، هەر لە هەمان کاتدا ئێمە لە کردەوەکانی خۆماندا هەمان ئەو تایبەتمەندییانە دەخولقێنینەوە ( تا رادەیەکیش دەیانگوڕین).

## فراوانکردنی هزری کۆمەڵناسانە

فێربوونی بیرکردنەوەی کۆمەڵناسانە، مانای پەروەردەکردنی تواناکانی خەیاڵە. خوێندنەوەی کۆمەڵناسی ناتوانێ تەنیا پرۆسەیەکی ئاسایی وەرگرتنی زانیاری بێت. کۆمەڵناس بەو کەسە دەڵێن کە نەکەوێتە ژێر کاریگەری راستەوخۆی مەسەلە شەخسییەکانەوە. کاری کۆمەڵناسانە پەیوەندی بەو شتەوە هەیە کە سی. رایت میلز لە دەستەواژەیەکی بەناوبانگدا ناوی نا ، *خەیاڵی کۆمەڵناسانە* (*MILS,1970*). لە راستیدا زۆربەی کتێبە وانەییەکانی کۆمەڵناسی سەرنجی خوێنەر بەرەو لای ئەو زاراوەیە رادەکێشن. بەڵام بە پێچەوانەی خودی میلزەوە– بە گشتی ئەو دەستەواژەیە بەبێبوونی توانای خەیاڵ بەکاردەبەن.

بۆ بیرکردنەوەیەکی کۆمەڵناسانە بە تایبەت پێویستە ئەندێشەمان لە رووداوەکانی ژیانی رۆژانە دوور بخەینەوە تا بتوانین لە روانگەیەکی نوێوە لێیان بڕوانین. قاوەخواردنەوەیەکی ئاسایی لەبەرچاو بگرن. لەروانگەی کۆمەڵناسییەوە دەربارەی کردارێکی بەرواڵەت سەرەتایی لەو چەشنە دەتوانین چی بڵێین؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: زۆرشت.

سەرەتا دەتوانین بڵێین کە قاوە تەنیا خواردنەوەیەک نیە کە یارمەتیی دەدا تا ئاوی پێویست لە جەستەی مرۆڤدا کەم نەکا. بەڵکوو وەك بەشێك لە هێماکانی رۆژانەی ژیانی کۆمەڵایەتی بەهایەکی رواڵەتی هەیە. بە زۆری نمایشکردنی ئەو هێمایانە لە کاتی خواردنەوەی قاوەدا زۆر لە خودی خواردنەوەی قاوەکە گرنگترە. بۆ نموونە دوو کەس کە کات دادەنێن پێکەوە قاوە بخونەوە، رەنگە زیاتر قسەکردنەکەیان لا مەبەست بێت تا ئەو شتەی دەیخونەوە. کاتەکانی خواردن و خواردنەوە لە هەموو کۆمەڵگاکاندا هەلێکن بۆ پێکهێنانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بەجێگەیاندنی داب‌ونەریتەکان — و ئەم هەلانە بابەتێکی دەوڵەمەند دەخەنە روو بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسی.

دووهەم، قاوە مادەیەکی سڕکەرە، کافئینی تێدایەو کار دەکاتە سەر مێشك. لە کەلتووری رۆژئاوایدا زۆربەی خەڵك بەو کەسانە کە خوویان بە قاوە گرتووە ناڵێن موعتاد. ئەوەی کە بۆ دەبێ وابێ بۆ خۆی پرسیارێکی کۆمەڵناسی سەرنجڕاکێشە. قاوە وەك ئەلکول (الکحل) مادەیەکی سڕکەرەو لە روانگەی کۆمەڵایەتییەوە قبووڵ کراوە. لە کاتێکدا بۆ وێنە "ماری جوانا" بەوجۆرە نیە. بەو حاڵەش لە هەندێ کەلتووردا ماری جوانا شتێکی ئاساییە بەڵام خواردنەوەی قاوەو ئەلکولیان بە لاوە پەسند نیە (بۆ باسکردنی زیاتر لە بارەی ئەم مەسەلانەوە چاو لە پاژی پێنجەم، هاوهەنگاوی ولادان بکەن).

سێهەم، کەسێك کە خەریکە نمە نمە پیاڵەیەك قاوە دەخواتەوە، بەشێکە لە تورێکی ئیجگار ئاڵۆز لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان کە لە سەرانسەری جیهاندا بەربڵاوە. بەرهەمهێنان، گواستنەوەو دابەشکردنی قاوە پێویستی بە پێکەوە مامەڵە کردنی خەڵکێکی زۆرە کە هەزاران مایل لەو کەسەوە دوورن کە قاوەکە دەخواتەوە. خوێندنەوەی ئەم جۆرە ئاڵوێرە جیهانیانە یەکێك لە ئەرکە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵناسی پێك دێنێ، چونکە ئەمڕۆ ژیانی ئێمە لە زۆر رووەوە لە ژێر کارتێکەری پەیوەندی و مامەڵە بازرگانییە جیهانییەکاندایە.

سەرەنجام، خواردنەوەی نمە نمەی پیاڵەیەك قاوە گریمانەی پرۆسەیەکی کامڵی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری لە رابردوودا لای ئێمە دروست دەکا. لە گەڵ زۆر شتی دیکەی –– وەك چای، مۆز، پەتاتەو شەکری سپی – کە لە رۆژئاوادا بۆ رژیمگرتن بەکاردەهێنرێن، قاوەخواردنەوە تەنیا

له سەدەی نۆزدەهەمدا بووە بە باو. ئەگەرچی قاوەخواردنەوە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە دەستی پێکردووە، بەڵام نزیکەی سەدەو نیوێك لەوە پێش لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمی رۆژئاواییەوە بە شێوەیەکی بەربڵاو پەرەی گرت. لە راستیدا هەموو ئەو قاوانەی کە ئێمە ئەمڕۆ لە وڵاتە رۆژئاواییەکاندا دەیخوێنەوە لەو ناوچانەوە دێن کە بە هۆی رۆژئاواییەکانەوە داگیرکران (واتە وڵاتانی ئەمریکای باشوورو ئەفریقا).

پەروەردەکردنی خەیاڵی کۆمەڵناسانە بە مانای کەڵك وەرگرتن لە بابەتەکانی ئەنترۆپۆلۆجی (خوێندنەوەی کۆمەڵگا نەریتییەکان)و مێژوو و هەروەها خودی کۆمەڵناسییە. لایەنی ئەنترۆپۆلۆجی لە خەیاڵی کۆمەڵناسانەدا زۆر گرنگە چونکە یارمەتیمان دەدا تا لە شێوە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی تێبگەین. بە بەراوردکردنی ئەو شێوازانە لەگەڵ شێوەی ژیانی خۆماندا زیاتر دەتوانین جیاوازی مۆدێلە کردارییەکانی تایبەت بە خۆمان بناسین. لایەنی مێژوویی خەیاڵی کۆمەڵناسانە هەر بە هەمان رادە گرنگە: ئێمە تەنیا کاتێك دەتوانین لە مەغزای جیاوازی جیهانی ئەمڕۆ تێبگەین کە بتوانین لەگەڵ رابردوودا بەراوردی بکەین. رابردوو ئاوێنەیەکە کە دەبێ کۆمەڵناس بۆناسینی ئەمڕۆ لە دەستیدا بێت. بۆ ئەوەی بتوانین بە شێوەیەکی قووڵتر ئەو ئەرکانە بناسین پێویستە لە چوارچێوەی داب‌ونەریتی خۆماندا بیر نەکەینەوە.

هێشتا لایەنێکی دیکەی خەیاڵی کۆمەڵناسانە ماوە --- ئەو لایەنەی کە لە راستیدا میلز زیاتر لە هەموو کەس جەختی لە سەر کردوەتەوە. ئەم لایەنە پەیوەندی بە تواناکانی ئێمە بۆ داهاتوو هەیە. کۆمەڵناسی سەرەڕای ئەوەی کە یارمەتیمان دەدا تا مۆدێلەکانی ئێستای ژیانی کۆمەڵایەتی شرۆڤە بکەین، بەڵکوو توانایی ئەوەمان پێدەدا تا دوورە دیمەنی داهاتوومان ببینین. توێژینەوەی داهێنەرانە لە بواری کۆمەڵناسیدا نەتەنیا دەتوانێ رەوشی ئێستامان پێ نیشان بدا، بەڵکوو ئەگەر بمانەوێ دەتوانێ پێمان بڵێ کە رەوشەکە چی لێدێت. ئەگەر هەوڵەکانی ئێمە بۆ کاریگەری دانان لە سەر گۆڕانکارییەکانی داهاتوو پشت بە تێگەیشتنی کۆمەڵناسانە لە سەر رەوتە هەنووکەییەکان نەبەستێت، هیچ ئاکامێکی بە دواوە نابێ‌و بە فیڕۆ دەچێ.

### ئاخو کۆمەڵناسی زانستە؟

کۆمەڵناسی لە نێو زانستەکانی وەك (ئەنترۆپۆلۆجی، ئابووری، و زانستە سیاسییەکاندا) کە بە زۆری پێیان دەڵێن زانستە کۆمەڵایەتییەکان، پلەی یەکەمی هەیە. بەڵام ئاخۆ بەراستی ئێمە دەتوانین ژیانی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی زانستیانە بخوێنینەوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، سەرەتا دەبێ هەموو تایبەتمەندییە بنچینەییەکانی زانست وەك شێوەیەك لە هەوڵی بیرمەندانە بناسین. زانست چیە؟

زانستی بەکارهێنانی مێتودە سیستماتییەکانی توێژینەوە، هزری تیوری، و هەڵسەنگاندنی لوژیکیانەی بەڵگەکان بۆ پەرەپێدانی کۆمەڵێك زانیاری دەربارەی بابەتێکی تایبەتە. کاری زانستی بەستراوەتەوە بە بیرکردنەوەیەکی داهێنەرانەو جەسوورانەو رێکخستنی وردی بەڵگەو هۆکار(هۆ)یەکان بۆ پشتگرتن یان رەتکردنەوەی گریمانەو تیۆرییەکانەوە. ئەو بینایی‌و زانیارییانەی کە لە رێگای خوێندنەوە و باسی زانستییەوە کەڵەکە دەبن، هەمیشە حاڵەتێکی تاقیکارانەی

تێدایە -- رەنگە لە ژێر روشنایی بەڵگەکان یان هۆکارەکاندا پێداچوونەوەی بەسەردا بکرێ، یان بە تەواوەتی رەت بکرێتەوە.

کاتێك کە دەپرسین ئاخۆ کۆمەڵناسی زانستە؟ مەبەستمان دوو شتە، ئاخۆ ئەم بەشە دەتوانێ بە تەواوەتی لەسەر بنەمای میتۆدەکانی زانستە سروشتییەکان دابڕێژێ؟ و ئایا دەکرێ هیوادار بین کە کۆمەڵناسی دەستی بەو زانیارییە وردو سەلمێنراوانە رابگا کە زانایانی ناتورالیست لە هەمبەر جیهانی فیزیایی دەستیان پێڕاگەیشتووە، ئەم مەسەلانە بەردەوام تا رادەیەك کێشەیان لەسەر بووە، بەڵام لە قۆناغێکی دوورو درێژدا زۆربەی کۆمەڵناسەکان وەڵامێکی پوزەتیڤیان پێدەدایەوە. ئەوان بڕوایان وابوو کە کۆمەڵناسی دەتوانێ و دەبێ هەم لە رووی شێوازو هەم لە رووی خەسڵەتەوە، دۆزینەوەکانی هاوشێوەی زانستە سروشتییەکان بێ (ئەم روانگەیە سەردەمێك بە ناوی پۆزیتیڤیزم دەناسرا).

ئێستا ئەم روانگەیە کرچ و کاڵ دێتە بەرچاو . وەك باقی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، کۆمەڵناسی ژانرێکی زانستییە بەو مانایە کە میتودی توێژینەوە سیستماتییەکان لەخۆ دەگرێ ، داتاکان شرۆڤە دەکا و لە ژێر رۆشنایی بەڵگەو هۆکارە لۆژیکیەکاندا، تیۆرییەکان هەڵدەسەنگێنێ. بەڵام لە جیهانی فیزیادا توێژینەوە ئینسانییەکان و بینینی دیاردەکان دوو شتی جیاوازن، نە چوارچێوەیەکی لۆژیکی و نە ئاکامەکانی تویژینەوە کۆمەڵناسییەکان هیچکام تەنیا بە پێی بەراورد کردن لەگەڵ زانستە سروشتییەکاندا وەك پێویست نابنە هۆی لێ تێگەیشتن. لە توێژینەوەی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ئێمە بەرەو رووی هەندێ چالاکی دەبینەوە کە لە لای ئەو خەڵکەی بەو چالاکییانەوە خەریکن، مانای خۆیان هەیە. بە پێچەوانەی شتەکانی نێو سروشت ، مرۆڤ بوونەوەرێکی خودوشیارە کە مانا بە کارو کردەوەکانی خۆی دەبەخشێ. ئێمە تەنانەت ناتوانین ژیانی کۆمەڵایەتیمان بە تەواوی وەسف بکەین، مەگەر ئەوەی کە پێش هەموو شتێك لەو واتایانە تێبگەین کە خەڵك کردەوەکانی خۆیانی پێ پێناسە دەکەن. بۆ نموونە، حاڵەتێکی وەك "خۆکوشتن" ئەو کاتە وەسف دەکرێ کە ئێمە لەوە تێبگەین کە ئەو کەسەی خۆی کوشتووە، لەو کاتەدا بیری لەچی کردووەتەوە. خۆکوژی کاتێك روودەدا کە ئەو کەسە بەجدی بیەوێ خۆی لەنێوببا. ناکرێ بەو کەسەی کتوپڕ دەکەوێتە بەرماشێن، بڵێین خۆی کوشتووە، ئەم مردنە بەویستی خودی ئەو کەسە نەبووە.

ئەو راستییەی کە ئێمە ناتوانین وەك شتەکانی نێو سروشت لە ئینسانەکان بکوڵینەوە، لە هەندێ رووەوە بە ئیمتیازێك بۆ کۆمەڵناسی دەژمێردرێ، و لە لایەنەکانی ترەوە کۆمەڵێك کێشە دروست دەکا کە زانایانی ناتورالیست بەرەورووی نابنەوە. توێژەرەوە کۆمەڵناسەکان لە بەر ئەوەی کە دەتوانن راستەوخۆ هەندێ پرسیار بخەنە بەردەم هەندێ کەسی دیکە – ئینسانەکانی دیکە – سوودمەند دەبن. لە لایەکی ترەوە، ئەو خەڵکەی کە دەزانن کارو کردەوەکانیان لە ژێر چاودێریدایە، زۆرجار وەك حاڵەتی ئاسایی ناجووڵێنەوە. بۆ نموونە کاتێك ئەو کەسانە وەڵامی پرسیارەکان دەدەنەوە، رەنگە بە ئەنقەست یان بێ مەبەست بە جۆرێ باسی خۆیان بکەن کە لەگەڵ روانگەکانی پێشوویاندا نەگونجێت. ئەوانە تەنانەت پێدەچێ وەڵامی پرسیارەکان بە جۆرێ بدەنەوە کە توێژەرەوەکە پێویستیەتی، تا بتوانن یارمەتی بدەن.

## بابەتی بوون (ئوبژەکتیڤ)

کۆمەڵناسەکان هەوڵ دەدەن لە توێژینەوەو بیرو ئەندێشەکانیاندا سەربەخۆبن و بە شێوەیەکی ئازاد ئەندێشانە لە ژیانی کۆمەڵایەتی بکۆڵنەوە. خودی کۆمەڵناس هەوڵ دەدا ئەو دەمارگرژییانە وەلا بنێ کە ڕێ لە هەڵسەنگاندنێکی ڕاست و دروستی ئەندێشەو دیکومێنت و شایەتیەکان دەگرن. بەڵام کەس لە هەموو مەسەلەکاندا بیرکردنەوەیەکی سەربەستی نیەو هەرکەس تا ڕادەیەك دەتوانێ لە بنیادنانی ڕوانگەیەکی ئازاددا سەرکەوتوو بێ. لەگەڵ ئەوەشدا بابەتیبوون بە شێوەیەکی بنەڕەتی لەگەڵ بیروهزری توێژەرەکاندا گرێ ناخوا،و پەیوەندی بە میتودەکانی بینین و بەڵگاندنەوە هەیە. لێرەدا خەسڵەتی گشتی ئەم بەشە گەلێك گرنگە. لەبەر ئەوەی کە ئاکام و ڕاپۆرتی توێژینەوەکان لەبەردەستدان – لە وتارو کتێبەکاندا دەنووسرێن– خەڵکی دی دەتوانن دەرەنجامەکان تاوتوێ بکەن. ئەو ئیدعایانەی کە پشت بە ئاکامی توێژینەوەکان دەبەستن، دەکرێ لەلایەن خەڵکی ترەوە ڕەخنەی لێ بگیرێ و حەزە شەخسییەکان پشت گوێ بخرێن.

بەم شێوەیە ئەندامانی گرووپی کۆمەڵناسی لە ڕێگای کاریگەرییەکانی ڕەخنەی دوولایەنەوە تا ڕادەیەك دەتوانن چەمکی بابەتیبوون بەرجەستە بکەن. بەشێکی زۆری ئەو بابەتانەی کە لە کۆمەڵناسیدا توێژینەوەیان لەسەر دەکرێ، ناکۆکییان لەسەرە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە شەڕوکێشەی نێو خودی کۆمەڵگەوە هەیە. بەڵام دەکرێ لە ڕێگای باسێکی گشتی، تاوتوێ کردنی بەڵگەنامەو شایەتی شایەتحاڵەکان و بەڵگەنواندنی لۆژیکیانەوە ئەم جۆرە بابەتانە بەشێوەیەکی سوودمەندو کاریگەرانە شرۆڤە بکرێن *(Habermas,1979)*.

## بایەخی بەکردەوەی کۆمەڵناسی

### تێگەیشتن لە بارودوخە کومەڵایەتییەکان

کۆمەڵناسی کارێکی زۆر دەکاتە سەر ژیانی ئێمە. بیرکردنەوەو توێژینەوەی کۆمەڵناسانە بە شێوەیەکی ئاشکرا لە چەندین ڕێگاوە یارمەتی بە دانانی سیاسەتێکی بەکردەوەو ڕێفورمی کۆمەڵایەتی دەکەن. ئاسانترین ڕێگا ئەوەیە کە بە شێوەیەکی ڕاشکاوانەترو گونجاوتر لە ڕابردوو لە بارودوخە کۆمەڵایەتییەکان تێبگەین. بۆ ئەمەش یان دەکرێ بە شێوەیەکی واقیعیانە لە گەڵ بارودوخەکەدا مامەڵە بکەین، یان ئەوەی کە باشتر لە هۆکاری ڕووداوێك تێبگەین (بە واتایەکیتر لە ڕێگای تێگەیشتنی تیۆرییەوە). بۆ نموونە ڕەنگە توێژینەوەکە ئەوە نیشان بدا کە ڕێژەی حەشیمەتی ڕەش و ڕووت زۆر لەوە زیاترە کە ئێمە بۆی دەچوین. هەر چەشنە هەوڵێك لە پێناو چاککردنی لانی کەمی ئاستی ژیانی گشتی خەڵکدا، ئەگەر پشت بە زانیاری وردو دەقیق ببەستێ، بێگومان شانسی سەرکەوتنی زیاترە. لەگەڵ ئەوەشدا چەندە زیاتر بتوانین هۆکارەکانی پەرەگرتنی هەژاری بناسین، ئەگەری زیاتر لە ئارادایە بۆ ئەوەی کە باشتر بتوانین بە گژیدا بچینەوە.

### ناسینی جیاوازییە کەلتووریەکان

دووهەمین ڕێگای یارمەتیدانی کۆمەڵناسی بۆ دانانی سیاسەتێکی بە کردەوە ئەوەیە کە یارمەتی بە بردنە سەری ئاستی وشیاری کولتووری لە نێو چین وتوێژە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا بکا. توێژینەوەی کۆمەڵناسانە ڕێگایەك بۆ بینینی

جیهانی کۆمەڵایەتی لە روانگە جۆراوجۆرەکانەوە فەراهەم دەکاو بەم جۆرە یارمەتی بە وەلانانی ئەو دەمارگرژییانە دەدا کە تاقمو گرووپە جۆراوجۆرەکان لە هەمبەر یەکتردا هەیانە. کەسێك کە زانیارییەکی تەواوی لەسەر بەها کولتوورییە جۆراوجۆرەکان نەبێ، ناتوانێ سیاسەتدانەرێکی رۆشنبین بێ. ئەو سیاسەتە بە کردەوانەی کە لە سەر بنەمای زانیارییەکی ورد لەسەر شێوەی ژیانی ئەو کەسانە کە دەکەونە ژێر کاریگەرییانەوە رانەوەستێ، ناتوانێ سەرکەوتنێکی ئەوتۆ بە دەست بێنێ. هەر بۆیە ئەو فریاگوزارە کۆمەڵایەتییە سپی پێستە کە لە نێو کۆمەڵگەی پەنابەرانی رۆژئاوای هینددا خەریکی ئیش‌وکارە، بە بێ ئەوەی کە لەو جیاوازییە کولتوورییانە تێبگا کە بەگشتی سپی پێستو رەش پێستەکان لێك جیا دەکاتەوە، ناتوانێ متمانەی ئەو کۆمەڵگەیە بە دەست بێنێ.

### هەڵسەنگاندنی ئاکامەکانی سیاسەتدانان

سێهەم، توێژینەوەی کۆمەڵناسی لە رووی هەڵسەنگاندنی ئاکامەکانی داهێنانی سیاسییەوە چەندین دەرەنجامی بە کردەوەی لێدەکەوێتەوە. پێدەچێ پلانێکی ریفورمیستی بەکردەوە نەتوانێ ئەو مەبەستانە بپێکێ کە لە زەینی دارێژەرەکەیدا هەیە، یان هەندێ ئاکامی تاڵو نەخوازراوی لێ دەکەوێتەوە. بۆ نموونە پاش شەڕی جیهانی دووهەم لە زۆر لە وڵاتاندا باڵەخانەی گەورە بۆ نیشتەجێبوونی هاووڵاتییان دروست کرا. ئەو باڵەخانانە بە مەبەستی دانانی ئەستانداردێکی بەرز بۆ ژیانی خەڵکی کەمداهاتی گەڕەکە هەژارنشینەکاندا نەخشەیان بۆ دارێژرابوو سوپەرمارکێتو باقی خزمەتگوزارییەکانی دیکەشیان بۆ دابین دەکرد. بەڵام لێکۆڵینەوەکان دەریانخست کە بەشێکی زۆری ئەو کەسانە کە لە شوێنی پێشووی خۆیانەوە گواستبویانەوە بۆ ئەم باڵەخانانە هەستیان بە تەنیاییو خەمۆکی دەکرد. زۆربەی ئەو باڵەخانەو سوپەرمارکێتانە هەر خێرا بوونە کەلاوەو بوونە شوێنی سەرهەڵدانی دزیو پیاوکوژیو ئەنجامدانی تاوان.

### چوونە سەری توانای خۆناسین

چوارەم، لە هەندێ لایەنەوە، و لە هەموان گرنگتر کۆمەڵناسی دەتوانێ ببێتە هۆی ئەوەی کە ئاستی رۆشنبیری گرووپە جۆراوجۆرەکان گەشە بکاو باشتر بتوانن خۆیان بناسن. هەتا خەڵك زیاتر لەسەر کردەوەکانی خۆیانو کارکردە گشتییەکانی کۆمەڵگەی خۆیان بزانن، رەنگە زیاتر بتوانن لە ژیانی خۆیاندا گۆڕان پێك بێنن. نابێ ئێمە پێمان وابێ کە دەوری بە کردەوەی کۆمەڵناسی تەنیا ئەوەیەکە یارمەتی سیاسەتمەدارەکان– گرووپە خاوەن دەسەڵاتەکان– بکا بۆ ئەوەی بڕیاری ئاگاهانە بدەن. ناکرێ پێمان وابێ کە دەسەڵاتدارەکان هەمیشە لە سیاسەتەکانی خۆیاندا بیر لە قازانجو بەرژەوەندی خەڵکی بێ هێزوچەوساوە دەکەنەوە. گرووپە خۆوشیارکەرەکان (self-enlightened group) دەتوانن بە شێوەیەکی کاریگەرانە وەڵامی ئەو سیاسەتانە بدەنەوە کە لە لایەن بەرپرسانی حکوومەت، یان بەرپرسانی دیکەوە پەیڕەو دەکرێن، و هەروەها لە رووی سیاسییەوە داهێنانی تایبەت بە خۆیان هەبێ. گرووپە خۆیارمەتیدەرەکان (self- help groups) وەك عارەقخۆرە گومناوەکان (Alcoholics Anonymous) و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی وەك (بزووتنەوەی ژنان) نموونەی ئەو گرووپە کومەڵایەتییانەن کە

راستەوخۆ ریفۆرمێکی بە کردەوە دێننە گۆڕێ (بڕواننە پاژی 9: گرووپ و ڕێکخراوەکان).

### دەوری کۆمەڵناس لە کۆمەڵگادا

ئاخۆ دەبێ کۆمەڵناسەکان بە شێوەی چالاکانە پشتی پرۆژە پراکتیکییەکانی ریفۆرم یان گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بگرن،و جۆش وخرۆشی خەڵك بۆ لایەنگری کردن لەم پلانانە هەڵخڕێنن؟ هەندێ کەس باس لەوە دەکەن کە کۆمەڵناسی تەنیا ئەو کاتە دەتوانێ ئوبژەبوونی خۆی بپارێزێ کە کۆمەڵناسەکان لە باس ومناقشە ئەخلاقییەکاندا خۆیان بە تەواوەتی بێلایەن بکەن. بەڵام هیچ پێویست ناکا کە پێمان وابێت ئەو توێژینەوانەی کە خۆ لە مەسەلە بەرباسەکان دەپارێزن لە هەڵسەنگاندنی مەسەلە کۆمەڵناسییەکاندا لەوانی تر بێلایەنترن. بێگومان لە نێوان خوێندنەوەی کۆمەڵناسانەو تەڵقیناتی ویژدانی کۆمەڵایەتیدا پەیوەندییەك هەیە. هیچ پسپۆڕێکی کۆمەڵناسی لەو نابەرابەریانەی کە لە دونیای ئەوڕودا هەن، یان نەبوونی عەدالەتی کۆمەڵایەتی لە بەشێکی بەرچاوی کۆمەڵگاکاندا یان ئەو هەژاری و بێبەشیانەی کە بەملیۆن خەڵك ئازار دەدا، بێ ئاگا نیە. سەیر دەبوو ئەگەر کۆمەڵناسان لە ئاست پرۆژە پراکتیکییەکاندا بێلایەن بوونایە،و ئەگەر پێمان وابێ ئەوان نابێ لەم بوارەدا کەڵك لە پسپۆڕیی و لێزانییەکانیان وەربگرن، ئەوا چاوەڕوانییەکی نامەعقووڵ و نابەجێ دەبێت.

### دوانەنجام

لەم پاژەدا کۆمەڵناسیمان وەك ژانرێك لەبەرچاو گرت بۆ ئەوەی بتوانین روانگە شەخسییەکانی خۆمان لەمەڕ جیهان وەلاوە بنێین،و بە شێوەیەکی وردتر لەو کاریگەریانە بڕوانین کە کار لە ژیانی ئێمەو خەڵکی دی دەکەن. کۆمەڵناسی وەك هەوڵێکی دیاری بیرمەندانە لەگەڵ پەرەسەندنی کۆمەڵگە پێشەییەکاندا هاتەکایەوە،و خوێندنەوەی ئەم چەشنە کۆمەڵگایانە بووە تەوەرەی سەرەکی ئەم ژانرە. جگە لەوە کۆمەڵناسان بایەخ بە لێکوڵینەوە لە سەر گەلێك مەسەلە دەربارەی هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان دەدەن. لە پاژی داهاتوودا باس لە فرە چەشنی کەلتوری مرۆڤایەتیو جیاوازی نێوان داب ونەریتەکان دەکەین. بۆ ئەم کارە پێویستە سەر بە نێو کەلتوورەکانی جیهاندا بکەین. دەبێ سەفەری کریستوف کلومبۆس، کاپتن کووك وکەسانی دیکە سەرلەنوێ لە ئاستێکی بیرمەندانەدا هەڵسەنگێنین. ئەگەرچی وەك کۆمەڵناسێك ناتوانین تەنیا لە روانگەی دۆزەرەوەکانەوە، ئەم سەفەرانە وەك سەفەرێکی دۆزینەوەیی (اکتشافی) چاو لێبکەین، چونکە ئەم سەفەرانە سەرەتایەك بوون بۆ پرۆسەی گەشەکردنی رۆژئاواو کاریگەرییەکی گەورەیان کردە سەر کەلتوورەکانیترو گەشەکردنی کۆمەڵایەتی جیهان.

### پوختەی باسەکە

1- دەکرێ کۆمەڵناسی وەك توێژینەوەیەکی سیستماتیی کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان، بە پێداگرییەکی تایبەت لە سەرسیستمە پیشەییەکانی سەردەم پێناسە بکەین.

2- کۆمەڵناسی هەوڵدانێك بوو بۆ تێگەیشتن لەو گۆڕانکارییە بەرینانەی کە بە درێژایی دوو، سێ سەدەی رابردوو لە کۆمەڵگاکاندا هاتوونەتە گۆڕێ. پیشەیی بوون، شارنشینیو سەرهەڵدانی چەندین

سیستمی سیاسی نوێ بەشێکن لەو تایبەتمەندییە گرنگانەی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆی جیهان.

3–ئەو گۆڕانکاریانەی پێك هاتوون، تەنیا گۆڕانکاری مەزن نەبوون. ئەو گۆڕانکاریانە شەخسیترین‌وتایبەتیترین تایبەتمەندییەکانی ژیانی خەڵکی گرتووەتەوە. نموونەی ئەم گۆڕانکاریانە پێداگری لە سەر عەشقی ڕۆمانسی وەك بنەمای هاوسەرێتییە.

4–کۆمەڵناسان لە ڕێگای هێنانە گۆڕی چەند پرسیارێکی روون‌و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی وەڵامەکانیان بە هۆی توێژینەوەی سیستماتییەوە ژیانی کۆمەڵایەتی دەخەنە بەر توێژینەوە. ئەم پرسیارانە پێدەچێ پرسیاری راستەقینە، بەراوردکاری، پێکهاتنی(تکوینی) یان تیۆری بن. لە توێژینەوەی کۆمەڵناسیدا جیاکردنەوەی ئاکامە خوازراو ونەخوازراوەکانی کرداری ئینسانی لە یەکتر (کارێکی) بایەخدارە.

5–لە کۆمەڵناسیدا پێویستە خاوەن هزرێکی داهێنەرانەبین‌و واز لەو بیروباوەڕانە بێنین کە یەك لایەنانە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان دەڕوانن.

6–کۆمەڵناسی پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ باقی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە. تێکڕای زانستە کۆمەڵایەتییەکان کردەوەکانی مرۆڤ لە بەرچاودەگرن‌و لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی دەکۆڵنەوە. پێکەوە بەسترانی کۆمەڵناسی، ئینسانناسی‌و مێژوو بایەخێکی تایبەتییان هەیە.

7–کۆمەڵناسی زانستە. واتە میتودە سیستماتییەکانی توێژینەوەو هەڵسەنگاندنی ڕێبازە تیورییەکان لە بەر ڕووناکایی دیکومێنت‌و بەڵگاندنە لوژیکییەکان لەخۆ دەگرێ. بەڵام ناتوانێ بە شێوەیەکی راستەوخۆ بچێتە چوارچێوەی زانستە سروشتییەکانەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە توێژینەوەی رەفتاری ئینسانی لە بنەڕەتدا جیاوازە لە توێژینەوەی جیهانی سروشتی.

8–کۆمەڵناسان هەوڵدەدەن بە شێوەیەکی بابەتیانە لە ژیانی کۆمەڵایەتی بکوڵنەوەو بە شێوەیەکی ئازادئەندێشانە کار بکەن. ئوبژەبوون نەبەسراوەتەوە بە روانگەکانی توێژەرەوە، بەڵکوو بەسراوەتەوە بە هەڵسەنگاندنێکی گشتی توێژینەوەو تیورییەوە کە بەشێکی بنەڕەتین لە کۆمەڵناسی وەك ژانرێکی زانستی.

9–کۆمەڵناسی ژانرێکە کە گەلێك بەرهەمی گرنگی زانستی لە خۆگرتووە. کۆمەڵناسی دەتوانێ بە شێوەی جۆراوجۆر رەخنەی کۆمەڵایەتی‌و ڕێفورمی پراکتیکیانەی کۆمەڵایەتی بەهێز بکا. سەرەتا، تێگەیشتنی باشتر لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی بە گشتی دەبێتە هۆی ئەوەی باشتر بتوانرێ ئەو شتانەدا بخرێتە ژێر چاوەدێرییەوە. دووهەم، کۆمەڵناسی چاوی ئێمە لە ئاست جیاوازییە کەلتوورییەکاندا دەکاتەوەو ڕێگا بۆ دانانی سیاسەتێکی پشت ئەستوور بە ناسینی جیاوازییە کەلتوورییەکان خۆش دەکا. سێیهەم، دەتوانین ئاکامە خوازراو و نەخوازراوەکانی بەرنامە پراکتیکیە تایبەتەکان تاوتوێ بکەین. سەرەنجام‌و رەنگە لە هەموان گرنگتر، کۆمەڵناسی دەبێتە هۆی وشیارکردنەوەی خودو هەلێکی زیاتر بۆ ئەو گرووپ‌و تاکەکەسانە دەرەخسێنێ تا بتوانن هەلومەرجی ژیانیان بگۆڕن.

## سەرچاوە

کتێبی جامعە شناسی

ئانتونی گیدنز، تاران/نشرنی، 1373 چاپی چوارەم.

# ئیسلام و بەعەلمانیکردن

د. محەمەد ئارکۆن

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

### یەکێ لە گرفتەکانی "ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی"

ئەو بابەتەی لێرەدا بۆ گفتوگۆکردن هەڵبژێردراوەو پەیوەندیی بە "ئیسلام و عەلمانیکردن"ەوە هەیە، بابەتێکە دەچێتە ناو چوارچێوەی توێژینەوەیەکی بەرین و فرەلایەن کە پێشتر بە "ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی"[(1)] ناومان بردووە. ئێمە ئەم زاراوەیەمان لە کتێبێکی بچووکی رۆجێ باستید وەرگرتووە بە ناونیشانی "ئەنترۆپۆلۆژیای پراکتیکی"، توێژینەوەکانی ئێمەیش لەسەر هەمان هێڵ دەڕوات.

مەبەستمان لە "ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی" چییە؟ لە ڕاستیدا ئەم زاراوەیە تەنها چەمکێکی دیالێکتیکی نییە کە پێچەوانەی "ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکی" (یان خۆرهەڵاتناسی) بێت کە لە سەدەی نۆزدەهەم و بە تایبەتی لە فەرەنسەدا لە دایك بووە. هەمووومان دەزانین لەوکاتەدا نووسینێکی ئێجگار زۆر هەبوون تەرکیزیان دەکردە سەر ئیسلام و کۆمەڵگە ئیسلامییەکان. ژمارەیەك نووسەری سەربازی و ئیداریی کۆلۆنیالی و تەبشیری و هەروەها هەندێ لە مامۆستایانی زانکۆ ئەو نووسینانە یاخود ئەو لێکۆڵینەوانەیان ئەنجام داوە. بەهای رۆشنبیرکردنی ئەو نوسینانە هەرچییەك بێت، ئەوا دواجار رەنگدانەوەی کۆششی تێڕوانین و گۆشەنیگایەکی دەرەکییە، ئەو نوسینانە (واتە نوسینی خۆرهەڵاتناسەکان) کاریگەریی مەیلێکی ئیتنیکی بەسەرەوەیە و لە ئیتنیك سێنترالیزمەوە سەرچاوە دەگرن و لەو نێوەندە مێژووییەوە روون دەبێتەوە کە تیایدا لەدایك بووە، تەنانەت ئەو لێکۆڵینەوانەی لە زانکۆکانیشدا ئەنجام دراون لەناو ئەو چوارچێوە گشتییەی سێنترالیزمی ئیتنیکیدا مەلە دەکات، چونکە راڤە و شیکردنەوەکانی ئەو لێکۆڵینەوانە بە زۆری تێڕوانینێکی نێگەتیڤانە لە بارەی ئیسلام پێچەوانە دەکاتەوە. بەڵام ئەمڕۆ سەرهەڵدانی دیدێکی نوێ دەبینین کە لە ناو خودی کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا لەدایك دەبێت، لێرەدا خاڵی دەستپێکردنێکی ناچارییانە بۆ "ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی" دەردەکەوێت.

لەوەی باسمان کرد، نابێت وا تێبگەین کە ئەو توێژەرەی لەو بوارەدا بەشداری دەکات، هەر دەبێت موسوڵمان بێت، ئەمە هەڵەیەکە و دەبێ دەمودەست دووری بخەینەوە. گرنگ ئەوەیە توێژەر سەر بە قەدەر و چارەنوسێکی مێژوویی دیاریکراو بێت. کاتێکیش مرۆڤ لە قەدەرێکی وادا دەژیت، ڕەهەندە جەماعیەکەی بەتاڵدەبێتەوە. بێگومان کاریگەریی ئەو قەدەرە مێژووییەی لەسەر دەبێت، تێڕوانین و شیکردنەوەکانیشی جیاواز دەبێت لە تێڕوانین و شیکردنەوەی چاودێرێکی دەرەکی کە لەو قەدەرە مێژووییەدا ناژیت. سۆسیۆلۆجیا فێرمان دەکات کە کۆمەڵگە قسە دەکات، لەم قسەکردنەشدا زمانێکی تایبەت بە خۆی بەکار دەهێنێت، زمانێك لە هەناوی ئەو کۆمەڵگایەوە دێتە دەرێ، لەمەشدا پرۆسەیەکی کامڵ بەرهەم دێت کە کۆمەڵگا بەسەر خۆیدا پرۆسەی دەکات. دیسان لەمەشدا چەشنێکی نوێ لە گوتار و لە تێگەیشتن و شیکردنەوە بەرهەم دەهێنرێت. ئەمە ئەو شتەیە ئەمڕۆ لەو کۆمەڵگە ئیسلامییانەدا دەیبینین کە سەربەخۆییان بەدەست هێناوە، ئەمە وامان لێدەکات ئەرکی خستنەڕووی گرفتەکانی و هەوڵی چارەسەرکردنیان بگرینە ئەستۆ. جا بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵگایانە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە کە ڕووبەڕوویان دەکرێتەوە، دەبینین نیگای خۆیان بەرەو رابردوو و بەرەو کەلەپورەکەیان دەگوازنەوە. بەڵام لەو دەمەدا خۆیان لە بەرامبەر بۆشاییەکی تیۆریی گەورە دەبینن بە هۆی نەبوونی ئەو کەرەستە گونجاوانەی گرفتەکانیان بۆ دەخاتە بەردەست کە دواتریش هەوڵی تێگەیشتن و چارەسەرکردنیان بۆ دەدات.

کاتێکیش ئەو کۆمەڵگە ئیسلامییانە ئاوڕ لە ڕابردووی خۆیان دەدەنەوە، بەمسۆگەری بەر ئەو نووسینە خۆرهەڵاتناسییانە دەکەون کە پێشتر ناومان هێنان. ئەو نووسینانە لەلایەن کەسانی ترەوە بەرهەم هێنراوە و تا ئەمڕۆش بەرهەم دەهێنرێن. بەمجۆرە ڕووبەڕووبونەوەیەك ڕوودەدات کە مومکین نییە هیچ کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی خۆی لێ لابدات. جا لەبەرئەوەی توێژینەوەی زانستی لە خۆرئاوادا زۆر پێشکەوتووە، هەمیشە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان خۆیان لە ژێر هەژموونی میتۆدۆلۆژی و ئیپستیمۆلۆژیی دنیای خۆرئاواییدا دەبینن. لێرەدا "ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی" دەیەوێت پێچەوانەی ئەو هەژموونە خۆرئاواییە پیشان بدات. ئەرکی ئەم ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکییە تەنها لەبەرهەمهێنانی لێکۆڵینەوە باوەڕپێکراو و ساغکراوەکان کورت نابێتەوە کە پێشتر خۆرهەڵاتناسی ئەم کارەی دەکرد، بەڵکو دەیەوێت ئەرکی خستنەڕووی گیروگرفتە راستەقینەکانیش بگرێتە ئەستۆ کە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بە دەستیەوە دەناڵێنن، پاشان هەوڵی چارەسەرکردن و کۆنترۆڵکردنیان دەدات بە بەکارهێنانی ڕێچکەیەکی زانستی و میتۆدی زانستی. ئەمەیە ئامانجی دوولایەنە یاخود دوو سەرەی ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی. لەسەرێك دەیەوێت لەناو کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا شوێنێك بگرێت تا لە گرفتە کۆن و نوێیەکانیان تێبگات و بیانناسێت، لە سەرێکی تر بەشداری لە دەوڵەمەندکردنی توێژینەوەی زانستیدا بکات بەو شێوەیەی ئەمڕۆ لە ژینگە رۆشنبیرییە جیاجیاکاندا پرۆسە کراوە و دەکرێت، لەگەڵ بەدیهێنانی هەموو مەرجەکانی توێژینەوەی زانستی و پێداویستییە تیۆرییەکانیدا. توێژەری پسپۆر لە بواری ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکیدا دەبێت بە تەواوی لە نێو ئەو کۆمەڵگایانەدا بژیت و بە تەواوی بچێتە ناو حەقیقەتی ژیانی کۆمەڵگە ئیسلامییەکانەوە تا بتوانێت قسەیان لەبارەوە بکات و بەرپرسیاریی

تێگەیشتن لە جەوهەری ئەو کۆمەڵگایانە هەڵبگرێت.

بۆچی ئێمە لەناو ئەم "ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی"یەدا بایەخێکی زۆر بە بابەتێکی گرنگی وەکو "ئیسلام و عەلمانیکردن" دەدەین؟ لە راستیدا گرنگیی بابەتێکی لەم چەشنە تەنها گرنگییەکی زانستی یاخود تیۆری نییە، بەڵکو بایەخێکی حەیاتی و واقعیشە. جا بۆ ئەوەی ئەم گرفتە لە ئیسلامدا چارەسەر بکەین، پێویستە سەر لە نوێ رەخنە لە چەمکی عەلمانییەت "یان عەلمانیکردن" بگرین، رەخنەگرتنێکی فەلسەفییانە وەك ئەوەی لە فەرەنسەدا بەکارهێنراوە و پراکتیزە کراوە. لە واقیعدا عەلمانییەت سەبارەت بە دونیای عەرەبی و بەگشتی دونیای ئیسلامی، مەسەلەیەکی هەمیشە ئامادە و پێویستە. عەلمانییەت، وەك هەموومان دەیزانین، مەسەلەیەکە تا ئەمڕۆش – تەنانەت لە فەرەنسەشدا – خۆی دەخاتە ڕوو. بەڵام بێگومان ئەم مەسەلەیە لەسەر خاکی ئیسلامدا پێداویستییەکی گەورەتری هەیە بۆ پێکهێنانی دەوڵەت، مەبەستم بە مانا نوێیەکەی وشەی دەوڵەت. هەموو سەرکردە موسوڵمانەکان هیواخوازن عەلمانییەت لە کۆمەڵگاکانیاندا پراکتیزە بکەن، بۆیە هەوڵدەدەن بیری نوێ بهێننە نێو ئەو کۆمەڵگایانەی تا ئەمڕۆش لە زۆر لایەنەوە خاوەنی بونیاد و پێکهاتێکی کۆن و بەسەرچوون.

لێرەدا دەبێ جیاوازی بکەین لە نێوان هەردوو وشەی کۆن یان دێرین *larchaisme* و لاساییکردنەوە یان ترادشنالیزم *Traditionalisme*. وشەی "کۆن" واتە هەموو ئەو شتانەی لە رابردووەوە دێن، لەوانە رابردووی بەر لە ئیسلامیش، واتە باوەڕ و رەفتارەکانی پێش ئیسلام. بەڵام وشەی "لاساییکردنەوە" یان ترادیسیۆنالیزم واتە هەموو ئەو شتانەی پەیوەستن بە کەلەپوری ئیسلامی کە ئەمیش لە شێوەی چەند بونیادێکی کۆن و رەقهەڵاتوودا بەرەو بەستەڵەکی و وشکهەڵگەڕان دەچێت. بەمجۆرە دەبینن ئێمە نامانەوێ حوکمێکی بەهایی بەسەر هیچ یەکێك لەم دوو وشەیەدا بدەین، یاخود نامانەوێ "لاساییکردنەوە" بەسەر "کۆن و دێرین"دا زاڵ بکەین، بەڵکو دەمانەوێ ئاماژە بە دوو بوار بدەین کە دەبێ کەشفیان بکەین و پاشان ریشەکێشیان بکەین. پێویستە ئەو دۆخە کەشف بکەین کە چۆن "کۆن" و "لاساییکردنەوە" بە نێو یەکدا دەچن و چەند حاڵەتێکی ئاڵۆز پێکدەهێنن، واتە چەند حاڵەتێکی پاشکەوتووانە کە دەبن بە ڕێگر و بەربەست لە بەردەم سەرهەڵدان و دروستبوونی دەوڵەتی نوێ.

لەواقیعدا مەسەلەی عەلمانییەت (یان عەلمانیکردن) لە نێو سەرجەم یەکەکانی کۆمەڵگادا بیرکردنەوەی هەموو بەرپرسانی سەرقاڵ کردووە. بەڵام کاتێك ئەو بەرپرسانە بە دوای چوارچێوەیەکی فیکریدا دەگەڕێن تا چارەسەری گرفتەکانیان پێ ببەخشێت، دەبینین ئەو چوارچێوە تیۆرییە فیکرییە بە تەواوی ونە. لە راستیدا ئێمە ئەو مەرجەعە مێژووییە پێویستەمان نییە تا بزانین چۆن گرفتی عەلمانییەت لە نێو کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا خۆی دەرخستووە. هەروەها ئەو مەرجەعە فەلسەفییە گونجاوانەشمان نییە تا ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەین، ئەمە لەبەرئەوەی ئیسلام لە مێژووی خۆیدا هەرگیز بیرکردنەوەیەکی فەلسەفییانەی نەناسیوە تا مەسەلەی عەلمانییەت – بەو شێوەیەی ئەمڕۆ تێیدەگەین – بخاتە ڕوو. ئەمە بە تەبیعەتی حاڵ بەو مانایە نییە کە عەلمانییەت لە ژینگە ئیسلامییەکاندا نەبووە یان پرۆسە نەکراوە.

کەواتە ئەمەیە ئەرکی ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی لە دامەزراندنی چوارچێوەیەکی تیۆری و فیکری کە رێگە بۆ بەرەنگاربونەوەی هەموو ئاستەنگ و گرفتەکان بەشێوەیەکی واقیعی و هەستپێکراو دەکاتەوە، مەبەستم هەموو ئەو گیروگرفتە بەرچاو و رۆژانەییانەی تیۆریزەیان بۆ نەکراوە.

### دوو نموونەی عەلمانیکردن: تورکیا و لوبنان

بۆ روونکردنەوەی پێدراوە تیۆرییەکانی پێشوو، دوو ئەزموونی مێژوویی دەهێنینەوە کە بایەخ و گرنگیی مەسەلەی عەلمانییەت دەردەخەن. یەکەم لێرەدا ئەزموونی تورکیامان لەبەردەستدایە.

هەر لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی، کەمال ئەتاتورک شۆڕشێکی عەلمانیی راستەقینەی لە ولاَتێکدا بەرپا کرد کە ئەوسا و ئێستایش ولاَتێکی ئیسلامیی توندە.

ئەتاتورک سەرکردەیەکی سەربازی بوو و پێشتر لە فەرەنسادا خوێندبووی، کاتێک گەڕایەوە بۆ تورکیا، حەماسێکی گەورەی بۆ بیری فەرەنسی هەبوو، هەڵگری تێڕوانینی عەلمانییەتی خەباتگێڕی بوو، پاشان ویستی ئەو بیروباوەڕە عەلمانییە بەسەر تورکیایەکدا پراکتیزە بکات کە بەشکستی لەجەنگ هاتبووە دەرێ. بۆ بەدیهێنانی ئەم خواستەیش کۆمەڵێ یاسای زەقی دەرکرد وەکو هەڵوەشاندنەوەی سەڵتەنەت کە جۆرێک لە شەرعیەتی ئیسلامیی دەنواند و لە خەلافەتەوە وەرگیرابوو. ئەم بریارە گورزێکی سەختی بۆ ئوممەی ئیسلامی پێکهێنا. کۆمارێکی تورکیی لە شێوەی مۆدێلی خۆرئاوایی دروستکرد و ساڵنامەی ئیسلامیی کۆچیی رەتکردەوە، پاشان پیتی عەرەبیی لە نووسیندا ئیلغا کردەوەو ئەمەش کاری لە کەشی دەلالی و وێنای سەرجەم گەلێک کرد. دواتریش وەزارەتی کاروباری ئایینی و هەموو کۆمەڵە ئاینییەکانی هەڵوەشاندەوە و وانەی ئایینی لە هەموو قوتابخانەکاندا لابرد، شەپقەی ئەوروپیی لەبری تەربوش سەپاند.. هتد.

بەمجۆرە دەبینین ئەم ئەزموونە لە جورئەت و بوێریدا زۆر دوور رۆیشتووە، بەلاَم لە راستیدا ئەمە "کاریکاتێر"ی عەلمانییەتە کە چەند پەڕگیرییەکی لەگەڵدا بووە، رێک وەک ئەوەی پێشتر لە فەرەنسەدا روویدا. بەلاَم میللەتی تورکیا بەدەنگ ئەو ئەزموونەوە نەهات کە کاسی کردبوو، ئەمەش ئەو گەڕانەوە توندەی ئایین دەردەخات کە لە ساڵی 1940ەوە دەستی پێکرد. لەو دەمەدا تەوژمی ئیسلامی بەهێزێکەوە مەوقیعی خۆی گەڕاندەوە. ئەمڕۆیش بە بەرچاوی خۆمان دەبینین کە بە هۆی چەند هۆکارێکی سیاسی و ئابوری و کولتوری مەسەلەکان گەیشتوونەتە حاڵەتی توندڕەویی ئایینی، ئەم توندڕەویی ئاینییە کاردانەوەی ئەو مەودا کورتەی عەلمانیکردنە کە ئەتاتورک بە زۆر سەپاندی. شتێکی چاک و سودبەخشە بە درێژی لەم ئەزمونە رامێنین کە لە چوارچێوەیەکی کولتوری و ئایینی ئیسلامیدا و لەسەر خاکی ئیسلامدا ئەنجام دراوە.

ئەزموونی دووەم کە گرنگیی و پێداویستیی عەلمانیەتمان بۆ روون دەکاتەوە. بێگومان ئەزموونی لوبنانە. مۆدێلی لوبنانی بایەخێکی گەورەی سەبارەت بە توێژینەوەکەی ئێمە هەیە، چونکە ئێمە لەم ئەزموونەدا چەند رواڵەتێکی پەڕگیریی بەرین دەبینین. دەشێت ئەم رواڵەتانە لە چەند ولاَتێکی تری خۆرهەلاَتی ناوەڕاستدا ببینن وەکو میسر و سوریا و عێراق کە کەمینەیەکی گەورەی مەسیحییەتیان تیادا دەژی.

ئەمە بریتییە لە مەسەلەی پێکەوە ژیانی ئاشتییانەی نێوان تایەفە جیاجیاکان. کەچی ئەم مەسەلەیە لە مەغریبدا بوونی نییە کە ماوەیەکی درێژە جۆرێك لە تاکانەیی تایەڤ لە خۆدەگرێت، ئەگەرچی کەمینەیەکی جوولەکەی تیادا دەژیت کە دواتر کەم ولاواز بوونەوە.

کەواتە لە لوبناندا شڵەژان و هەستێکی هەڵچووی وا دەبینین دەگاتە ئەوپەڕی، بە ئەندازەیەك پێدەچێت عەلمانییەت تاکە چارەسەری ئەو دۆخە بێت. ئەوانەی ئەمڕۆ لە لوبناندا پێشنیاری عەلمانییەت دەکەن بەزۆری مەسیحییەکانن. دەبیٚ پرسیاری ئەوە بکەین بۆچی مەسیحییەکان پیٚ لەسەر عەلمانییەت دادەگرن. ئەگەر لە نزیکەوە ئەزموونی لوبنانی بپشکنین، دوو گروپی ئایینی دەبینین کە لە ژمارەدا یەکسانن و هەریەکەیان بە جیا روانینێکی سەرجەمگیریان لەسەرخۆیان پێکهێناوەو پەرەپێداوە. بەمجۆرە هەر گروپێك بە چەشنێك لە دەمارگیری و داخران بەها تایبەتییەکانی خۆی چەسپاند. ئەم جەخت کردنە لە خود و بەهاکانی خود و خۆ بە باشتر زانین لە گروپ و توێژەکەی تر، بە روونی لە سیستمی فێرکردن و خۆرۆشنبیرکردندا دەبینرێت کە لەلایەن هەردوو لایەندا پرۆسەکراوە، ئەمە هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە (واتە لە منداڵییەوە) تا قۆناغی زانکۆ بەروونی هەستی پێدەکرێت. لە راستیدا ئەم مەسەلەیە زۆر ترسناکە. لە واقیعدا هەر چارەسەرێك بۆ گرفتی لوبنانی، دەبیٚ وەکو هەنگاوی یەکەم، سیستمی فێرکردنی پرۆسەکراو لەلایەن هەردوو گروپدا، هەڵبوەشێنرێتەوە. مۆدێلی لوبنان لە دەفرێکی بچوك و تەسك دەچێت یان لە گەردوونێکی بچووك دەچێت کە بەشێوەیەکی زۆر چڕ و پڕ رووداوەکانی تیادا دەگوزەرێت، هەموو شتێك تیایدا تا کۆتایی شپرزە و ناسەقامگیرە بە تایبەتی بەهۆی ئەو ئاڵۆزییە جیهانییەی لە ئاکامی ململانێی عەرەبی ئیسرائیلیدا دروست بووە.

ئەم دوو نموونەیە — تورکیا و لوبنان — مەودای گرنگیی ئەو گرفتە پیشاندەدەن کە خراوەتە ڕوو، مەبەستم گرفتی ئیسلام و عەلمانیەتە. بەلاٚم دەبیٚ بایەخ بەم مەسەلەیە بدرێت نەك تەنها لە پێناوی چەند ئامانجێکی جیدالی و خستنەوەی مشتومڕ وەك زۆر جار ئەمە دەکرێت، یان لە پێناوی پرۆسەکردنی ستراتیژی هێز و دەسەلاٚت بەسەر ئەوانیدی. لە راستیدا ئەمە لە لوبناندا روودەدات. دەبینین ئەوانەی بانگەشە بۆ عەلمانییەت دەکەن تا گیانی تایفەگەرایی و ململانێکانی تایفەگەرایی جێبهێڵن، مەسیحییە مارۆنییەکانن. بانگەشەیەکی لەم جۆرە پێدەچێت کەمێك شوێنی گومان بێت، بە تایبەتی ئەگەر زانیمان مارۆنییەکان شوێنگەیەکی گەورە لە کۆمەڵگەی لوبنانیدا داگیر دەکەن کە لە ڕووی ئابووری و ڕۆشنبیرییەوە زۆر لە پێش موسڵمانەکانەوەن. ئەمە واتە موسڵمانەکان، بە پێچەوانەی مارۆنییەکان، خاوەنی توانایەکی رۆشنبیریی وانین بتوانن بە بۆچونێکی عەلمانییانە جارێکی تر بیر لە ئیسلام بکەنەوە، واتە ئیسلام لە عەلمانییەت نزیك بکەنەوە. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە وێنایەکی روونیان نییە و هەروەها میتۆدێکی کارکردنی وایان لە بەردەستدا نییە ببێتە هۆی بەدیهێنانی بیرێکی عەلمانیی جیاواز لەو بارودۆخە پڕ لە ململانێی کوێرانەیە کە لە ئەزموونی کەمال ئەتاتورکدا هەبوو[2].

بەمجۆرە تێبینی ئەوە دەکەین کە پێویستە مەسەلەی چوارچێوەی کۆمەلاٚیەتی — کولتوری لەبەرچاو بگیرێت، ئەو چوارچێوە کۆمەلاٚیەتی —

کولتورییەی تێڕامانێکی ڕاستەقینە و کاریگەری سەبارەت بە عەلمانیەت، تیادا پرۆسە دەکرێت. جا بۆ ئەوەی بشێت تێڕامانێکی لەم چەشنە لەلایەنی ئیسلامیدا بوونی هەبێت، ئەوا زۆر پێویستە گرفتەکە لە هەموو ڕەهەندەکانیەوە بخرێتە ڕوو و هەروەها دووربێت لە ستراتیژی هێز و دەسەلاَت یان کۆنترۆڵکردن کە ئەم یان ئەو توێژە ڕێنوێنی دەکات. کەواتە دەبێ گرفتەکە لە شوێنی شیاوی خۆیدا بخەینە ڕوو، واتە لە چوارچێوەی ململانێی کۆمەلاَیەتی – سیاسی کە لە هەموو کۆمەڵگە ئیسلامیەکاندا لە نێوان "کۆنەپارێزەکان" و "پێشکەوتنخوازەکان"دا هەڵدەگیرسێت. لە هەموو جێگایەکی ئەو کۆمەڵگایانەدا تێبینی شێوەگرتنی بۆشاییەکی گەورە دەکەین لە نێوان باڵی پێشکەوتنخواز کە هەموو ریفۆرمێکی ریشەیی قبوڵە و لە نێوان باڵێکی تر کە بە ڕووی هەموو گۆڕانکارییەك دەوەستێ و بە بیانووی هۆکاری ئاییني ڕەتیدەکاتەوە. بەمجۆرە خۆمان لە بەرامبەر ئیشکالیەتێکی گشتیدا دەبینین کەمومکین نییە لەمڕۆ بەدواوە ئیسلام ئەو ئیشکالیەتە فەرامۆش بکات یان بیشارێتەوە ئەمە ئەگەر بیەوێت لەناو ئەو کۆمەڵگایانەدا درێژە بەژیان بدات کە چوونەتە قۆناغی نوێکردنەوەو گۆڕانکارییەوە.

### خەلافەت: بنەمای مێژوویی و پرۆسەی پاساودان

بۆ ئەوەی ڕۆشنایی بخەینە سەر ئیشکالییەتی عەلمانیکردن، دەبێ مەسەلەی خەلافەت بخەینە ڕوو. ڕاستە ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی بە مێژووەوە هەیە، بەلاَم ئەمیش کۆمەڵێ ململانێ و مشتومڕی گەرمی بەرهەم هێنا کە ئەگەر لە گۆشەنیگای مێژووی ڕەخنەگرانەوە بیخوێنینەوە، دەتوانین بەشێوەیەکی نوێ لە ناو ئەزموونی ئیسلامیدا عەلمانییەت بخەینە ڕوو. خەلافەت دەمانباتە سەر بنەمای دەسەلاَت و ڕێکخستنی "دەوڵەتی ئیسلامی". دەشێت ئەم گوزارشتەی دوایی (واتە گوزارشتی دەوڵەتی ئیسلامی) بەرەو نەمان بڕوات چونکە پێشوەخت هەڵوێستێکی نێگەتیڤی لەبەرامبەر عەلمانییەت لە خۆ دەگرێت. کێشەی خەلافەت لەلایەن بیریاری میسری عەلی عەبدولرازق لە ساڵی 1925دا هەوڵێکی بوێرانەی بۆ عەلمانیکردنی بیری ئیسلامی وروژاند. دەبێ جارێکی تر و سەر لە نوێ درێژە بەم کارە بدرێت بەلاَم لە ژێر ڕۆشنایی "ئەنترۆپۆلۆژیای سیاسی"[3]دا کە جۆرج بالاندیێ ئەم زاراوەیەی کردۆتەوە و لێی دواوە. لێرەدا هەندێ ڕوونکردنەوەی پرەنسیپی پێشکەش دەکەین. لێرەدا سێ زاراوە هەیە دەبێ بیانپشکنین،

یەکەم: زاراوەی "خەلیفە" کە لە فەرەنسیدا بەرامبەر وشەی ***Vicaire*** دێت. خەلیفە جێگری پێغەمبەرە کە درێژە بە کارەکانی ئەو دەدات، لێرەدا پێدراوێکی زمانەوانیی بنچینەیی هەیە. زاراوەی دووەم "ئیمام"ە کە دەشێت بەمجۆرە پێناسی بکەین: ئەو کەسەی لە کاتی نوێژکردندا ڕابەریی موسڵمانان دەکات و ئاراستەی مەککەیان بۆ دیاری دەکات و پێشیان دەکەوێت، ئەو کەسە لە هەمانکاتدا ڕابەرێکی ڕۆحیشە. بەلاَم زاراوەی سێهەم بریتییە لە زاراوەی "سوڵتان" واتە ئەو کەسەی بە مانای سیاسی و دونیایی پرۆسەی دەسەلاَت دەکات. بەمجۆرە دەبینین ماناکانی ئەم سێ زاراوەیە زۆر بە ڕوونی جیاوازن. دوو زاراوەی یەکەم بەرپرسیاریی ڕۆحی و زەمەنی لە خۆ دەگرن، بەلاَم زاراوەی سێهەم تەنها مانای پرۆسیسەکردنی دەسەلاَتێك دەبەخشێت کە لە ڕێگەی هێزەوە بە دەستهێنراوە و بەهۆی هێزیشەوە بەردەوام دەبێت.

بەمجۆرە ئێمە جیاوازیمان لە نێوان خەلافەت و سەڵتەنەت دانا کە زۆر جار تێکەڵ دەکرێن بە هۆی ئەوەی کە سەڵتەنەتی تورکی یاخود سوڵتانە تورکەکان خۆیان بەمیراتی خەلافەت دەزانی.

مادامەکی ئێمە لە قسەکانماندا گەیشتینە ئەم خاڵە، دەبێ خۆمان لە هەڵەیەکی زۆر باووبڵاو بپارێزین کە لە ئەدەبیاتی خۆرهەڵاتناسی و لەلای موسڵمانانیشدا رەواجی هەیە، ئەو هەڵە باوە دەڵێت: "ئیسلام هەرگیز لە مێژووی خۆیدا نەیزانیوە جیاوازی لە نێوان (زەمەنی) و (رۆحی)دا بکات". ئەم بیرۆکەیە لەلای خۆرهەڵاتناسان و لەلای سەرجەم جەماوەری خۆرئاواییدا بیرۆکەیەکی جێگیرەو چووەتە نێو قوڵایی بیرکردنەوەیانەوە. ئەگەر دەمودەست خۆمان لەم بیرۆکەیە رزگار نەکەین ئەوا بەراشکاوی پێتان دەڵێم ئەم سیمینارەی ئێمە هیچ مانایەکی نابێت.

لە راستیدا، وەك دواتر دەیبینین، مەسەلەکان بەو ئەندازەیە سادە نین. لە رابردوودا لەو کۆمەڵگایانەی بە ئیسلامی ناودەبرێن هەندێ ئەزموونی قووڵ هەبوون کە دەشێت بە ئەزموونی عەلمانییەت وەسفی بکەین، بەڵام ئەو ئەزمونانە نەگەیشتبوونە پلەی هوشیارییەکی روون بە خودی خۆیان، هیچ رۆژێکیش تیۆریزەیان بۆ نەکراوە.

بابگەڕێینەوە بۆ مێژوو، بگەڕێینەوە بۆ ئەو رووداوەی بە فیعلی لە مێژوودا روویداوەو بووە مایەی لە دایکبوونی خەلافەت. پێغەمبەر لە ساڵی 632ز کۆچی دوایی کرد پاش ئەوەی بۆ ماوەی بیست ساڵ لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا لە ئەزموونێکی دەگمەندا ژیان کە خۆی رابەر و رێنیشاندەر بوو. ئەم ئەزموونە، کە دەشێت بە "ئەزمونی مەککە و مەدینە" ناوی ببەین، چەندین پێدراوی لە چەشنی ئایینی و چەندین پێدراوی لە جۆری دونیایی لە خۆگرتبوو کە تیبەت بوون بە کارەکانی سەرکردەیەك رابەریی گروپێکی دیاریکراوی لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا دەکرد. ئێمە لێرەدا بە ئەنقەست وشەی "ئەزموون" بەکاردەهێنین چونکە ئەمە بە فیعلی پەیوەستە بە چەند هەڵوێستێکی پراکتیکی و هەستپێکراو لەلایەن پیاوێکی سەرکردەو رابەرەوە لەناو گروپێکی مرۆییدا. ئەو هەڵوێستە پراکتیکی و ئەو هەڵسوکەوتە سەرکردایەتییەی کە دواتر بەهایەکی ئایدیالی و نموونەیی لە خۆدەگرێت، جێکەوتێکی قوڵی لەسەر هەموو رووداوەکانی دواتردا دەبێت.

لەساڵی 632ی زایینی و یەکسەر لە پاش مەرگی پێغەمبەر، هەر دەبوایە مەسەلەی بەردەوامبونی ئەزمونەکە بهاتایە پێشەوە. کێ دەتوانێت بەبێ کەموکورتی و وەکو خۆی درێژە بەو ئەزمونە بدات؟ بەمجۆرە مەسەلەی خەلافەت هاتە ئاراوە. دواتر چەندین جەنگ و ململانێی خوێناوی روویدا، هەر لە ساڵی 632ز تا مێژووی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و دواتریش هەڵوەشاندنەوەی سەڵتەنەت لەلایەن ئەتاتورك لە ساڵی 1922دا، ئەو ململانێ خوێناوییە بێ پسانەوە بەردەوام بوو.

ئەو کێشە تیۆرییەی مەسەلەی بەرهەمهێنانەوەی ئەزمونی مەککە و مەدینە خستیەروو، هەرگیز لە مێژووی ئیسلامدا، بەشێوەیەکی رەواو لە گۆشەنیگای تیۆلۆجیاوە، چارەسەر نەکراوە. ئەمە وامان لێدەکات جەغت لەوە بکەین کە دەسەڵات بە درێژایی مێژووی ئیسلامی دەسەڵاتێکی زەمەنی بووە و لەلایەن دەسەڵاتی ئایینییەوە رێنوێنی کراوە. ئەمە راستییەکی زۆر گرنگە و پێچەوانەی ئەو وێناکردنە گەورانەیە کە لە زەینی سەرجەم گروپە ئیسلامیەکاندا بنجی

بەستووە. بەمجۆرە دەبینن ڕۆڵی توێژەری شیکەرەوە لە ڕووتکردنەوە و ئاشکراکردنی ئەوهامە پوچەکان چەندە گرنگە. ئێمە نامانەوێ بە ئارەزووی خۆمان مێژوو بنوسین، بەڵکو دەمانەوێ بزانین لە سەرەتای ئەو ئەزموونە دامەزرێنەرەوە تا ئەمڕۆ بەڕاستی چی ڕوویداوە. ئێوە دەزانن کە زانایانی بواری زمانناسی باسی پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی زمان دەکەن، لە بەرامبەر ئەمەدا ئێمەی مێژوونوسان دەتوانین لە بارەی هەڵوەشاندنەوەی مێژوو بدوێین (واتە هەڵوەشاندنەوەی نووسینی مێژوو — *La deconstruction de histoire*). ئەم میتۆدە لە شیکردنەوەدا، بێگومان ڕزگارمان دەکات لەو وەهمە جێگیرانەی وەك هێزێکی گەورە و کاریگەر لەناو مێژوودا کاریان کردووە، بەڵام ئەو هێزانە لە تێڕوانینی زانستدا هێزگەلێکی وەهمین[4].

ئێمە هەوڵدەدەین — کە لە هەموو توێژینەوەکانماندا ئەو هەوڵەمان داوە — ژمارەیەکی زۆری ئەو ڕووداو و چەمك و وێناکردنانە هەڵبوەشێنینەوە کە پلە بە پلە وەك حەقیقەتێکی ڕاستەقینەی جێگیر خۆیان سەپاندووە. موسڵمانەکان لە ڕابردوو و لە ئێستاشدا لەو "حەقیقەتە جێگیرانەدا" زنجیرەیەك ڕووداوی گونجاو و چەندین مانا و پەندی وەهایان تیادا بینیوە کە شایستەی ئەوەن مرۆڤ لە پێناویاندا تێبکۆشێ و بگرە لەو ڕێگەیەدا گیان ببەخشێت. دەبێ تێبینی ئەوە بکەین ئەم دیاردەیە تەنها تایبەت نییە بە ئیسلام، بەڵکو لە چەندین شوێنی تر و لە سەرانسەری کۆمەڵگە مرۆییەکاندا دەبینرێت. بەمجۆرە ئێمە وەکو مێژوونوس ئەمڕۆ خۆمان لە بەرامبەر مەسەلەی (پێداچوونەوە بەخود)دا دەبینینەوە. لە بەرامبەر ئەرکی ئەناتۆمیکردنی هوشیاریی کۆ تا بتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە قەبە و گەورەیەی خوارەوە بدەینەوە کە تەحەدای مێژوونوس — فەیلەسوف دەکات:

بە تەواوی چی ڕوویداوە تا گەیشتووینەتە ئێرە؟ واتە بە ڕاستی چ شتێك ڕوویداوە تا ئەم وێنە ئایدیالییە نامێژووییەی مێژووی ئیسلامی لە یادوەریی کۆ (یان لە هوشیاریی کۆ)دا شکڵی گرت و تا ئەمڕۆش بەردەوامە؟

مێژونوسانی ڕابردوو و فەقیهە تیۆلۆجیستەکان چەندین حیکایەتیان لەسەر ڕووداوەکان هەڵچنیوە، لەسەروەختی مەرگی پێغەمبەرەوە تا ئەمڕۆ ڕووداوەکانیان لە زنجیرەیەك حیکایەتی جیاجیادا چنیوە و جەغتیان لە ڕەوایی خەلیفە کردووە کە دەبوو بەرپرسیارییەکانی پێغەمبەر لە ئەستۆ بگرێت، لێرەوە باوەڕو تێگەیشتنێکی باو خۆی سەپاند لە کاتێکدا ئێمە لە ڕووی مێژووییەوە دەبینیین کە خەلافەت لە پاش ساڵی 661ز لەسەر زەویی واقیعدا بەهێز دەسەڵاتی خۆی بەدەستهێناوە نەك لە ڕێگەی یاسا و شەرع.

دەسەڵاتی خەلیفە سوننەکان هەروەکو دەسەڵاتی خەلیفە شیعەکان، هەمشە کەسانێك یاخود چەند لایەنێك هەبووە ناڕازی بووە و دژایەتیی کردووە. کەواتە ئەمە خەلافەتێکی تەواو زەمەنییە، عەلی عەبدولڕازق لە کتێبە ناودارەکەیدا "ئیسلام و بنەماکانی فەرمانڕەوایی" ئەمەی دەرخستووە. دانەر لەم کتێبەدا ژمارەیەکی گەورەی دۆکیومێنتی مێژوویی ئێجگار کۆنی خستۆتە ڕوو، بەڵام دواتر ڕووبەڕووی تیۆلۆجیای ڕەسمیی باو بۆوەو بەزەندیق تاوانباریان کرد و کتێبەکەیان سوتاند و خۆیشیان لەئەزهەر دەرکرد.

کەواتە حەقیقەتی مێژوویی سەبارەت بەم بابەتە و لە سنووری شیانی گەیشتن پێی، چییە؟

ئەو راستییە مێژووییە تەركیز دەكاتە سەر چوار خەلیفەی راشدین كە لە پاش پێغەمبەر لە ساڵی 632ز تا ساڵی 661ز لە مەدینەدا حوكمیان كردووە. خەلیفەكانیش ئەمانەبوون: ئەبوبەكری سدیق (632–634)، عومەری كوڕی خەتاب (634–644)، عوسمانی كوڕی عەففان (644–656)، عەلی كوڕی ئەبوتالیب (656–661)، سێ خەلیفەی یەكەم بە كوشتن مردوون. كوشتن لە دیدی سۆسیۆلۆجیستدا كردارێكە دەلالاتێكی زۆری هەیە، بەڵام لەلای تیۆلۆجیست ڕووداوێكی تێپەڕە لە ڕووداوەكانی مێژوو كەسانێك ئەنجامیانداوە لە ڕێگەی هەق و لە ڕێگەی خودا لایانداوە. سەرجەمی نووسینە ئەرتەدۆكسییەكان وێنەیەكی نموونەیی قەبەكراو و ئایدیالی لە بارەی هەرچوار خەلیفەكە پێشكەش دەكەن، بە هیچ جۆرێك شیكردنەوەی سۆسیۆلۆجی ومێژوویی بۆرووداوەكان ناخەنەڕوو.

بەپێی ئەو كەلەپورەی پێمان گەیشتووە، هەر چوار خەلیفەكە لەلایەن ئەسحابەكانی پێغەمبەرەوە هەڵبژێردراون. بەڵام، زەحمەتە لە ڕووی مێژووییەوە بزانین مەسەلەكان چۆن ڕوویانداوە. دەبێ لێكۆڵینەوە لە میكانیزمی گەیشتن بە دەسەڵات بكرێ لە سەدەی حەوتەمی زاینی لە كۆمەڵگەی عەربیداو دەبێ لەوێدا پتر تەركیز بكرێتە سەر مەسەلەی دەمارگیریی هۆزگەراییو عەشیرەتگەرایی. ئەو دەمارگیرییە خێڵەكییانە ڕۆڵێكی گەورەیان بینی لە گەیشتن بە دەسەڵات و پرۆسیسەكردنی فەرمانڕەوایی. خودی پێغەمبەریش سەر بە خێزانێكی دیاریكراو یاخود هۆزێكی دیاریكراوە كە بریتییە لە (بەنو هاشم) كە یەكێكە لە تیرەكانی هۆزی (قورەیش)ی ناودار. ئێمە دەزانین بانگەشە و تەبشیری ئایینی موحەممەد ڕووبەڕووی ناڕەزایی و پرۆتیستۆیەكی توند بوو لەلایەن خێزانە مونافیسەكەی تر (بەنو سوفیان) كە ئەوسا پرۆسەی دەسەڵاتی لە مەككەدا دەكرد. كاتێكیش لە دوای مەرگی پێغەمبەر مەسەلەی خەلافەتیان هێنایە پێشەوە، هەر یەكە لەو دوو تیرەیەی قوڕەیش (بەنوهاشم و بەنوسوفیان) لە گۆڕەپانەكەدا ئامادەبوون و خۆیان بۆ ململانێ سازدابوو. سەرجەمی ئەو مێژووەی دواتر لەدایك بوو، هەڵگری سیماكانی ئەو كێبەركێ سەرەتاییەی ئەوسایە، تا دەگاتە ئەو ململانێ و كێبەركێیەی تا ئەمڕۆش لە نێوان سوننەكان و شیعەكاندا بەردەوامە. دواتر دێینە سەر ئەم باسە.

بەڵام بە هاتنی فاكتەری سێیەم بۆ ناو ململانێكە كە بریتییە لە (ئەنسارەكان) كە لە مەدینەدا پێغەمبەریان وەكو پەنابەرێك گرتەخۆ، دیمەنەكە ئاڵۆزتر دەبێت. ئەنسارەكان سەر بە هۆزێكی ترن، ئەوانیش خواستی دەسەڵاتیان هەیە. ئێمە ناتوانین تا هەتایە ئەو راستییە سۆسیۆلۆجی و مێژووییانە بشارینەوە كە دواتر بیری ئیسلامی لەوێوە ڕێگەی خۆی دەكاتەوە. لێرەداو لە نێو شانۆیەكی ئاڵۆزی لەم چەشنەدا، مەسەلەی خەلافەت خۆی خستەڕوو و بەشێوەیەك لە شێوەكان (وەك دەرەنجامی هێزە زۆرانبازەكان) چارەسەركرا. لە میانی ئەو هەموو ململانێیانەدا، بیرۆكەی پێویستبوونی رابەرێكی پێشەوا كە لە سەرووی ململانێی نێوان هۆزەكان دەوەستێ، خۆی دەسەپێنێت. بەڵام، لە كاتێكدا ئەو بیرۆكەیە ڕێگەی خۆی دەكردەوە دەبوو لەگەڵ لایەنە جیاجیاكانی ناو ئەو ململانێیەدا، واتە لەگەڵ هێزە كۆمەڵایەتی و قەبەلییەكانی گۆڕەپانەكەدا، هەڵسوكەوت بكات. لە ماوەی 30 ساڵدا چەندین ململانێ دروست بوون (لە نێوان ساڵانی 632 بۆ 661 ز) كە هەندێجار لە شێوەی كوشتندا خۆی دەنواند.

بەڵام هەموو ئەمانە ڕێگەیان لە بیری ئیسلامی نەگرت ڕێگەی خۆی بگرێت و خۆی بسەپێنێت و لەمەشدا بەشێوەیەك لە شێوەكان پشت بە "دیاردەی قورئانی" ببەستێ. لە ساڵی 661ز بەدواوە توندوتیژیی ململانێ تەقلیدییەكان زیادی كرد بە ئەندازەیەك گەیشتە ئەوەی موسوڵمانەكان بە فیتنەی گەورە یان لێكترازانی گەورە ناویان برد. هەموو لایەك دان بەو لێكترازانەدا دەنێت، هەم سوننەكان و هەم شیعەكانیش. موعاویە كە لەڕووی مێژووییەوە سەر بەو خێزانەیە كە دژی خێزانەكەی پێغەمبەر بوو، بەهێز و بە فێڵزانیی خۆی دەسەڵاتی زەوتكرد. توانی عەلی لابەرێت كە لە گۆڕەپانی ململانێدا كوژرا، بەمجۆرە دوا نوێنەری خێزانی پێغەمبەری لەناوبرد. موعاویە لە بنەڕەتدا حاكمی سوریا بوو كە لە ساڵی 636ز دا داگیر كرا. ئیدی مەركەزی دەسەڵاتی لە مەدینەوە گواستەوە بۆ دیمەشق. ئەم كارە زۆر مانا هەڵدەگرێت، وەك ئەوەی كە بۆ نموونە پاپا لە ڕۆماوە پاپایەتی بگوازێتەوە بۆ تۆرین. بەمجۆرە سولالەی ئومەوی گەیشتە حوكم كە نزیكەی سەدەیەكی خایاند، واتە تا ساڵی 750ز بەردەوام بوو. هەموو ئەو ڕووداوە بنچینەییانە بریتین لە كار و ڕووداوی واقیعی كە هیچ پەیوەندییەكیان بە هیچ شەرعیەتێكەوە نییە شەرعیەتی هێز نەبێت.

سەرباری هەموو ئەو شتانەی وتمان، دەبێ تێبینی ئەوە بكەین كە ئەم قۆناغە بنەڕەتییە لە مێژووی ئیسلامدا، قۆناغێكە زەحمەتە بە وردی زانیاریمان لە بارەیەوە هەبێت.

ئەوەی وتمان بابەتەكە بەیەكجاری یەكلاناكاتەوە، چونكە ئەو دۆكیومێنتە مێژووییانەی پێمان گەیشتوون، پاش بەسەرچوونی ڕووداوەكان بە ماوەیەكی درێژ، ئینجا نووسراونەتەوە، هەروەها لە نێو تێڕوانینی پاساو بۆهێنانەوەدا نووسراون، ئەم مەسەلەیەش پابەندە بە ئایدیۆلۆجیایەكی گەورە و كامڵی پاساو بۆهێنانەوە. لە قۆناغی یەكەمیشدا ئومەوییەكان پایەكانی ئەو ئایدیۆلۆجیایەیان داناوە، پاشان عەبباسییەكان لەسەر هەمان هێڵ پەرەیان پێداوە.

با لێرەدا تێبینی ئەوە بكەین كە خۆرهەڵاتناسی تەقلیدی هەرگیز ئەم چەمكە (چەمكی ئایدیۆلۆجیای پاساو بۆ هێنانەوە)ی نەخستۆتە ناو بازنەی ڕۆشناییەوە و بەرجەستەی نەكردووە، ئایدیۆلۆجیای پاساو بۆ هێنانەوەیش دژی شەرعیەتی راستەقینەیە كە هەرگیز بواری هاتنە ئارای بۆ نەڕەخساوە. لێرەدا فەرقی گەورەی نێوان مێژووی هەڵوەشاندنەوەیی یاخود شیكاری كە ئێمە ئەنجامی دەدەین و نێوان مێژووی گێڕدراوەی تەقلیدی دەردەكەوێت، مێژووی گێڕانەوەیی یاخود گێڕدراوەی تەقلیدی تەنها تێكست و ڕووداو و وەقایعە كۆنەكان دەنوسێتەوە بێئەوەی هەوڵبدات كەشفیان بكات یان ناوەڕۆكە ئایدیۆلۆجییەكەیان ڕووت بكاتەوە كە پتر ناوەڕۆكێكی هەڵخەڵەتێنەر و دەمامكپۆشە. وەك گاستۆن باشلار[5] دەڵێت: مرۆڤەكان دەتوانن بۆ ماوەیەكی درێژ لە نێو پەرژینی "زانینی هەڵە"دا بژین. بە پێی ئەم وتەیە دەشێت دەریبخەین چۆن ئاگایی ئیسلامی ملكەچی ئەو ئایدیۆلۆجیای پاساوە گەورەیە بووە و بە تەواوی تیایدا خنكابوو. ئەم ئایدیۆلۆجیایە وەچە لە دوای وەچە لە ڕێگەی نووسین و گواستنەوە و دووبارە كردنەوەدا بنجی داكوتاوەو وەك "كەلەپوری زیندوو" پێشكەش كراوە. لە واقیعدا ئەو ئایدیۆلۆجیایە بەشێوەیەكی كاریگەر و زەق لە ناخی جەماوەردا زیندووە چونكە دەسەڵاتی ڕەسمی هەر لە سەرەتاوە پەیگیری ئەوەی

کردووە کە تەنها ئەم کۆپییە لە کەلەپور بگوازێتەوە. لێکۆڵینەوەی مێژوویی پرۆسەی خستنە پاڵی پیشانداوە کە لە فەرمودەکانی پێغەمبەردا بەکارهاتووە[6].

## تیۆری شیعی بۆ دەسەلات

ئێستا لە بارەی زاراوەی "ئیمام" دەدوێین کە پێشتر ئاماژەمان پێدا. بەلام بەر لەوە پێویستە هەندێ روونکردنەوەی سەرەتایی پێشکەش بکەم لەو گفتوگۆیەی لە بارەی خەلافەتی پێغەمبەرەوە کرا، لایەنێك هەبوو نوێنەرایەتی خێزانی پێغەمبەری دەکرد. ئەمانە پڕکرابون بەو دەمارگیرییە نامەرجدارەی کە دەڵێت تۆ لەسەر براکەت بکەرەوە سا لەسەر هەق بێت یان نا، وەك ئەو پەندە عەرەبییەی دەڵێت: "انصر اخاك ظالَماَ او مظلوماَ". لێرەدا خۆمان لەبەرامبەر مەسەلەیەك دەبینینەوە کە پەیوەندیی بە سایکۆلۆجیای مێژوویییەوە هەیە ئەوەی کە مێژووی پۆزەتیڤیستی ئاگاداری نییە و نایزانێت و تەنها گرنگی بە کۆکردنەوەی وەقایعە جێگیرەکان دەدات. سایکۆلۆجیای مێژوویی فێرمان دەکات لێرەدا مێژووی ئاگایی یاخود مێژووی هوشیاری هەیە کە بەشێوەیەکی پلەدار و وردە وردە شێوە دەگرێت، ئەمە مەسەلەیەکە دەبێ مێژوونووسی نوێ سەرقاڵ بکات و بیهێنێتە ناو بازنەی بایەخدانەکانی خۆیەوە. لەم تێڕوانینەوە بیرۆکەی ئیسلامی لە دەروونی خەڵکیدا بنجی دەبەست و لەمەشدا پشتی بە "دیاردەی قورئانی" دەبەست وەك دیاردەیەك بۆ سروش. ئەمە دەڵێین بێئەوەی بچینە ناو وێڵگەکانی تیۆلۆجیاوە و بێئەوەی پێمان وابێت قورئان ئاخاوتنێکە لەسەرەوە هاتووە، بەڵکو تەنها بریتییە لە رووداوێکی واقیعی وەکو فیزیا و بایۆلۆجیا کە زانایان قسەی لە بارەوە دەکەن. قورئان وەکو گوتارێکی تایبەتی دەردەکەوێت کە ماتریاڵ و بونیادی خۆی هەیە و دەشێت توێژەری زمانەوانی شێوازی تایبەتیی تیادا کەشف بکات لە شێوەگرتنی مانا و بەرهەمهێنانیدا. ئەوەی لێرەدا پێوەی خەریك دەبین بریتییە لە چۆنێتی شێوەگرتنی میکانیزمی بەرهەمهێنەری مانا لە قورئان و لە زمانی عەرەبیدا، هەروەها چۆنێتی ئیشکردن و بنجداکوتانی لە ئاگایی ملیۆنەها کەسدا تا دواتر بیرۆکەی ئیسلامی (یان ئیسلام) بەرهەم بهێنێت.

کەواتە لەمەدینەدا گروپێك پەیدابوون داکۆکییان لە چەمکی خەلافەتی شەرعی دەکرد، واتە خەلافەتێك لە بنەماکانیدا پەیوەستی خوێن و هەموو پەیوەندییە خێڵەکییەکان جێبهێڵێت، واتە خەلافەتێکی رێکخراو و پلەدار ئەگەر بشێت وا بڵێین، خەلافەتێکی ترانسندێنتالی (موتەعالی) نیشانەبێت بۆ خودای تاك و تەنیا کە بە چڕییەکی گەورەوە سەرانسەری گوتاری قورئانیی گرتۆتەوە.

ئەم گروپە –پێدەچێت ئەمە شتێکی سەیر بێت – بریتیە لە خێزانی پێغەمبەر، ئەو شەرعیەتەیش لە کەسایەتیی عەلیی ئامۆزای پێغەمبەر و هاوسەری فاتیمەی کچیدا بەرجەسستە دەبێت. ئەمە لە کەلەپوردا هاتووە. بەلام زەحمەتە بتوانین لە رووی مێژووییەوە ئەو چرکەساتە دیاری بکەین کە ئەو بیرانەی تیادا سەریهەڵداوە. چۆن ئەم بیرکردنەوانە گەشەیان کردووە و پاشان تەرکیزیان کردۆتە سەر بیرۆکەی خەلافەتی شەرعی کە بنەمایەکی رۆحی یان ئاینیی هەبێت. لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەمی کۆچیدا بیرۆکەی شەرعیەت، لە ژێر ناوی تیۆری شیعی بۆ خەلافەت، بونێکی تیۆریزەکراوو گەڵاڵەبونێکی پوختەی لە خۆ گرت. دواتر ئەم بیرۆکەیە، لە دژی ئەشکەنجەو چەوساندنەوەی

ئومەویی هاشمییەکاندا، پتر بنجی داکوتا. لە راستیدا ئەو چەوساندنەوەیە بەردەوام بە دوای لایەنگرانی عەلییەوە بوو کە پاشان دەبێت بە قەسابخانەیەکی ترسناک، لە مێژووی سوننەکاندا ئەو قەسابخانەیە بە بێدەنگی تێپەڕیوە یان با بڵێین بێدەنگییان لێکردووە. کەچی مێژووی شیعەکان قەبە و زلیان کردەوە بە جۆرێك هوشیارییەکی گەورەی ئەشکەنجەیان لەلادا دروست بوو. دەبێ جەغت لە گرەوی گەورەی ئەو رووداوانە بکەین، ئەمە گرەوێکی یەکلاکەرەوەیە بە پێوەری ئاگایی ئیسلامی کە چووەتە نێو ئەو مێژووەوە. یەکێ لە ئاکامەکانی ئەو قەسابخانە گەورەیەی بەسەر لایەنگرانی عەلیدا هات بریتی بوو لە لەنێوبردنی بیرۆکەی "ئیمامەت"، ئیمامیش میراتگری رۆحیی پێغەمبەرە. پاشان لابردنی تەواوی کۆمەڵێ گەواهی و شەهادات کە بایەخێکی زۆری هەبوو، بە تایبەتی ئەو شەهاداتانەی پەیوەستن بە قۆناغی یەکەمی دامەزراندنی ئیسلام، واتە ماوەی ئەو بیست ساڵەی کە پێغەمبەر تیایدا خەریکی تەبشیر و بانگەشە و فێربوون و سلوك بوو.

ئەقڵی پلانامێزی دەوڵەت، بە هەموو دڵڕەقی و توندوتیژیی بێڕەحمانەیەوە، بە گورزێکی قایم چەندین ئەزمون و شەهاداتی سڕییەوە کە بەهایەکی رۆحیی بێوێنەیان هەبوو. لەمەش خراپتر ئەو عەقڵە سیاسییە پلانگێڕییە بەپێی بەرژەوەندیی خۆی گەواهیی تری هێنا کە پەیوەست بوو بە پێکهاتەی قورئانەوە کە بووە مایەی چەندین دەرەنجامی ترسناك. چونکە ئەو پرۆسەیە بونیادی ئەقڵی و وێناکردنێکی وای پێکهێنا کە لەوساوە تا ئەمرۆکە کۆنترۆڵی ئاگایی ملیۆنان کەس لە خەڵك دەکات. ئەمە ئەو گرەوەیە کە لە دەوری سەرجەم چیرۆکی خەلافەتدایە، نابێت ئەم خاڵە گرنگە لەبیر خۆمان بەرینەوە.

بەمجۆرە دەبینین گرفتی خەلافەت لە چ چوارچێوەیەکدا رەهەندەکانی خۆی وەردەگرت. ئەو دەسەڵاتەیش کە لە سەدەی شانزەهەمدا لەسەر دەستی تورکەکاندا دەردەکەوێت (مەبەست لە سەڵتەنەتە) دەبێتە ترۆپکی کۆتایی ئەو زنجیرە سەرکێشییە سیاسییەی بریتی بوو لە خۆمەڵاسدانێکی بەردەوام بۆ دەسەڵات لەناو چوارچێوەی گوزارشتی "ئایینی"دا. بەمجۆرە رێکەوت وایهێنا کە دەسەڵاتی سیاسی دەست بەسەر دەسەڵاتی ئایینی "رۆحی"دا بگرێت بێئەوەی ئەم کارە لەسەر هیچ پایە و بنچینەیەك بوەستێت، یاخود بێئەوەی لەسەر هیچ تێکست و هیچ بیرێکی تیۆریی تیۆلۆجی وەستابێت. ئەگەر بە فیعلی لەوێدا ئاوێزانبونێك لە نێوان "رۆحی" و "زەمەنی"دا هەبوبێت، ئەوا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مێژووی خەلافەت لە رووی زەمەنییەوە دەچێتە ناو کەشوهەوای ئەقڵیی سەدەکانی ناوەڕاست کە چوارچێوە شوێنکاتییەکانی وێناکردن و تێگەیشتن و دەرککردن توانای ئەوەی نەبوو جیاوازی لە نێوان رۆحی و زەمنیدا بکات. ئێمە دەزانین ئەو جیاوازیکردنەی نێوان رۆحی و زەمەنی رۆژێ لە رۆژان بە تەواوی بەدی نەهاتووە و بەنێویەکداچوونی ئەم دوولایەنە تا ئێستاش بەردەوامە تەنانەت لە وڵاتێکی وەکو فەرەنسەشدا کە کەلەپورێکی دێرین و رەسەنی لە عەلمانییەتدا هەیە. تیۆلۆجیای رەسمیی ئیسلام شتێکی وای نەکردووە تەنها پێکهێنانی وێناکردنێکی پێشوەخت نەبێت لەسەر مەسەلەکان. لێرەدا گرەوی بنەڕەتیی بابەتی عەلمانییەت کۆدەبێتەوە، دەبێ هەموو وێناکردنە تیۆلۆجییەکان رەت بکرێنەوە بۆ

ئەوەی ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەکی سۆسیۆلۆجی — مێژوویی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت وەك ئێستا هەوڵی بۆ دەدەین.

بابگەڕێینەوە بۆ ئەو فیتنە گەورەیەی لە ساڵی 661ز روویدا و بووە مایەی لەدایکبونی چەند لقێکی جیاوازی ئیسلام، مەسەلەی دەسەڵات ئەو خاڵە تەوەرییە بوو کە مەسەلەکانی لە دەوردا یەکلا دەکرانەوە، هەر لەسەر ئەم پایەیەش ناکۆکییە کۆمەڵایەتی — ئاینییەکان پەرەیان دەسەند و بنجیان دادەکوتا.

پێویستە بەشێوەیەکی گشتی جیاوازی لە نێوان سێ ئاراستە یان سێ گروپدا بکەین، گروپی سەرەکی و بنەڕەتی ئەو گروپەیە کە بە "سوننی" ناودەبرێت و ئەمڕۆ بەشی زۆری موسڵمانان لە دەوریدا کۆبونەتەوە، ئەم گروپە بۆیە بەو ناوە ناونراوە چونکە پێی وایە "ئەرتەدۆکسییەت"ی بۆ خۆی مۆنۆپۆل کردووە، واتە سوننەیەك کە بە مانای کەلەپوری "هەقدار"ی پێغەمبەر دێت. ئەم ناولێنانە زاڵبون و باشتر بوونی سوننەکان بەسەر ئەوانیتردا لە خۆ دەگرێت. لە واقیعدا سونییەکان خۆیان ئەو ناوەیان داهێناو ناوی سوننەیان لە خۆیان ناوە لە پێناوی دوورخستنەوەی نەیارەکانیان و هەروەها بۆ ئەوەی پێشوەخت بێنرخیان بکەن. دەتوانین هەمان شت سەبارەت بە شیعەش بڵێین، ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا بە مانای ئەنسار یان لایەنگر دێت و ئەمە ئاماژەیە بۆ لایەنگرانی عەلی کە کۆ دەنگی "یان: ئیجماع" یان ڕەتکردەوە، کەواتە ئەمانە — وەك دواتر سوننەکان پێیان دەڵێن — ئەهلی ڕەتکردنەوەن. شیعەیش بەهەمان ڕێگە ڕەفتار لەگەڵ سوننەدا دەکات و بە هەمان شێواز وەڵامی دەداتەوە، چونکە ئەو ناوەی بۆ خۆیان هەڵیان بژاردووە دواتر ئەم مانایە لە خۆ دەگرێت: "ئەو کەسانەی قسەی ڕاست و بێهەڵە واژە دەکەن، ئەمانە بەشێوەیەکی تایبەتی دەچنە سەر ئاخاوتنی خودا و دادپەروەری" واتە (أهل العصمە و العدالە). لێرەدا جیاوازیی نێوان مانای ئەسڵی (یان: ئیتمۆلۆجی) و مانای ئایدیۆلۆجی (یان: تیۆلۆجی) لە هەردوو حاڵەتەکەدا دەردەکەوێت. بەڵام ناونانی شیعە بەو مانایە، لە فارسەوە تا بەغدا و لە سەرانسەری دونیای سوننیدا، سرڕایەوەو سانسۆرێکی وایان خستە سەر کە پشت بە ئایدیۆلۆجیای پاساو بۆ هێنانەوە دەبەستێت ئەوەی کە —وەك پێشتر وتمان— ئومەوییەکان دایانهێنا.

تا ئەمڕۆش مشتومڕی نێوان شیعە و سوننە هەر بەردەوامە، تا ئەمڕۆش بەهەمان شێوەی سەدەکانی ناوەڕاست ناکۆکیی نێوان شیعە و سوننە درێژەی هەیە[7].

ئاراستەی سێهەم یان گروپی سێهەم پێیان دەوترێ خەواریج (الخوارج)، سیفەتێکی سەلبیان بەم ناوە بەخشیوە و مانای زەندیقیان پێداوە. لە بۆچونی سوننەدا ئەم گروپە "ئەو کەسانەن لە ئوممە دەرچوونە و کۆمەڵی ئیسلامییان جێهێشتووە".

ئەم بارودۆخە بە ڕوونی لە کۆمەڵەی مورابیتەکان لە جەزائیردا دەبینین ئەوانەی "ئوممە"یان جێهێشت و لە سەدەی نۆیەمی زاینییەوە خۆیان نەفی کرد بەرەو قووڵایی بیابانەکان لە دووریی 600 کیلۆمەتر لە جەزائیری پایتەختدا. سەرجەمی جەزائیرییەکانیش ئەوان بە "هەراتیقە" دادەنێن. بەڵام ئەگەر لە دیدێکی مێژوویی و تەنانەت تیۆلۆجیشەوە سەیری مەسەلەکان بکەین، کێ دەتوانێت ئەمە بسەلمێنێت یان جەغتی لێبکات؟ ئێمە دەزانین وشەی "خەواریج" لەلایەن

ئەرتەدۆکسیزمی سوننیەوە لە مانا ئەسڵییەکەی لادراوە تا مانایەکی نێگەتیڤ وەربگرێت، واتە مانای جێهێشتنی ئیجماع و ئوممەی ئیسلامی لەخۆبگرێت. لە ڕاستیدا مانای ئەسڵیی (یان مانای بەدەوی)ی وشەی خەواریج بە فیعلی "دەرچوون" دەگەیەنێت، بەڵام نەك دەرچوون لە ئوممە بەڵکو دەرچوون بەرەو گۆڕەپانی جەنگ بۆ جیهادکردن لە پێناوی خودا. بەمجۆرە دەبینن مەسەلەکە زۆر جیاوازە.

ئەو نموونانەی پێشوو وێنەیەکی زەق و زیندووی ئەو شتەمان پێشکەش دەکەن کە ئێمە پێشتر بە مشتومڕی ئایدیۆلۆجی یاخود بە ئایدۆیۆلۆجیای پاساوبۆهێنانەوە ناومان برد. بەمجۆرە بۆمان دەردەکەوێت چۆن ئیسلامی ڕەسمی لەناو چەند سنورێکی دۆگمایی پتەودا خۆی داخست بە جۆرێك کە هیچ گفتوگۆیەك هەڵنەگرێت. هەروەها بە چەند ڕاستییەکی تیۆلۆجیی پەتی پاساویان بۆ هێنایەوە، کەچی لە ڕاستیدا مەسەلەکە بە تەواوی بەندە بە چەندین ململانێ و ناکۆکیی سۆسیۆلۆجی و کولتووری و هەروەها زەوتکردنی دەسەڵات و پرۆسیسەکردنی.

پێویستە ئەمڕۆ لەناوەوە ئەرتەدۆکسیەتی داخراو هەڵبوەشێنینەوە، ئەمەیش بە توێژینەوەیەکی مێژوویی ئازاد ئەنجام دەدرێت و دەشێت تەنها لەم ڕێگەیەوە بگەینە دەرگاکانی عەلمانیەت لە ئیسلامدا.

بەر لەوەی کۆتایی بەم کورتە باسە مێژووییە بهێنین، دەبێ ئاماژە بۆ سولالەی (نەژاد، وەچە)ی عەبباسی بکەین کە هەر لە ساڵی 750ز شوێنی ئومەوییەکانی گرتەوە و تا ساڵی 1258ز بەردەوام بوو. ناوی ئەم سولالەیە دەگەڕێتەوە بۆ (عەباس)ی مامی پێغەمبەر. بەمجۆرە خێزانی پێغەمبەر تۆڵەیان لە ئومەوییەکان کردەوە و دەسەڵاتی فەرمانڕەواییان گرتە دەست، بەڵام دەسەڵات گرتنە دەستی عەبباسییەکان زۆر لەو ڕێگەیە دەچێت کە پێشتر ئومەوییەکان پێڕەوییان کرد. عەبباسییەکان هەندێ ڕەگەزی تیۆری شیعییان بۆ ئایدیۆلۆجیەکەی خۆیان زیادکرد. بەڵام دواتر چەند نەتەوەو چەند کۆمەڵگایەکی تر درێژەیان بە فیکری ئیسلامی داو بڵاویان کردەوە بە جۆرێك سنورەکانی دوورگەی عەرەبیی جێهێشت. عەبباسیەکان لایەنگرانیان لە ئێراندا بە دەستهێناو پاشان لە دوای سەرکەوتن پایتەختیان گواستەوە بۆ بەغدا. ئەوسا ژیاری عەرەبی – ئیسلامی گەیشتە چڵەپۆپەی خۆی.

لە ساڵی 1258ز دا بەغدا لەلایەن مەغۆلەکان داگیر کراو ئەمە بووە مایەی کۆتایی پێهێنانی دەسەڵاتی خەلیفەکانی بەنی عەبباس. لە ڕاستیدا خەلافەتی عەبباسی هەر لە سەدەی نۆیەمی زاینییەوە تا ئەندازەیەکی گەورە شتێکی وەهمی بوو. دەسەڵات لەلایەن ژمارەیەك لە میران پرۆسیسە دەکرا و ئەمانە لە ڕێگەی هێزەوە گەیشتبوونە دەسەڵات. هەروەك پێشتریش هەمان شت ڕوویدا. دەسەڵاتی ئەمان هیچ پەیوەندییەکی بە چوارچێوەی ئیسلامیی دەسەڵاتەوە نەبوو یان هیچ پەیوەندییەکی بە تیۆری پاساو بۆ هێنانەوە نەبوو. ئەم دۆخە لە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامیی ئەو کاتەدا باو بوو، واتە لەو کۆمەڵگایانەی کە ئایینی ئیسلامییان بەسەردا پراکتیزە دەکرێت هەمان بارودۆخ دەبینین کە دەسەڵات لە ڕێگەی ئایینەوە پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە بەمجۆرە خەڵکی وەکو بەبەغا بەردەوام ئەو ڕستەیە دووپات دەکەنەوە کە ئیسلام ڕۆحی و زەمەنی لەگەڵ یەکدی تێکەڵ دەکات، یان گوایە ئیسلام بریتییە لەدین و دونیا.

ئەمە هەرگیز ڕاست نییەو لەڕووی زانستیشەوە قبوڵکراو نییە.

لە پاش مەغۆل، دوو شەپۆل لە تورکەکان دوابەدوای یەك دێن، شەپۆلی یەکەم لە سەدەی یانزەهەمی کۆچیدا لە ئاسیای ناوەڕاستەوە دێت، ئەمانە تورکە سەلجوقییەکانن کە لە بەرامبەر یەکەمین هەڵمەتی خاچپەرستەکاندا وەستان. پاشان لە سەدەی شانزەهەمدا شەپۆلی دووەم دێت کە بریتیین لە تورکە عوسمانییەکان، ئەمانیش لە بەرامبەر پەلاماری ڕوو لە زیادی خۆرئاواییەکان و مەغریب وەستان، بە تایبەتی کاتێك کە دەسەڵاتی عوسمانییەکان سەرانسەری باکوری ئەفریقیا دەگرێتەوە و بە ڕێگەیەکی سەربازی و بەپێی بارودۆخ لە میسرەوە تا مەغریب داگیر دەکەن.

سەبارەت بە مەغریب، چەندین سولالەی جیاجیا دەرکەوتن، لەسەروەختی کۆتایی دەسەڵاتی ئومەوییەکانەوە چەندین سولالە لە ڕێگەی هێزەوە دەرکەوتن و خۆیان سەپاند، سایان لە پێناوی خۆ دوورخستنەوە لە چەوساندنەوە بوبێت، یان لە پێناوی سەلماندنی شوناس و کەسایەتیی لۆکاڵیی خۆیان. بەمجۆرە ئیدریسییەکان لە مەغریب دەیانوت ئێمە سەر بە شەرعیەتی پێغەمبەرین. لە سەدەی یانزەهەمی زاینیشەوە هێزگەلێکی ناوچەیی خێڵەکی دەردەکەون و بە (بەربەر) دەناسرێن و ئەمانە سولالەی فەرمانڕەوایی نوێ لە فاس و مەراکیش و تلمسان و قەیرەوان دێننە بەرهەم. سەرجەمی ئەو سولالانە ئاماژە بۆ ئیسلام دەکەن و هەریەکەیان بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە پارێزگاری لە ئیسلام دەکەن بێگومان لە پێناوی چەسپاندنی ڕێسای حوکمکردن. بۆچی؟ چونکە ئیسلام بوو بەو مەرجەعەی هەردەبوو بۆ هەموو پاساوێکی سیاسی پەنای بۆ بەرن. بەڵام دەسەڵاتی ڕاستەقینەی ئەو سولالانە سنوری پایتەختەکانی تێنەپەڕاند تا سەرانسەری وڵات بگرێتەوە. بەم شێوەیە بیرۆکەی سولالەی فەرمانڕەوا بەناوی ئیسلامەوە لەو ناوچانەدا بنجی داکوتا. ئەمە بیرۆکەیەکی وەهمی بوو و لە ڕاستیدا هیچ بنەمایەکی نەبوو، بەڵام ئەمە ڕێی لەوە نەگرتووە کە تا ئەمڕۆش لە مەغریبدا بەردەوام بێت.

## تێکستی قورئانی:

### چۆنێتی کۆکردنەوەی و سەرلەنوێ خوێندنەوەی

پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ئەو خاڵە بنچینەییەی بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە کاری لە ڕەوتی ئەو ڕووداوانە کردووە کە دواتر ڕوویانداوە. بە پێی گێڕانەوەی ڕەسمی لە شێوە و جۆری شکڵگرتنی سورەتەکانی قورئان لە موسحەفدا کە لەلایەن سوننەو شیعەو هەمووانەوە دانی پێدانراوە و ڕاست و دروستیی ئەو شتە هەژموونی بەسەر هەمووانددا هەیە، پێغەمبەر بۆ ماوەی بیست ساڵ بە دوو ڕێگەی جیاواز قسەی کردووە. لە حاڵەتی یەکەمدا بەسیفەتی نێردراوی خودا ئاخاوتنی کردووە و هەڵگری ئەرکێکی بەپەلە بووە، بەرهەمی ئەمەش قورئان بوو. بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا خۆی وەکو ڕابەرێکی کارامە و لێزان قسەی کردووە و ئەو شتەی بەرهەمهێناوە کە بە فەرموودەی پێغەمبەر ناودەبرێت و فەرمودەکانیش ڕێنوێنییەکانی پێغەمبەر لە خۆ دەگرن. ئەو کاتەی کە پێغەمبەر سورەتێکی قورئانی دەگوازێتەوە، لەو کاتەدا ئەو ئامرازێکە بۆ گەیاندن و گواستنەوە بێئەوەی خۆی تەدەخول بکات، ئەو تەنها ئاخاوتنی خودا واژە دەکات، کەواتە ئەو قسەکەری ئاخاوتنی خودایە لە زمانی عەرەبیدا. لەو دەمەدا چەندین شایەت و هاوەڵ لە دەوریدا هەبوون، سورەتەکانیان یەك لە

دوای یەك لەبەركردبوو. كەلەپوری گواستراو پێمان دەڵێت لە هەندێ حاڵەتی دیاریكراودا هەندێ لە سورەتەكان دەمودەست لەسەر پێستی ئاژەڵ و گەڵای دار خورما و ئێسقاندا تۆمار كران، ئەم كارە بۆ ماوەی بیست ساڵ بەردەوام بوو.

لە دوای مەرگی پێغەمبەر، شتێكی سروشتی بوو مەسەلەی كۆكردنەوەی تەواوی ئەو سورەتانە بخرێتە ڕوو، چونكە سەردەمی "فەتح" دەستی پێكردبوو وهاوەڵانی پێغەمبەریش بەناوچە و وڵاتە جیاجیاكاندا بڵاو ببونەوە. یەكەمین خەلیفە ئەبوبەكر بیری لە كۆكردنەوەی زۆرترین ژمارەی سورەتەكان كردەوە بۆ نووسینەوە و پاراستنیان، پاشان یەكەمین موسحەف پێك هێنرا (موسحەفێكی سەرەتایی بوو)، ئەو موسحەفە سەرەتاییە لەلای عائیشەی كچی ئەبوبەكر و خێزانی پێغەمبەر دانرا. دواتر ئەوسورەتە قورئانییانە ڕاستەوخۆ لە شێوەی مشتومڕدا بەكارهێنران بە مەبەستی ململانێكردن لەسەر دەسەڵاتی سیاسیدا. ئەم شتانە لەو كەلەپورە گواستراوەیەوە هەڵدەهێنجێنین كە دزەیان كردووەو دەماودەم گواستراونەتەوە ئەگەرچی سانسۆرێكی توند بەسەر كەلەپوردا هەبوو.

خەلیفەی سێیەم عوسمانی كوڕی عەففان (كە یەكێك بوو لە ئەندامانی ئەو خێزانەی دژی خێزانی پێغەمبەر بوو) دوا بڕیار وەردەگرێت بە كۆكردنەوەی بەشە جیاجیاكانی سورەتەكان كە پێشتر نووسرابوونەوە، هەروەها كۆكردنەوەی قسە و گەواهی زارەكیی هاوەڵە سەرەتاییەكانی پێغەمبەر. لە ساڵی 656ز دا ئەم كۆكردنەوەیە بووە مایەی پێكهێنانی تێكستی تەواوكراو كە بۆ دواجار بەسەر هەمووواندا سەپێنرا بە سیفەتی موسحەفێكی ڕاست و دروستی سەرجەم ئاخاوتنی خودا بەو شێوەیەی بە سروش بۆ پێغەمبەر دابەزیوە.

خەلیفەكانی دواتریش هەموو گەواهییەكی تریان ڕەتكردەوە و هەموو گێڕانەوە و بۆچوونێكی تریان خستە دواوە كە دەیانویست ڕاستگۆیی خۆیان بسەلمێنن، ئەمەیش بووە هۆی مەحاڵبوونی هەرچەشنە دەستكارییەك بەسەر ئەو تێكستەی لە ژێر سایەی عوسماندا پێكهێنرا.

ئەمە گێڕانەوەی كەلەپورە، ئەمە ئەو گێڕانەوەیەیە كە ئەمڕۆ هەڵوێستی گشتیی ئیسلام دەنوێنێت و هێزێكی جێگیری وای هەیە كە دەستی لێنادرێت و گفتوگۆی لەسەر ناكرێت. ئێستا با جارێكی تر ئەو گێڕانەوەیە دابڕێژینەوە: سەرجەم ئاخاوتنی خودا كە بە سروش بۆ موحەممەد هاتووە، بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزییەكی تەواوەوە گواستراوەتەوە، پاشان بە نووسین لە موسحەفدا و لە زەمەنی عوسماندا پارێزراوە، واتە بە بیست ساڵ پاش مەرگی پێغەمبەر دەست بە نووسین و كۆكردنەوە و پاراستنی كرا.

ئەمە ئەو كاتیگۆرییە ڕەسمییەیە هیچ بەشەرێك بۆی نییە بە قەدەر زەڕڕەیەك گومانی لێبكات، موسڵمانانیش پێویستیان بە ئامێرێكی ئاینیی باڵا نییە تا ئەو كاتیگۆرییەیان بۆ بپارێزێت، بەڵكو ئەوەندە بەسە كە ئاگاییەكی گەورەی جەماعی "ئاگایی كۆ" نوێنەرایەتیی دەكات و كۆدەنگی ئوممەی بەسە، مەبەستم ئەو "ئیجماعی ئوممە"یە كە لە چوار سەدەی یەكەمی كۆچیدا شێوەی گرتووە تا دواتر ببێت بە ڕاستییەكی ڕەها. ئەم كۆدەنگییە (واتە كۆدەنگیی ئوممە بە سوننە و شیعەوە) بە ئەندازەیەك بەهێزە كە ئەگەر كەسێك ڕووبەڕووی ببێتەوە ئەوا خۆی دوچاری سزایەكی جەستەیی كۆمەڵایەتی دەكات. لێرەدا گرفتە گەورەكە كۆدەبێتەوە. مەسەلەكە مەسەلەی ئازادی یان دۆگمایەكی تایبەت نییە بە ئیسلام، نەخێر،

بەڵکو بریتییە لە گرفتی چۆنێتی ئیشکردنی میکانیزمی سەرجەم کۆمەڵگایەک. تەنانەت سەرکردە سیاسییەکانیش ئەگەر هوشیارییان بەرامبەر بەو مەسەلەیەش هەبێت ناتوانن شتێك بکەن، چونکە ئەگەر گومانیان خستە سەر ئەو کاتیگۆرییە ڕەهایانە، ئەوا پلە و شوێنگەی رابەرایەتییان هەر چییەك بێت سزای جەماوەریان بەردەکەوێت.

لێرەدا دەتوانین تێبگەین وشەی کۆمەڵگە مانای چییە و ئەو وشەیە چ هێز و جەبەروتێك دەنوێنێت، ئەو کۆمەڵگایەی تەنها بەیەك تاکە گوتاری دیاریکراو قسە دەکات و پاشان سنورێك دادەنێت هیچ بەشەرێك بۆی نییە ئەو سنورە ببەزێنێت. لە حاڵەتی ئێستادا چۆن دەشێت ئەم مەسەلەیە راڤە بکرێت؟

بێگومان دەکرێ ئاماژە بۆ ئەو دۆخە سەختە بکەین کە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان سەدەیەك زیاترە لە ڕووبەڕووبونەوەی خۆرئاوادا دەژین. بەڵام ئەم دۆخە وەك دەزانن بووە بە جۆرێك لە هەنجەت و پاساو بۆ هێنانەوە. لەم حاڵەتەشدا ئیسلام چەشنێك لە "پەناگە" و دەریچە دەنوێنێت بۆ ئەو کۆمەڵگە ئیسلامییانەی دەیانەوێت، لە ڕووبەڕووبونەوەی خۆرئاوای نویَ و خاوەن هێزێکی گەورەی تێکنۆلۆجی و ژیاری، پارێزگاری لە شوناسی خۆیان بکەن. بەڵام ئەگەر موسوڵمانەکان ئەو پەناگەیەیان لە دەست دا، لێرەدا هیچ فاکتەرێکی هاندان و وروژێنەری حەماسی جەماوەر و جەستەی کۆمەڵایەتی وەك گشتێك، نامێنێت. لەبەرئەو هۆیە دەبینین رۆشنبیرانی موسڵمان سانسۆر دەخەنە سەرخۆیان و ناچنە ناو ئەو مەسەلە گرنگ و هەستیارانەوە کە پێیان وایە هێشتا کاتی نەهاتووە. ئەوان پێیان وایە چارەسەری مێژوویی ڕەخنەگرانە وەك ئەوەی ئێمە ئەنجامی دەدەین، هاوکاریی کۆمەڵایەتی تێکدەدات و لێکدیی هەڵدەوەشێنێتەوە و ئەمەیش دەبێتە مایەی دروستبونی کاردانەوەیەکی توند لەلایەن کۆمەڵگاوە کە بە توندوتیژی وەڵامی هەر چەشنە هەوڵێکی لەو جۆرە دەداتەوە. ئەمە ئەو دۆخەیە ئەمڕۆ تیایدا دەژین. ئەمە وەك دەبینن دۆخێکی مخابنە بەڵام هاوکات بەرچاو و واقیعیشە.

بەڵام لە هەموو ئەوانەی پێشتر باسم کردون نابێت وا تێبگەن کە لە ئیسلامدا هیچ ئۆپۆزیسیۆنێکی ناوخۆیی بوونی نەبووە وەك ئەوەی لە سەرەتای چەرخی رێنیسانس لە ئەوروپا روویدا. لە واقیعدا لە سەدەکانی یەکەمی کۆچیدا چەندین ئۆپۆزیسیۆن و نارەزایی سەریانهەڵدا تاگەیشتە مەسەلەی شکڵگرتنی تێکستی قورئانی. بۆ نموونە لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا دەسەڵاتی عەبباسی ئیدانەی دوو قازیی کرد لەبەرئەوەی نارەزاییان لەسەر هەندێ لە خوێندنەوەکانی تێکستی ڕەسمی (واتە قورئان) دەربڕی، تەنها لەسەر هەندێ جۆری خوێندنەوە. هەروەها دەبێ ئاماژە بۆ ئەو بزوتنەوە فەلسەفییانەیش بکەین کە مەیلێکی ڕەخنەگرانەیان هەبوو، هەروەها سەرجەمی ئەو بزاوتانەی بە زەندیق ناوبران و دەسەڵاتی ڕەسمیش بە وردی چاودێریی دەکردن و هەندێجاریش ئەگەر پێویستی بکردایە دەیکوشتن، ئەمە هەروەکو لەو سەروەختەدا کەنیسەی مەسیحیش هەمان شتی لە بەرامبەر ئۆپۆزیسیۆنەکانی خۆیدا دەکرد.

پرۆتیستۆو بزووتنەوەکانی نارەزایی هەر لە سەدەی دوانزەهەمی زاینییەوە وردە وردە لەسەر خاکی ئیسلامدا بەرەو لاوازی دەچوو، تادواتر بۆیەکجاری ونبوو و هەموو دەنگێکی نارازی

دەخنكێنرا. كەسانی بیانی لەمەدا دیاردەیەكی دۆگمایی تایبەت بە ئیسلام دەبینن و پێیانوایە ئیسلام هەرگیز ڕێگە بە بیری ئازاد نادات و.. هتد. هەندێ كەس تا ئەمڕۆش ئەو قسەیە دووپات دەكەنەوە. جابۆئەوەی وەڵامی ئەو شتانە بدەینەوە، پێویستە بەباشی چاودێریی ئەو ڕووداوانە بكەین كە بە فیعلی لەسەر زەمینی ئەو كۆمەڵگایانەدا ڕوویانداوە كە بە كۆمەڵگەی ئیسلامی وەسفكراون.

لە ڕاستیدا، هەر لە سەرەتای سەدەی دوانزەهەمی زاینییەوە زۆر شت گۆڕانكارییان بەسەرداهات، بۆ نموونە بەهۆی جەنگە خاچپەرستییەكانەوە هێڵە گەورەكانی بازرگانی و ئابووری لە ناوچەی ئیسلامی ناوەند گواسترایەوە، دواتر ترسناكیی ئەو حاڵەت و ئەو دۆخە زیادی كرد. پاشان ڕۆڵی مەغۆل و توركەكان هاتە ئاراوە كە ئەمانە نوێنەری ئیسلامێكی بەدەوی بوون و زۆر بە توندی فشاریان دەخستە سەر ئیسلامی مەدەنی كە گەیشتبووە ئاستی ئەرستۆكراتی. لەو سەروبەندەدا دەسەڵاتی خەلیفایەتی دوچاری لەرزین بوو. بەمجۆرە لە پڕێكدا دنیای لادێی بەدەوی لە خەو هەستا كە پێشتر كۆیلەكراو و فەرامۆشكراو بوون، ئەمانە گەڕانەوە بۆ نێو بەها دێرین و هەمیشە زیندووەكەیان، ئەو بەهاو نەریتانەی پێش ئیسلام هەبوون. باشە لە دۆخێكی وادا، چۆن نارەزایی و پرۆتیستۆ لە بەرامبەر تێكستی قورئانیی ڕەسمیدا سەرهەڵدەدات؟ مەسەلەیەكی تیۆلۆجیی لەو چەشنە دەبێتە جێی بایەخی ژمارەیەكی زۆركەمی زانایان. بەمجۆرە وەك وتمان هەر لە سەدەی دوانزەهەمی زاینییەوە گەڕانەوەیەك بەرەو ئیسلامی لادێی دەستی پێكرد كە ڕێگە نادات هیچ چەشنە گرفت و كێشەیەكی لەو جۆرە بخرێتە ڕوو.

ماوەیەكی كەمە خستنە ڕووی ئەم كێشەیە دەستی پێكردووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی خوێندن و ڕۆیشتنی هەزاران گەنج بەرەو زانكۆكان، ئەو گەنجانە فێر دەبن و دەگەڕێن و پرسیار دەكەن و ڕووبەڕووی هەموو ئەو گرفتانەش دەبنەوە كە لە چوار سەدەی یەكەمی كۆچیدا هەبوون. كاتێكیش بە دوای وەڵامی راستەقینەی ئەو گرفتانەدا دەگەێن، بۆشاییەكی تیۆری دەبینن یاخود بەر بۆشاییەكی تیۆریی سەرجەمگیر و قووڵ دەكەون. لە واقیعدا هەر لە سەدەی دوانزەهەمی زاینییەوە تا ئەمڕۆ هیچ شتێك لەم ئاستەدا ئەنجام نەدراوە. كاتێكیش موسوڵمانێكی هاوچەرخ بیەوێت لە بیرۆكەیەك یان لە گرفتێكی لەو چەشنە بكۆڵێتەوە، ناچار دەبێت بگەڕێتەوە بۆ ئەو كتێبانەی لە سەدەی هەشتەم و نۆیەمی زاینی (چوارەم و پێنجەمی كۆچی) نووسراون! ئەمە بارودۆخی باوو بڵاوی ئەمڕۆیە.

پێویستە لەو بارودۆخە باسكراوەدا سەرجەم مەسەلە تیۆلۆجییە ئیسلامییەكان بخرێنەڕوو، ئەوسا ئەمە لە كەشوهەوایەكی زۆر جیاواز لە كەشوهەوای ئیسلامی كلاسیكی و كەشوهەوای ڕۆشنبیریی نوێ دەخرێتە ڕوو. دەبێ بەر لە هەر بەرخوردێكی نوێ لە بارەی تیۆلۆجیای ئیسلامی، ڕەخنە لە مۆدێرنە بگرین، چونكە مۆدێرنە هەموو شتێك لە هەناوی خۆیدا هەڵدەگرێت، بۆیە دەبێت بەر لە بەكارهێنانی، ڕەخنەی لێبگرین و بیپشكنین.

با ئێستا ئەو ئەركە بەپەلانە بەبیر بهێنینەوە كە هەر پێداچونەوەیەكی ڕەخنەیی بۆ تێكستی قورئانی پێویستی پێیەتی. دەبێ یەكەمجار بەشێوەیەكی جیدی جارێكی تر چیرۆكی شكڵگرتنی ئەو تێكستە بنووسینەوە، واتە ڕەخنەیەكی ڕەگوڕیشەیی لەو چیرۆكە ڕەسمییەی

شێوەگرتنی تێکستی قورئانی بگرین کە کەلەپوری گواستراو جێگیری کردووە. بۆ ئەمەش دەبێ بگەڕێینەوە بۆ هەموو ئەو دۆکیومێنتە مێژووییانەی بەشێوەیەك لە شێوەکان پێمان گەیشتون سا ئەو دۆکیومێنتانە بنەمایەکی شیعییان هەبێت یان خارجی یاخود سوننی. بەم شێوەیە ئێمە خۆمان لەلایەنگری هەر تیۆلۆجیایەك لە دژی تیۆلۆجیایەکی تر دوور دەخەینەوە. گرنگ ئەوەیە تەئکید لە راست و دروستیی دۆکیومێنتە بەکارهێنراوەکان بکرێت. دوای ئەوسا نەك تەنها ڕووبەڕووی مەسەلەی سەرلەنوێ خوێندنەوەی دۆکیومێنتەکان دەبینەوە، بەڵکو دەچینە ناو گەڕان بەدوای دۆکیومێنتی دیکە کە مومکینە بوونیان هەبێت، وەکو دۆکیومێنتەکانی دەریای مردوو کە لەم ماوەیەدا دۆزرانەوە. هەروەها شتێکی سوودبەخشیشە بەناو کتێبخانە زۆر تایبەتییەکاندا بگەڕێین وەك کتێبخانەی دروزەکانی سوریا یان ئیسماعیلییەکانی هیند یان زەیدییەکانی یەمەن یان عەلەوییەکانی مەغریب. لەوێدا لەو کتێبخانە دوورە دەستانەدا چەندین دۆکیومێنتی نووستوو و قەدەغەکراو هەن کە بە قفڵی گەورە داخراون. بەڵام بێگومان ئەوانە لە هەموو حاڵەتێکدا بە چاکی پارێزراون.

بەمجۆرە خۆمان لە بەردەم کارێکی قەبەی توێژینەوە و ساغکردنەوەی تێکستەکاندا دەبینین کە دواتریش خوێندنەوەیەکی سیمیۆلۆژیی زمانەوایی بۆ تێکستی قورئان ئەنجام دەدرێت، ئەمە بەسەر ئینجیل و تەوراتیشدا هاتووە. میتۆدی زمانەوانی، سەرەڕای شێوازە ئاڵۆز و قورسەکەی، دەتوانێت لەو هەستیارییە تەقلیدییە ڕزگارمان بکات کە پەیوەندیی سایکۆلۆجیانەی ئێمەی بەو تێکستانەوە، کۆنترۆڵ کردووە. واتە لە پەیوەندیی سایکۆلۆجیی ئێمە بە تێکستەکانەوە کە هەر لە منداڵییەوە تیاماندا بنجی بەستووە، ڕزگارمان دەبێت. ئەوسا دەتوانین پەیوەندییەکی سروشتی لەگەڵ ئەو تێکستانەدا دروست بکەین و ئەمەیش وامان لێدەکات بتوانین بە ئازادی لێی وردبینەوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەین.

## دەرکەوتنی عەلمانییەت و پێداگرتنی

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کەمێك لە چەمکی عەلمانییەت قوڵ بینەوە، ئەو چەمکەی بە درێژایی قسەکانمان ناومان هێنا بەڵام بەبێ پشکنین و ئارگۆمێنت. ئەمە ڕێگەمان بۆ خۆشدەکات بە تەواوی لەو نمایشە مێژووییەی پێشوو تێبگەین کە دەمانباتە سەر خستنە ڕووی پرۆسەی عەلمانیکردن لە ئیسلامدا.

بەپێی ئیتمۆلۆجیا (زانستی ئەسڵی وشەکان) وشەی *Laicos*ی یۆنانی بە واتای گەل یان میللەت دێ وەکو گشتێك جگە لە پیاوانی ئایین، واتە دوور لە دەستێوەردانی ئەوان لە ژیانی میللەت. لەلاتینی سەدەی سیانزەهەمیشدا دەبینین وشەی *Laicos* واتە ژیانی مەدەنی وەك ئەوەی ئەوسا بەکاریاندەهێنا، ئەم مانایە لە یۆنانەوە تا لاتین لە سەدەکانی ناوەڕاست درێژدەبێتەوە. بەمجۆرە جیاوازییەك دروست دەبێت لە نێوان میللەت کە بە هەموو پێدراوەکانیەوە ژیانی تایبەتیی خۆی دەژیا و لە نێوان پیاوانی ئایین کە دەست وەردەدەنە نێو ژیانی خەڵکی بۆ ئەوەی بەشێوەیەك لە شێوەکان زەبتی بکەن *regular*. با ئەم مەسەلانە چاکتر روون بکەینەوە: میللەت لەناوەندی گریکی یان لاتینیی سەدەکانی ناوەڕاستی خۆرئاواییدا، لە بنەڕەتدا لە دنیای کشتوکاڵی و نێوەندی پیشە دەستییەکان و خەڵکانی ئاسایی لە شارەکاندا پێك دێت. لە

واقیعدا ئەو خەڵکانە لە خزمەتی پیاوانی ئایین — ئەکلیرۆس— دا بوون. مەبەستمان لە پیاوانی ئایین ئەو کەسانەیە کە دەسەڵاتێکی دیاریکراویان هەبوو سا دەسەڵاتی سیاسی بێت یان ئایینی یاخود ئابووری.

کەواتە لێرەدا دژایەتییەك هەیە لە نێوان ژمارەیەکی گەورەی خەڵك کە نووسین بەکارناهێنن بەڵام کولتورێکی زارەکییان هەیە، و لە نێوان کەمایەتییەك کە بە شێوەیەکی ڕێك نووسین بەکاردەهێنێت. ئەم نووسینەیە وا دەکات پیاوانی ئایین دەسەڵاتێکی راستەقینەیان هەبێت، واتە دەسەڵاتی هەژمونگەرایی و دەستوەردان لە ژیانی میللەت. نووسین لەو سەروەختەدا بە تەنها مانای توانای نووسینی نەدەگەیاند، بە تەنها ئیمتیازێکی کولتوریش نەبوو، بەڵکو ڕەهەندێکی سیحری و ئایینی و پیرۆزیشی لە خۆ گرتبوو. کەواتە پیاوی ئایین هێزێکی قەبە و گەورەی دەنواند کە تەنها بریتی نەبوو لە گەمەی نووسین، بەڵکو ئەو سنورەیشی تێدەپەڕاند بەوەی هەندێجار دەیتوانی شفا بۆ نەخۆش بهێنێت و هەندێجاری تریش دەیتوانی نەخۆش بمرێنێت، دەیتوانی پیرۆزی بخاتە بەر کەسانی دی یاخود پیرۆزییان لەبەر دابماڵێ هەروەکو ئەمە لە چوارچێوەی مەسیحییەتدا ڕوویداوە.

کاتێك شیکردنەوەکەمان بەو ئاراستەیە قووڵ دەکەینەوە، ڕووندەبێتەوە ئەو جیاوازییەی کە مانای ئەسڵی سۆسیۆلۆجی — زمانەوانیی لە نێوان گەل و پیاوانی ئایین دەریدەخات، جیاوازییەکە بەندە بە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و کولتووری و دەروونی. ئەو ململانێیە ڕەهەندێکی سیحریشی لەخۆ گرتبوو. لە ڕاستیدا لەو کاتەدا سنورێکی ڕوون لە نێوان پیرۆزی و سیحری و ئایینیدا نەبوو. جا بۆ ئەوەی بە دوای بنەما و سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئەو شتەدا بچین کە ئەمڕۆ بە "عەلمانیکردن" ناوی دەبەین، پێویستە ڕوانگە لە کۆمەڵێك لەو ڕووداوە بەدواییەکدا هاتوانە بگرین کە لەسەر زەویی کۆمەڵگە بەشەرییەکاندا ڕوویداوە، پاشان ڕوانگەی ئەو پەیوەندییە بەنێویەکداچوانەی نێوان گەل و پیاوانی ئایین بگرین کە بە پێویست چینێکی کەمینەن. گەل لە هەموو چرکەساتێکدا پشتی بەو چینە تایبەتییەی پیاوانی ئایین دەبەست، واتە هەر لە منداڵییەوە (بە تەعمید کردن یان بە خەتەنەکردن) تا خوێندن و فێربوون و ژنهێنان و شووکردن و تا مردن لە هەموو شتێکدا دەگەڕانەوە بۆ لای ئەو کەمینەیە. سەرجەم ئەو چرکەساتە بنچینەییانەی ژیان هەڵگری سیمایەك بوو کە چینی پیاوانی ئایین بە ئەندازەیەکی گەورە دەستیان لە ژیانی میللەت وەردەدا.

ئەگەر لەم تێڕوانینە بەرفراوانەوە سەیری مەسەلەکان بکەین، بە ڕوونی دەردەکەوێت سەرهەڵدانی ئەو شتەی کە ئەمڕۆ بە عەلمانییەت ناوی دەبەین دەسنیشانکردن و وەسفکردنی کارێکی زەحمەتە. لێرەدا گرەوەکە مەسەلەی سەرهەڵدانی ئەقلانییەت لە خۆرئاوادا و هەموو ئەو ململانێیەی لە نێوان "ئەقڵ" و "ئیمان"دا ڕوویداوە تێدەپەڕێنێت. واتە ئەم کێشەیە زۆر لەوە ئاڵۆزتر و فراوانتریشە. ئەو پەیوەندییەی میللەت بە چینی پیاوانی ئایین گرێ دەدات لەسەرجەم کۆمەڵگە بەشەرییەکاندا هەیە. دەشێت هۆکاری بەردەوامبوونی ئەو پەیوەندییە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مەسەلەکان بە تەواوی لەبەرژەوەندیی ئەقلانییەتدا یەکلانەبۆتەوە تەنانەت لە وڵاتە پێشکەوتووەکانیشدا.

پێویستە ئەو بوونە (یان ئەو کەینونەیە) بپشکنین کە ئەو پەیوەندییانە تیایدا دەژین و گەشە دەکەن کە عەلمنانییەت بە ئاینەوە دەبەستێتەوە. دەمودەست تێبینی ئەوە دەکەین ئەم دوو زاراوە دژ بەیەکە (ئایین – عەلمانیکردن) بەس نین بۆ شەرحکردنی بابەتەکە، ئێمە بۆیە ئەو دوو زاراوەیە بەکاردێنین چونکە تا ئێستا جگە لەمانە شتی دیکە لەبەردەستدا نین. لە راستیدا ئێمە کارەکە سادە دەکەینەوە ئەگەر ئەم کێشەیە یاخود ئەو هەموو مشتومڕ و گفتوگۆیە تەنها لەوەدا کورت بکەینەوە کە گوایە بریتییە لە ململانێی نێوان دوو تیۆلۆجیا، یەکێکیان داکۆکی لە ئایین و پیرۆزکردن دەکات و ئەویتریان بریتییە لە پیاوانی زانست و ئەقلانییەکان یاخود بیریارە ئازادەکان کە داکۆکی لەسەربەخۆیی ئەقڵ دەکەن. دیارە ئەم کێبەرکێ تیۆرسازییە هەمیشە ئامادەیە و بێگومان گرنگیشە، بەلام ئەگەر تەنها لەم چوارچێوەیەدا بیهێڵینەوە، ئەوا مەسەلەکە کورت دەکەینەوە. پێویستە شیکردنەوەکەمان زۆر زیاتر قووڵ بکەینەوە.

لە ڕاستیدا، لە مرۆڤدا کۆمەڵێ ئاتاج و پاڵنەری هاوزەمەن دەبینین – کە ئەمەش خاسیەتێکی ئەنترۆپۆلۆجییە – بە گشتی بە دوو ئاراستەی بنچینەیی و پێکەوە بەستراو دەڕوات. ئاراستەی یەکەم بریتییە لە مەرتەبەی ئارەزوو *Instance du desir* لەتەك هەموو ئەو هێزانەی پاشکۆی ئەو ئارەزووەن. ئەم هێزە فەردی و مێژووییانەیش هێزگەلێکی تاریکن و ئەستەمە وەسف بکرێن و شیبکرێنەوە. بەلام تەنها شیکردنەوەی دەروونی – سەرەڕای جیاوازی و ناکۆکیی قوتابخانەکانی – دەتوانێت لایەکی بگرێت و شییبکاتەوە. ئەم ئارەزووە، ئارەزووە لە خوداو هەموو ئەو هێزانەی بەردێژایی مێژوو هێناویەتییە ئاراوە تا دەگاتە ئارەزوویەکی سادەی وەکو منداڵ خستنەوە و دەوڵەمەندبوون و هەژمونداری. لە ڕاستیدا ئێمە ئەم رەهەندە بەشەرییە (ڕەهەندی ئارەزوو) زۆر کورت دەکەینەوە و دەیخەینە ناو بازنەی ئاینییەوە کە ئەمەش لە ئەنجامی فێڵزانی و قۆرخکردنی پیاوانی ئاینییەوە ئەنجام دراوە. ئێمە لەم حاڵەتەدا توێژینەوەکەمان دەشێوێنین و تەنها لە خاڵێکدا کورتی دەکەینەوە کە دژایەتیکردنی ئاینە بەعەلمانیەت، ئەمەش واتە ئێمە هیچ شتێك لەو شتانە تێنەگەیشتووین کە ڕوویانداوە و تا ئێستاش لە مێژووی ئەمڕۆماندا روودەدات.

ئاراستەی دووەم یاخود رەهەندی دووەم کە مرۆڤی پێ جیادەکرێتەوە، بریتییە لە پێداگرتنی لە تێگەیشتن و دەرککردن یاخود ئاقڵبون (التعقل) *Lexigence de Iintelligibilite*، ئەم پێداگرتن و ئاتاجە لە تێگەیشتن لە قوولایی ناخی مرۆڤدا جێگیرە. لە هەموو سەردەمەکاندا مەسەلەکان بەو شێوەیە بوون. بەلام لە مێژوودا روویداوە کە ئەم پێداگرتنە لەسەر تێگەیشتن دوچاری بەرگری بۆتەوە و لە ڕێگەی راستی خۆی لادراوە. هەموو ئەو شتانەی پێشتر لە بارەی ئایدیۆلۆجیای پاساو بۆهێنانەوە لە ئیسلامدا باسمان کرد و هەروەها هەموو چیرۆکەکانمان وەك مەسیحی و وەك موسڵمانیش ئەو شتە دەسەلمێنن کە دەسنیشانم کرد. لە رابردوودا چەندین پرۆسەی شێواندن (تەحریفکردن) روویداوە، شێواندن و تەحریفکردنی واقیع تا ئەو سنورەی مرۆۋ ناچار بووە لە پێناوی بەدەستهێنانی ماف خۆی لە مەعریفە و تێگەیشتن، تێبکۆشێت. لە نێو ئەم هێڵەی تێکۆشاندا لە پێناوی تێگەیشتن لە شتەکان، مێژووی عەلمانیەت دەچێتە نێو هەمان هێڵەوە. ئەو بەکارهێنانەی لە فەرەنسەدا وشەی عەلمانییەت هەیەتی، زۆر لەوە لاوازترە کە لە واقیعدا هەیە، واتە

له چاو ئەو رەهەندە ئەنترۆپۆلۆجییە زۆر بەرینەی وشەی عەلمانییەت هەیەتی و ئێمە بە "زەرورەتی تێگەیشتن و پێداگرتن لەسەر کەشفکردن و ناسینی قولآیی شتەکان" ناوی دەبەین.

بەلآم پێداگرتن لە تێگەیشتن و ئارەزووکردن لە دۆزینەوە، بەر هەموو دەرکەوتنەکانی "ئارەزوو" دەکەوێت، پێویستە "پێداگرتن لە تێگەیشتن" رێگەی خۆی بکاتەوە و جەخت لە خۆی بکات. لەم ئاستەشدا دەبیٚ ئەو "شلّەژانە ناوەکییە"ی لە مرۆڤدا هەیە دیاری بکرێت سا ئەو مرۆڤە سەر بە هەر ناوەندێکی کولتوری بێت. دەشێت شلّەژانی ناوەکی بە پلە و شێوازی کولتوریی جیاجیا بوونی هەبێت. لە نێو ئەم تێڕوانینەشدا بۆ شتەکان ئەوە روون دەبێتەوە کە عەلمانییەت لە ئەزموونی مێژوویی هەموو گروپێکی بەشەریدا ئامادەیە تەنانەت ئەگەر لە شێوەیەکی لاوازیشدا دەرکەوتبێت. بەلآم بۆی هەیە هێزەکانی "ئارەزوو" لە چرکەساتێکی مێژوودا و لە نێوەندێکی کولتوریی دیاریکراودا بە تەواوی "پێداگرتن لەسەر تێگەیشتن" لەلای مرۆڤ نەهێلّێت و ئەوسا ئەو مرۆڤە ناتوانێت گوزارشت لە خۆی بکات، بەلآم دەشێت ئەم حالّەتەیش گۆڕانی بەسەردا بێت چونکە هیچ شتێك نییە تا کۆتایی داخراو بێت.

پێدەچێت ئەم نمایشکردنەی ئێمە بۆ مەسەلەکان تایبەت بێت بە حالّەتی ئیسلامی، لە ڕاستیدا ئەمە لە مۆدێلی خۆرئاوایشەوە وەرگیراوە. سرووش لە شێوەی سیستمێکی مەعریفیی هەژموندااردا بنجی داکوتاوە، لێرەدا سرووش لەلایەن خوداوە هاتووە، کەواتە شتێکی ڕاست و کاملّە و شوێنی قسەلەسەر کردن و گفتوگۆ نییە. تەنها یەك شتی پێویستە ئەویش: دەمودەست بڕوای پیٚ بکرێت و پراکتیك بکرێت. لە مێژوودا خەلّکی ئەو "سیستمە مەعریفی"یەیان هەرس کردووە و بەشێوەیەکی ئەرتەدۆکسیی پتەو تەفسیریان بۆ کردووە و پاشان لە زەویی واقیعدا بەزۆرەملیٚ جێبەجیٚ کراوە. بەمجۆرە هەموو مەرجێکی گونجاو دەستەبەر کرا بۆ لەناوبردنی "پێداگرتن لەسەر تێگەیشتن"، یان لانیکەم بۆ جلّەوگرتنی ئەو پێداگرتنە و پاشان دیلکردنی لە سنورێکی بەرتەسکدا. بەلآم ئێمە دەزانین ئەم جلّەو گرتن و سانسۆرە چ مانایەکی هەیە، بۆیە تێبینیی ئەوە دەکەین کە لێرەدا پێداویستییەکی بەردەوام بۆ خەبات کردن هەیە لە پێناوی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی رێژەیی فیکر، مەبەستم لە سەربەخۆیی رێژەیی ئەو سەربەخۆییە فیکرییەیە لە بەرامبەر باوەڕی دۆگمای ئایینییدا وەستاوە. ئەمەش دوورە لەوەی کە لە حالّەتی ئیسلامدا جێبەجیٚ بوبێت و هەندێجاریش لە حالّەتی مەسیحیشدا هەر بەو شێوەیەیە. کەواتە عەلمانییەت ئامانجێکی هەمیشەییە و دەبیٚ بەردەوام تازە بکرێتەوە.

بەلآم لێرەدا دەبیٚ وریا بین، نابێت عەلمانییەتیش بکرێت بە عەقیدەیەکی ئایدیۆلۆجی کە ئازادیی فیکر سنوردار بکات وەك چۆن ئایینەکان ئەمە دەکەن. عەلمانییەتی خەباتگێڕی یاخود عەلمانییەتی توندڕەو کە لە خۆرئاوادا لە دژی پیاوانی ئایین بوو، بەو ئاراستەیە هەنگاوی ناوە. ئێمە دژی ئەم جۆرە هەلّوێستەین هەروەك چۆن دژی هەلّوێستی ئایینین لە خنکاندنی ئازادیی فیکر.

وەك دەزانین عەلمانییەت بریتییە لە بەرەنگاربونەوەی دەسەلآتە ئاینییەکان کە ئازادیی بیرکردنەوە لەلای مرۆڤ دەخنکێنێت. لە مێژووی ئاینەکانی ئێمەدا ئەم شتە روویداوە، مەبەستم لە ئاینەکانی کتێبە کە پشت بە تێکستەکانی

دەبەستێت و هەمیشە پێمان دەڵێت لەو کتێبەدا وانووسراوە! لێرەوە کەسانی رۆشنگەر بەناوی ئازادیی بیرکردنەوە و پێداگرتن لەسەر تێگەیشتن بە ئاگاهاتن و راپەڕیین، پێداگرتن لەسەر تێگەیشتن وزەیەکی دینامیکییە لە مرۆڤدا کە جیاواز نییە لە وزەی ژیان و هەستانەوەیەکی قووڵ کە دەشێت ئەو مرۆڤە ئازادە لە بەرامبەر تێکستەکانی کتێبی ئاینیدا بڵێت: نا، بڕوانە ئیبن روشد و مارتن لۆتەر و ئێراسم و ڤۆڵتێر و کەسانی دی بە جۆرێکی تر قسەیان کردووە. بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نییە عەلمانییەت ببێت بە دەسەڵاتێکی باڵا کە جۆری بیرکردنەوەمان بۆ دیاری بکات و پێمان بڵێت بیر لە چی بکەینەوە و سنورمان بۆ بکێشێت کە پێشتر دەسەڵاتی تیۆلۆجی و ئەکلیرۆس (پیاوانی ئایینی مەسیحی) ئەم کارەیان کردووە. عەلمانیەت تەنها تەرکیز دەکاتە سەر پێداگرتن لە ئاتاجی تێگەیشتن و رەخنەگرتن لەناو شڵەژانێکی گشتیدا کە لە مرۆڤدا هەیە.

دەبێ لێرەدا مەسەلەکان قووڵتر بکەینەوە، دەبێ جیاوازی بکەین لە نێوان دیسپلینی ئایینی و دیسپلینی کۆمەڵایەتی یان سیاسی، ئەم دوو چەشنە دیسپلینە بە هەمان رێگە کار ناکەن. ئێمە دەزانین گۆڕەپانی "ئارەزوو" بەر تابووە سێکسی و خۆراکییەکان دەکەوێت، هەروەکو پێداگرتن لە تێگەیشتن و کەشفکردن بەر بیروباوەڕە ئاینییەکان دەکەوێت. دەبێ ئەوە بزانین چۆن مرۆڤ هەوڵدەدات خۆی لە هەموو سنور و دیسپلینێك رزگار بکات و هاوکات دیسپلینێکی خودیی دیاریکراو بەسەر خۆیدا پرۆسە دەکات. بۆ نموونە کۆ دەنگی ئیسلامی (ئیجماعی ئیسلامی) کە پێشتر لە بارەیەوە دواین، ئەم ئیجماعە خۆی بەسەر هەموو موسڵمانێکدا دەسەپێنێت. دەشێت "دیسپلینی خودی" رەنگدانەوەی کۆمەڵگای دەوروبەر بێت، بەڵام لە هەمان کاتدا دەشێت لە "ناوەوە"یش هاتبێت، واتە لە ناوەوەی مرۆڤدا هاتبێت هەروەکو ئەمە لەلای سۆفیستەکاندا دەبینین. لێرەدا هەست بە هەموو ئیشکالیەتەکانی تاکی بەشەری دەکەین کە لە کۆمەڵگەدا دەژی. بۆ نموونە (حەللاج) شەهیدی سۆفی کە لە بەغدا لە خاچدرا، یان (ئیبن روشد) ئەو فەیلەسوفەی لە قورتوبەدا بەڕەسمی ئیدانەکرا، ئەمانە دوو نموونەی روونی ئەو شتەن کە باسم کرد.

## بەرەو پرۆسەیەکی عەلمانییانەی ئیسلام

لەژێر رۆشنایی ئەو شتانەی باسم کردن، دەڵێم پێداچوونەوەیەکی رەخنەگرانەی مێژووی ئیسلام و کەلەپوری ئیسلامی، ئەمڕۆ لە هەموو رۆژێ زیاتر خۆی دەسەپێنێت، ئەمەش پێویستیی بەکارێکی قەبە و گەورە هەیە، لێرەدا دەبێ دان بەو پێشکەوتنە گەورەیەی خۆرئاوادا بنێین کە لەو بوارەدا سەدان کاری رەخنەگرانەی گرنگی بەرهەمهێناوە.

ئێمە ئەمڕۆ، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئیسلامدا، چەندین پرسیار دەبینیین کە بە ئاراستەی گومانێکی بەردەوام و پەیدەرپەی دەخرێنەڕوو. ئەم گوزارشتە چەرخێکمان بیر دەخاتەوە کە بە (چەرخی گومان) ناودەبرێت و ئەمەیش لە سەدەی نۆزدەهەمدا لەلایەن مارکس و نیچەدا دەرگاکانی کرانەوە. ئیسلام لە مێژووی خۆیدا هەرگیز شتێکی لەو چەشنەی بەخۆوە نەبینییوە. بێگومان ئێمە دەزانین لێرەدا پراکتیزەگەلێکی نێگەتیڤانە بۆ "گومان" هەیە، بۆ نموونە بەکارهێنانی خەباتگێڕی و سیاسیی مارکسیزم کە بە شێوەیەکی روکەشانە بەکاربراوە و

هەستی جەماوەریان وروژاندووە تا لە دژی زوڵم و زۆرداری راپەڕێت، ئەمە شتێکی ڕەواو داواکراوە. بەڵام لە هەمان کاتدا کارکردن بەم ئاراستەیە لە زۆر شوێندا بووە مایەی دۆگماکردنی مارکسیزم و لە راستیدا مارکسیزم گۆڕاو بوو بە کۆمەڵێ قاڵبی فیکریی کۆن و پیر و وشك.

هەروەها تێبینی ئەوە دەکەین کە مارکسیزم تا ئەمڕۆش بەشێوە ئیجابییەکەی نەلە فیکری هاوچەرخی عەرەبی و نە لە فیکری ئیسلامیدا نەناسراوە. دەتوانین هەمان شت سەبارەت بەو رەخنانە بڵێین کە نیچە لە مەسیحییەتی گرتووە. ئەو رەخنەیە قابیلی ئەوەیە بەسەر ئیسلامدا پراکتیك بکرێت.

ئەگەر لەم تێڕوانینەوە تەماشای سەرانسەری مێژوو بکەین، ئەوا دەشێت زەمینە خۆشبکرێت بۆ پرۆسەی عەلمانییانەی ئیسلام، ئەمەیش لەژێر تیشکی ئەو سنورەی پێشتر بۆ عەلمانییەتمان کێشا. ئەوسا دەشێت عەلمانییەت لەو کۆمەڵگایانەدا بڵاوبێتەوە کە ئیسلام تیایاندا ئایینی ڕەسمییە (بەڵام کەی؟). ماوەیەکی درێژە خۆرئاوا خەوشێك لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان یاخود لە ئیسلام دەگرێت کە ئیسلام زەمەنی و رۆحی تێکەڵدەکات، واتە دونیایی و ئایینی تێکەڵدەکات. ئەمە شتێکە لەلای ئەوان روونە، بەڵام هۆیەکەی ناگەڕێتەوە بۆ خودی ئیسلام وەك ئاینێك و ناگەڕێتەوە بۆ سروشتە جەوهەری و ئەزەلییەکەی، چونکە ئیسلامیش هەروەکو مەسیحییەت بەهەمان رێگە کاریان کردووە. لە راستیدا هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کۆمەڵگە "ئیسلامییەکان" تا ئەمڕۆش فیکرێکی رەخنەگرانەی گەورەیان نەناسیوە، تا ئەمڕۆش رەخنەیان لە کەلەپوری خۆیان نەگرتووە وەك چۆن خۆرئاوا ماوەیەکی زۆرە دەستیان کردووە بە رەخنەگرتن لە کەلەپوری خۆیان.

بۆ ئەوەی قسەکەمان کورت بکەینەوە کە زۆر درێژەمان پێدا، با لە دوو خاڵی گرنگ بدوێین (و لە ڕاستیدا گەلێ خاڵی تریش هەن). خاڵی یەکەم پەیوەستە بە (دەوڵەتی ئیسلامی) و پێشتر کە باسی خەلافەتمان کرد لەم خاڵە دواوین. دەوڵەتی ئیسلامی لە سەرەتادا بە دوای پاساوێکی دینیدا دەگەڕا. ئەمە هیچ گومانێکی تیا نییە. بەڵام لە واقیعدا ئەو دەوڵەتە لە بنەڕەتدا عەلمانی بووە و وەکو هەر دەوڵەتێکی تری تازە پێگەیشتوو ڕووبەڕووی گرفتی رێکخستنی کۆمەڵگە بۆوە. لێرەدا چەندین نموونەمان لەبەردەستدایە. یەکێ لە گرنگترین ئەو نموونانە، ئەو پەیامەیە کە ئیبن موقەففەع لە ساڵی 750 زاینییدا نووسیویەتی و تایبەتە بە دامەزراندنی دەوڵەت و بونیادو دەزگاکانی دەوڵەت. ئیبن موقەففەع نووسەرێکی ئێرانی بوو و شارەزاییەکی باشی لە کەلەپوری ئێرانی هەبوو. پەیامەکەیشی ئیلهام وەرگرتن بوو لە شێوە و رێکخستنی دەوڵەتی ئێرانی کە بەر لە ئیسلام بەماوەیەکی درێژ لە سەردەمی ساسانییەکاندا هەبوو. لەراستیدا دەوڵەتی عەبباسی کە لەساڵی 750ز دا دامەزرا، وێنەیەکی کۆپیکراوی بونیادی دەوڵەتی ساسانی بوو.

ئیبن موقەففەع پەیامێکی بچووکی نووسی بە ناونیشانی "پەیامی یاوەران" (رسالة الصحابة)، ئیبن موقەففەع لەو نامەیەدا بونیادەکانی دەوڵەت و دامەزراوەکانی دەسنیشاندەکات، واتە بونیادەکانی دەوڵەتی عەبباسی دیاری دەکات کە لە بەغدا دادەمەزرێت بێئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئایین. نووسەر لەو نامەیەدا کۆمەڵێ کێشەی هەستپێکراو و ماتریالی دەخاتە ڕوو، بۆ نموونە شێوازی حوکمی

سوريا و عێراق و چۆنێتيی گەڕاندنەوەی ئاسايش و ئارامی بۆ ئەو دوو ناوچەيە، دەرەنجامی ئەمەيش بووە هۆی دەركردنی چەند بڕيارێك كە پەيوەست بوون بە سوپا و پۆليس و دادوەری. ئيبن موقەففەع هەموو ئەم شتانە بە كۆمەڵێ وشە و گوزارشتی پۆزەتيڤيستی شێدەكاتەوە بەبێ پشت بەستن بە بيرۆكەی وەهميی ياسای ئايينی ئيسلامی.

ئێمە لێرەدا لەبەردەم دۆكيومێنتێكی مێژوويی گرنگداين، ئەو دۆكيومێنتە چۆنێتی سەرهەڵدانی دەوڵەتی نوێمان پيشاندەدات كە ڕووبەڕووی كۆمەڵێ گيروگرفتی تايبەت بەهەر دەوڵەتێكی تازە لەدايك بوو دەبێت. هەموو ئەو شتانە لە نێو تێڕوانينێكی عەلمانيیانە ڕوويانداو بەمجۆرە دەشێت بەهۆی ميتۆدی مێژوويی ڕەخنەگرانەوە ڕاستييە مێژووييەكان ئاشكرا بكەين.

لێرەدا خاڵێكی تر هەيە كە لەوانەيە سەبارەت بە عەلمانيكردنی ئيسلام گرنگييەكی زياتری هەبێت، ئەو خاڵەش بەندە بەو شتەی كە موسڵمانەكان بە (شەريعەت) ناوی دەبەن، شەريعەت بەمانا ئەسڵييەكەی (بە مانا ئيتمۆلۆجييەكەی) واتە: ئەو ڕێگا ڕاست و دروستەی بەرەو خودا دەچێت. لێرەدا تێگەيشتنێكی تەقليدی بۆ شەريعەت هەيە كە لە هەندێ وڵاتدا بە تايبەتی لە كەنداوی عەرەبيدا پرۆسەكراوە. شەريعەت بريتييە لە چەند پرەنسيپێك كە هەموو لايەنێكی ياسا دەگرێتەوە، بۆ نموونە لايەنی مەدەنی و دامەزراوەيی و كێشەكانی تاوان، هەموو ئەو ياسايانە لە كۆمەڵگەدا جێبەجێ دەكرێت. كەچی موسڵمانان بە چەشنێك ئەو ياسايانەيان وەرگرتووە و بەجۆرێك نواندويانە و تيايدا ژياون وەك ئەوەی ئەو ياسايە خاوەنی بنەمايەكی خوداييە، لە ئاگايی ئيمانيی ئەواندا بەجۆرێك بنجی داكوتاوە وەك ئەوەی ياساكان لە تێكستەكانی قورئان و لە فەرمودەكانی پێغەمبەرەوە بەرهەم هێنراون. بەمجۆرە كاتێك بۆ نموونە يەكێ لە موسڵمانەكان دەچێتە دادگا – دادگای قەزايی – ئەوا لە نێو چركەساتی دادوەريی خوداييدا دەژی!! بە درێژايی چەندين سەدە لە سەرانسەری كۆمەڵگە ئيسلامييەكاندا مەسەلەكان بەو شێوەيە پرۆسە كراون، سا ئەو كۆمەڵگايانە مەدەنی بووبن يان لادێيی هەر بەو تەشريعە (يان بەو ياسايە) گۆشكراون و بەسەرياندا سەپێنراوە وەك ئەوەی بە فيعلی ئەمە تەشريعێكی – ياسايەكی – خوداييە.

بەر لەوەی قسەكانمان لە بارەی شەريعەت كۆتايی پێ بهێنين، دەبێ لێرەدا تێبينييەكی گرنگ تۆمار بكەين، لە ڕاستيدا شەريعەت بەسەر هەموو وڵاتە ئيسلاميەكاندا پراكتيك نەكراوە، چونكە دنيای شوانكاری و كشتوكاڵی تا ئەندازەيەكی زۆر دوور بووە لەو ياسايە. شەريعەتيش لە بنەڕەتدا بەندە بە دەوڵەتی مەركەزييەوە، واتە بەندە بە دەسەڵاتی خەليفەوە كە هەر خۆی قازيی گەورە (قازيی قوزات) دياری دەكات، ئەميش لەلای خۆيەوە قازی (يان: دادوەر)ی شوێنەكانی تر دەسنيشاندەكات و.. هتد. كەواتە پراكتيككردنی شەريعەت و درێژبوونەوەی جوگرافيی دەوەستێتە سەر ئاستی بڵاوبونەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی مەركەزی. هيچ ڕۆژێ ئەو دەسەڵاتە دەسەڵاتێكی گشتگيرو سەرجەمگير نەبووە. بۆنموونە لەجەزائيری بەر لەرزگاريدا، واتە تاساڵی 1962، بەشێكی گرنگی وڵات شەريعەتی تيادا پراكتيك نەكراوە، بەڵكو لەوێدا ياسای لۆكاڵی (ياسای عورف) جێبەجێ دەكرا كە دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە ئيسلام. بەڵام لەو ساڵە بەدواوە دادوەری بەپێی شەريعەت يەكخراو بەسەرهەموو وڵاتدا جێبەجێ كرا.

لێرەدا ئەو پرسیارەی خۆی دەخاتەڕوو، بەم شێوەیەیە:

چۆن ئەوە روویدا کە ملیۆنەها کەس باوەڕیان بەوە هێنا کە شەریعەت خاوەنی بنەمایەکی خودایییە؟ پێویستە میتۆدی تەفکیکی و شیکردنەوەی زانستی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە. ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین وەڵامی بدەینەوە.

بەپێی گێڕانەوەی ڕەسمی، شەریعەت پلە بە پلە بەهۆی کاری ئەو دادوەرانەوە شکڵی گرت کە دەبوو گیروگرفتە زۆر و جیاجیاکانی موسڵمانان چارەسەر بکەن. میتۆد و ڕێبازی ئەوان بریتی بوو لە گەڕانەوە بۆ تێکستەکانی قورئان تا چارەسەری لێدەربێنن، واتە بڕیاری کۆتایی بەشێوەیەك لە شێوەکان لە قورئانەوە دەردەهێنرا. سەرجەمی ئەو ئەحکامانە دواتر و لە ساتەوەختی سیٚ سەدەی یەکەمی کۆچیدا کۆکرانەوە تا ژمارەیەکی گەورەی ئەحکامی دادوەری پێکبهێنریٚ. ئەو تێکستە فیلۆلۆرجی و دادوەرییانە سەر بە چوار سەرکردەی مەزهەبەکانن: مالك بن ئەنەس، ئەبوحەنیفە، شافعی، ئەحمەد بن حەنبەل. کەلەپوور نەوە لە دوای نەوە ئەحکامی ئەمانەی پاراستووە تا گەیشتۆتە ئەمڕۆ. لێرەوە ئەم چوار قوتابخانە فیقهییە دروست بوون: (مالکی و حەنەفی و شافعی و حەنبەلی). ئەمانە ئەو قوتابخانە ئەرتەدۆکسییانەن کە جیهانی ئیسلامییان دابەش کرد، بێگومان جگە لە قوتابخانە شیعییەکانیش.

ئەمە گێڕانەوەی رەسمیی ئەو چیرۆکەیە کە خۆرهەڵاتناسان خستیانە مەحەکی رەخنەی مێژووییەوە. ئەو خۆرهەڵاتناسانە (بۆ نموونە: گۆلدزیهر، شاخت.. هتد) سەلماندیان کە شتەکان بەشێوەیەکی تر روویانداوە، ئەو گێڕانەوەیەیش کە کەلەپوور دایهێناوە جگە لە وەهمێك شتێکی تر نییە، ئەمەش بۆ ئەوە بووە تا سیفەتی خواوەندیی بەسەر یاسایەکدا بدرێت کە بە شێوەیەکی پۆزەتیڤیستی لەناو کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا جێبەجیٚ کراوە.

لە راستیدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی کۆچیدا، کاری قازییەکان لە بنەڕەتدا لەو نەریتە لۆکاڵییانەوە ئیلهامی وەردەگرت کە بەر لە ئیسلام هەبوون و ئەو نەریتانەیش بەپێی شوێنەکان جیاوازبوون. رای تایبەتی قازییەکان رۆڵی یەکلاکەرەوەی لە کێشەکاندا دەبینی. کەچی گەڕانەوە بۆ یاسای قورئانی بە ئەندازەیەکی کەم کاری پێکراوە و بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ بووە نەك بە شێوەیەکی سیستماتیك وەك ئەوەی کەلەپوری رەسمی هەوڵدەدات وامان تێبگەیەنێت.

رێك لەبەر ئەم هۆیە، شافعی لە بەرامبەر ئەو دۆخە ناجێگیر و ئاژاوەیەدا — واتە دۆخی پەرتبونی دادوەرەکان، و جیاوازیی ئەحکامەکان بەپێی جیاوازیی شوێن و جیاوازیی دادوەران، کە ئەمە مەترسییەك بۆ یەکێتیی ئوممەی ئیسلامی پێکدەهێنێت— لە بەرامبەر دۆخێکی وادا شافعی لە نێوان ساڵانی (800ز–820ز)دا پەیامە ناودارەکەی نووسی کە تیایدا میتۆدی یاسا دیاری دەکات. ئەم پەیامە تیۆرییە کارێکی دواتر و لە پاش شێوەگرتنی ئەحکامە دادوەرییەکاندا بوو. جگە لەمەش یەکێکە لەو نووسینە جوانانەی فیکری ئیسلامی کلاسیکی بەرهەمی هێناوە. ئەو پەیامەی شافعی لە چوار پرەنسیپدا ڕێساو بنچینەی یاسا دەخاتە ڕوو:

1–قورئان، 2–فەرمووده، 3–ئیجماع (بەڵام ئیجماعی کیٚ؟ ئاخۆ ئەوە ئیجماعی هەموو ئوممەیە یان تەنها ئیجماعی فوقەهاکانە؟ پاشان فوقەهای چ سەردەمێك و چ شارێك؟ وەڵام نییە.)، 4–پێوەر.

ئەمە ئەو فێڵە گەورەیە بوو کە ڕێگەی بۆ ئەو وەهمە کردەوە کە گوایە شەریعەت خاوەنی ئەسڵێکی خودایییە. پێوەر ڕێگە بۆ چارەسەری گیروگرفتە تازەکانی ژیانی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان خۆشدەکات، واتە ئەو حاڵەتانەی یاسا و فەرمووودەکان بەلایاندا نەچوون. بەم شێوەیە هەموو یاسای داهێنراو پیرۆز دەکرێت. هەموو ئەم کارە شتێکە درەنگ ڕوویدا. ئەو یاسایەی بە یاسای ئیسلامی ناوزەد کراوە، لە ڕووی زەمەنییەوە، بەر لەسەرهەڵدانی ئەم پرەنسیپە تیۆرییانە شێوەی گرتووە کە بووە مایەی دیسپلین کردن و پیرۆزکردنی یاسا.

لە سەرێکی تر، دەبێ ئاماژە بۆ ڕاستییەکی گرنگ بکەین، ئەویش: ئەو چوار پرەنسیپە توانای پراکتیزەیان نییە! یەکەم: خوێندنەوەی قورئان جیاوازییەکی گەورەی تەفسیری ورووژاندووە. بەڵام مەسەلەی فەرمووودە، ئەوا کێشەکە زۆر سەختترە، چونکە فەرمووودە بریتییە لە ناکۆکییەکی بەردەوام جگە لە هەندێ فەرموودەی کەم نەبێت کە بە ئاستەم دیاری دەکرێت.

ئێمە دەزانین لێرەدا دوو کەلەپوور لە فەرمووودەدا هەیە، کەلەپوری سوننی و کەلەپوری شیعی، ئەم دوو کەلەپورە بە تەواوی لێکدابڕاون. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەو (شەریعەت)ەی بەفیزەوە باسی دەکەن، لە بنەماکانیدا لەلای شیعەو سوننە، یەك شەریعەت نییە. سەبارەت بە (ئیجماع)یش کە زۆر بە دەگمەن بەدی هاتووە، بریتییە لە پرەنسیپێکی تیۆری کە تەنها بەسەر هەندێ مەسەلەی گەورەدا پراکتیك کراوە بۆ نموونە شێوەگرتنی تێکستی قورئانی و نوێژو، ئاهەنگێڕان لە جەژنی لەدایکبوونی پێغەمبەر و..

بەمجۆرە ئاستی ئەو مەترسییە گەورەیە دەبینن کە لە هەموو ئەو چیرۆکەوە دێتە بەرهەم، واتە چیرۆکی پێکهێنان و شێوە گرتنی شەریعەت. بە تایبەتی ئەگەر زانیتان کە ئەم شەریعەتە دەبێ تەحەکوم بە ژیان و هەڵسوکەوتی هەموو موسڵمانێکەوە بکات و تەنانەت بە بیرکردنەوەی لە هەموو چرکەساتێکی ژیانیدا. بەمجۆرە تێکەڵبونێك ڕوویدا لە نێوان یاسای شەرعی ***Legal*** و ئاینیدا ***religiens***، یان لە نێوان زەمەنی و ڕۆحیدا.

دەبێ ئەوە بزانن کە ماوەیەکە پراکتیزە کردنی میتۆدی مێژوویی ڕەخنەگرانە بەسەر ئەو کێشە گرنگەدا هاتۆتە بوون بەڵام دوچاری زەحمەتی و ئاستەنگی گەورە دەبێت. هەڵوێستی موسڵمانان لە شەریعە جۆرێك لە تەقلیدی کوێلەیی و سکولاستیکی دەنوێنێت کە بە هۆی فێرکردنی تەقلیدی و تەلقین و بەزۆر پێ لەبەر کردن بە درێژایی نەوەکان بنجی داکوتاوە.

ڕاستە هەمیشە لە ئیسلامدا ڕوناکبیری ئازاد هەبوون، بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەکاندا گومانیان لێکراوە و ئیدانە کراون. لێرەدا دەبێ ئاگاداری چارەنووسی فەلسەفە بین لە ئیسلامدا، ئەو فەلسەفەیەی کە لە بارەیەوە دەیانوت جگە لە دەنگدانەوەیەکی لاوازی فیکری یۆنانی شتێکی تر نییە، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە. ئیسلامی ڕەسمی (واتە ئیسلامێکی دۆگما کە دواتر باڵا دەست بوو) ڕێگر بوو لەبەردەم بوژانەوەی فەلسەفەی ئیسلامیدا.

لێرەدا هەمیشە کێبەرکێیەك هەبووە لە نێوان فیلۆلۆجیستەکان — فەقیهەکان (یاسەوانانی دەوڵەت) کە یاساویان بۆ کارەکانی دەوڵەت دەهێنایەوە و جێبەجێکردنی شەریعەتیان دەستەبەر دەکرد، و لە نێوان تێڕامانی فەلسەفی کە

رەخنەی لە شتە بنچینەییەکانی تایبەت بە راڤەکردنی تێکستەکان دەگرت و هەروەها رەخنەی لە رێکخستنی کاروباری دونیایی لە کۆمەڵگەدا دەگرت. بەڵام (ئیبن روشد) بەبێ هیچ گومانێك کەسێکی زۆر جیاواز بوو، چونکە لە کەسیی خۆیدا دوو شتی کۆکردبووەوە: 1–پیشەی دادوەری –کە ئەو دادوەرێکی گەورەبوو لە قورتوبەدا– و 2– فەلسەفە. بەڵام کارە بڵندەکەی دادوەریی، نەیتوانی لە بێزاریی سەرجەم ئەو فەقیهانەی تر بیپارێزێت کە ئیدانەیان کرد و پاشان زیندانییان کرد.

جا بۆ ئەوەی بە چاکی لەم دۆخە تێبگەین، واتەدۆخی بەسووك تەماشاکردن و دوورخستنەوەی بەردەوامی فەلسەفە لە کەشوهەوای ئیسلامیدا، ئەوا دەبێ بڕوانینە ئەو شتانەی بە فیعلی لە خاکی کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا روویانداوە بە تایبەتی هەر لە سەدەی دوانزەهەمی زاینیی و سەدەکانی دواتریشدا.

ئەو کۆمەڵگایانە کە هەم لە ناوەوە و هەم لە دەرەوەیشدا هەڕەشەلێکراو بوون، هەمیشە ناچاربوون سیستمێکی ئاسایشی تایبەتی دابمەزرێنن. لە دۆخێکی وەهاشدا مومکین نییە فەلسەفەی رەخنەیی بەشداری لە بناغەدانانی ئەو سیستمەدا بکات، بگرە بە پێچەوانەوە "رەخنە" دەبێتە مەترسی و هەڕەشە. تەنها شەریعەتێکی توند و کاریگەر لە دەروونی خەڵکیدا، دەتوانێت پاڵپشتێکی گەورەی ئەو جۆرە رژێمە بێت. تەنها ئەو شەریعەتە توانی لە بەرامبەر بزووتنەوە رەخنەییەکانی ناوخۆدا بوەستێت و هەروەها ڕووبەڕووی مەترسییە دەرەکییەکانیش بێتەوە کەخۆی لە مەترسیی خۆرئاوادا دەبینییەوە. ئەو بارودۆخە تا رۆژی ئەمڕۆمان هەر بەردەوامە. شەریعەت یەك زمان و یەك سیستمی بەهای ئامادە دەنوێنێت کە دەتوانێت لە چرکەساتە گەورەکانی گۆڕانکاریدا جەماوەر ساز و ئامادە بکات. ئەمڕۆ شەریعەت لە خزمەتی ئایدیۆلۆجیای بنیاتنانی نیشتمانیدا بەکاردەهێنرێت وەك چۆن لە رابردوودا خزمەتی سولالەو دەسەڵاتە یەکلەدوای یەکەکانی کردووە. لە نێو بارودۆخ و مەرجێکی لەو چەشنەدا دەبینین مەسەلەی عەلمانییەت بەهێزەوە خۆی دەخاتە ڕوو.

### کۆتایی: هێزی دیاردەی قورئانی

ئێمە پێشتر لە بارەی مەسەلەی "دیاردەی قورئانی" و چۆنێتی گەشەکردن و شێوەگرتنیدا دواوین، ئێستایش شتێکی قووڵتر نمایش دەکەین کە دەشێت توانای ئەوەمان پێ ببەخشێت دەرەنجامەکانی راڤە بکەین و لە هۆکارەکانی ئەو کاریگەرییە تێبگەین کە بە درێژایی سەدەکان بەسەر خەڵکیدا هەیەتی. دەبێ هەر لە سەرەتاوە جیاوازی بکەین لە نێوان "دیاردەی قورئانی" و "دیاردەی ئیسلامی"، وەك چۆن لە مەسیحییەتدا جیاوازی دەکرێت لە نێوان دیاردەی ئینجیلی و دیاردەی کەنیسەیی – دەزگایی.

قورئان، هەروەکو ئینجیلەکان، بریتییە لە چەندین میتافۆری بڵند کە لە بارەی دۆخی بەشەرییەوە دەدوێت. ئەو میتافۆرە (مەجاز) مومکین نییە ببێت بە یاسایەکی ڕوون. وەهمی گەورە بریتییە لە باوەڕی ملیۆنەها کەس کە گوایە ئەو گوزارشتە مەجازییانە دەتوانن ببن بە یاسایەکی ئیشکەر و ئاکتیڤ و ببن بە چەند پرەنسیپێکی دیاریکراو کە لە هەموو کات و شوێنێکدا جێبەجێ دەکرێت و بۆ هەموو زەمان و زەمینێك دەگونجێت. هەموو ئەم شتانە لەسەدەکانی پێشوودا بە حەتمی روویانداوە، چونکە کۆمەڵگە ناچاربووە پەنا بۆ

جۆرێك لە دیسپلین ببات و بەبێ ئەو دیسپلینە ئاژاوە بڵاودەبێتەوە. کۆمەڵگە بەشەرییەکان ناتوانن بە درێژایی ژیان هەر لە سەر زمانی میتافۆر (مەجاز) بژین. میتافۆر تێرامان و خەیاڵ و بیر و کار متوربە دەکات و هەروەها ئارەزووی جێهێشتنیش متوربە دەکات، میتافۆر وزەیەکی فرە و دینامیکیمان تیادا دەوروژێنێت، بەڵام لێرەدا مرۆڤی هەستیار هەن و لە کۆمەڵگەدا دەژین و ژیانی تایبەتی و جیاوازی خۆیان هەیە کە ئەمەیش پێویستیی بە چەشنێك لە ڕێکخستن و دیسپلین هەیە. بەمجۆرە شەریعەت هاتە ئاراوە.

دەبێ لێرەدا ئاماژە بۆ هەموو ئەو کەشوهەوا میتۆلۆژی (ئەفسانەیی)یە بکەین کە لە میانیدا پرۆسەی تێپەڕین لە قۆناغی میتافۆرەوە بۆ قۆناغی بەدەستهێنانی یاسایەکی توند و ڕۆشن ئەنجام درا، ئەو یاسایەیش بریتییە لە شەریعەت. دەبێ ئەم مەسەلەیە لەلای موسڵمانان و مەسیحییان و گەلانی تریشدا بپشکنین. ئەو کەشە ئەفسانەییە (میتۆلۆژییە) کە دەسەڵاتی بەسەر نەوەکانی پێشوودا هەبوو، بناغەی بۆ ئەو وەهمە گەورەیە داڕشت، واتە ڕۆیشتن لە (ئیرادەی خوداوە) کە لە کتێبە پیرۆزەکاندا گوزارشتی لێکراوە بەرەو یاسا فیقهییەکان (شەریعەت). لە ڕاستیدا لێرەدا چەندین جۆری جیاواز لە ئاخاوتن (یاخود گوتار) هەیە. لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان گوتاری شیعری یان ئایینی / و گوتاری یاسایی فیقهی یان فەلسەفی. مومکین نییە بتوانین لە دوو گوتاری یەکەمەوە بەرەو گوتارەکانی تر هەنگاو بنێین تەنها بەزۆرە ملێ و بەزۆرداری نەبێ.

سەرباری ئەو پێداچوونەوە ڕەخنەییانە، ئێمە ناتوانین بوونی هێزی گەورەی "دیاردەی قورئانی" و هەروەها دیاردەی ئینجیلی فەرامۆش بکەین. ئەم هێزە بەهۆی کۆششی هەندێ لە کەسایەتییە ئاینییە گەورەکان و هەندێ لە کەسایەتییە روناکبیرەکان، بەردەوام بوو، هەروەها بەهۆی هێزی دەوڵەتیشەوە کە بە پێی بارودۆخ و وەرچەرخانە مێژووییەکان کاری کردووە.

بەڵێ لێرەدا هێزێك هەیە مێژوو و سەدەکانیش دەبڕێت. ئەم هێزە بوونی هەیە بێئەوەی بتوانین لە قورئان یاخود لە ئاخاوتنەکانی مەسیحدا بەوردی شوێنەکەی دیاری بکەین. ئەم هێزە لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا فۆرمێکی لە زمانی عەرەبیدا بۆ خۆی گرت. باشە چۆن ئەمە ڕوویدا؟ ئەمەیە پرسیارە گەورەکە. چۆن ئەم هێزە توانی ئەو دیاردە سەرسوڕهێنەرە (واتە قورئان) بەرهەم بهێنێت، ئەو دیاردەیەی لێرە لە دوورگەی عەرەبی و بە زمانی عەرەبی تەقییەوە.

ئەمە ئەو پرسیارە گەورەو قەبەیەیە کە چاوەڕێی وەڵام دەکات. دەبێ بە جۆرێك وەڵامی بدەینەوە جیاواز بێت لە وەڵامی زانستی مێژوویی – فیلۆلۆجیی خۆرهەڵاتناسەکان کە بۆ نموونە ئایەتێکی قورئانییان دەهێناو لە بەرامبەر کۆپلەیەك لە ئینجیل یان تەورات دایان دەناو بەراوردیان دەکرد.. هتد، کاری لەو چەشنە (واتە قۆناغی فیلۆلۆجی) بێگومان چاکە و پێویستیشە بەڵام بەس نییە. ئێمە بانگەشە بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی جیاواز دەکەین کە فراوانتر و سەرجەمگیرتر بێت، بە پشکنینێکی قوڵەوە لەسەرانسەری مێژووی ئایینی لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بدوێت. بە کارێکی لەم چەشنە بەشدارییەکی کاریگەر لە پێشخستن و نوێکردنەوەی زانستە مرۆڤایەتیەکاندا دەکەین لە میانی مۆدێلی ئیسلامیدا. ئەمەیە بواری کاری"ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی"کەبەوپەڕی تواناوە لەپێناوی دانانی بناغەو دامەزراندنیدا تێدەکۆشین.

## پەراوێزەکان

1-کتێبە ئاماژە پێکراوەکەی رۆجی باستید بەمجۆرەیە:

*Roger Bastide: Anthropologie appliqué. Ed. Payot. 1971*

ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی ناونیشانی ئەو میتۆدەیە کە ئارکۆن پەیڕەویی دەکات و ئەمەش تا ئەندازەیەکی گەورە جیاوازە لە میتۆدی خۆرهەڵاتناسی یان ئیسلامۆلۆژیی کلاسیکی. بۆ زیاتر شارەزابوون لە بارەی ئەم خاڵە بڕوانە بەشی یەکەمی کتێبەکەی ئارکۆن (بەرەو رەخنەگرتن لە ئەقڵی ئیسلامی) کە بەم ناونیشانەیە: " بەرەو ئیسلامۆلۆژیی پراکتیکی". ( ئەم کتێبەی ئارکۆن لە چاپی وەرگێڕانە عەرەبیەکەیدا بووە بە: مێژووگەرایی بیری عەرەبی ئیسلامی – تاريخية الفكر العربي الاسلامي – واتە ئەم کتێبەی لە بەردەستماندایە و "ئیسلام و بەعەلمانیکردن"ەکەیمان تیادا وەرگێڕاوە. و.ك).

2-بۆ روونکردنەوەی زیاتری هەڵوێستی ئارکۆن سەبارەت بەم خاڵە، دەبێ بڵێین کرانەوەی مارۆنییەکان بەرامبەر خۆرئاوا لە میانی مەسیحییەتەوە، بەرەو بنجداکوتانی ئەو بیرۆکەیەی بردن کە دەڵێ مەسیحییەت هەر لە سەرەتاوە (رۆحی) ی لە (زەمەنی) جیاکردۆتەوە: ئەم بیرۆکەیە ئەفسانەیە و حەقیقەتی مێژوویی نانوێنێت. پاشان واقیعی مێژوویی و حاڵی حازریش پێمان دەڵێن مارۆنییەکان لە موسڵمانان عەلمانیتر نین. دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە مەسیحییەتی خۆرهەڵات سەبارەت بە مەسەلەی عەلمانیەت هەمان هەڵوێست و هەمان ئەو کەلەپورەی نییە کە مەسیحییەتی خۆرئاوا هەیەتی. عەلمانییەت دەستکەوتێکی خۆرئاواییە و پەیوەستە بە مێژووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی لە فەرەنسە و ئینگلتەرە و پاشان ئەڵمانیا هەر لە سەرەتای بزوتنەوە ریفۆرمیستەکان و رێنیسانس لە سەدەی شانزەهەمدا، پاشان ئەمە دەرەنجامی فەلسەفەی رۆشنگەرییە لە سەدەی هەژدەهەمدا و لە کۆتایشدا ئەو بزوتنەوە زانستی و پیشەسازییەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا گەشەی کرد. لەبەرئەوە کاتێك مارۆنییەکان دەڵێن لەم لایەنەدا لە موسڵمانەکان لە پێشترین، ئەمە راست نییە و بانگەشەیەکی نادروستە. قسەکردن و گفتوگۆ لەبارەی عەلمانییەت بەو شێوەیەی لە لوبناندا خرایە روو، پتر مەسەلەیەکی جیدالی و سیاسییە نەك گفتوگۆیەکی زانستی و رۆشنبیری.

*3-Georges Balandier: Anthropologic Politique, P.U.F. ed. 1969.*

4-لێرەدا ئارکۆن جیاوازی لە نێوان ئەفسانە و مێژوودا دەکات بە پێچەوانەی پۆزەتیڤیستە توندڕەوەکان کە جگە لە راستییە جێگیرەکان و رووداوەکان شتێکی تر لەبەرچاو ناگرن. ئارکۆن لە لێکۆڵینەوەی مێژوودا بایەخێکی گەورە بە ئەفسانە دەدات. ئەنترۆپۆلۆژیای نوێ تەرکیزێکی زۆر دەخاتە سەر گرنگی وێناکردن و خەیاڵە جوڵێنەرەکان کە خەڵك و جەماوەر دەوروژێنن و سازیان دەدەن، ئەنترۆپۆلۆژیا هەموو ئەم شتانە تێکەڵ بە میتۆدەکەی خۆی دەکات. کەچی خۆرهەڵاتناسە فیلۆلۆجیستەکان تا ئەمڕۆش ئەو خاڵە گرنگە لەبەرچاو ناگرن.

5-هەروەها باشلار دەڵێ: لە پێناوی بنجداکوتانی مەعریفەیەکی راست و دروستدا، دەبێ مەعریفەی هەڵە لە بناغەوە بڕمێنرێ.

6-لێرەدا ئارکۆن ئاماژە بۆ لێکۆڵینەوەکانی زانای ئەڵمانی جۆزیف ڤان هیس دەکات.

7-بۆ زیاتر ئاشنابوون لە بارەی مشتومڕی شیعی/سوننی، بڕوانە توێژینەوەکەی ئارکۆن بە ناونیشانی: "بەرەو یەکخستنی ئاگایی عەرەبی ئیسلامی" کە لەم کتێبەدا هەیە.

## تێبینی:

ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئارکۆن لە بنەڕەتدا بریتییە لە لێکچەرێك کە لە مانگی دیسەمبەری ساڵی 1978دا لە سێنتەری تۆماس مۆر لە پاریس بە زمانی فەرەنسی پێشکەشی کردووە. لە ساڵی 1985یشدا جارێکی تر بۆ ئەو سێنتەرە بانگێشت دەکرێت و ئەمجارە بەشێوەیەکی فراوانتر لە بارەی "عەلمانییەت و ئایین" دەدوێت و دواتر لە کتێبێکی سەربەخۆدا چاپی دەکات و هاشم ساڵح وەریدەگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی، ئێمەش ئەو کتێبەمان کردووە بە کوردی و لە ساڵی 2005دا لە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم چاپ کراوە.

## سەرچاوە

د. محمد اركون، تاريخية الفكر العربي الاسلامي، ترجمة: د. هاشم صالح، الطبعة الثانية 1996، مركز الانماء القومي.

# تێڕوانینی ژیل دولوز بۆ فەلسەفە

## ڕاپۆرتێك دەربارەی وتارەكەی محەمەد زیمران لە یانەی كتێبدا

لە فارسییەوە: ڕەزا مەنوچەهری

ژیل دولوز زۆربەی لێكۆڵینەوە مێژووییەكانی لەسەر بنەمای توێژینەوە لە كەسایەتی ئەو بیرمەندانەدا دەستپێكرد كە لە بواری فەلسەفەدا رۆڵێكی كاریگەریان هەبووە. دولۆز هەوڵی دەدا تاكو لە راڤەی فەلسەفیدا رێگایەكی نویَ بۆ دیتنەوەی رامانی ئەو مەزنە پیاوانە پێشكەش بكات. لەم سۆنگەیەوە شێوازی تێڕوانینەكانی جیاوازبوون لەو روانگەیەی كە لە نەریتی فەلسەفەدا باو بووە. لە باتی ئەوەی گرنگی بە رێباز و بنەما سەرەتاییەكانی فەلسەفە بدات لێكۆڵینەوەكانی لە نێو پانتایی فەلسەفەوە دەستپێكرد. تەنانەت لە چوارچێوەی باسە فەلسەفیەكانیدا رەخنەی لە جیاوازی نێوان هۆ و هۆكار، گەوهەر و ناواخن، یەكێتی و یەكبووندا.. كردووە. بە پێی بۆچونەكانی دولۆز جیهان هیچ نییە جگە لە شانۆی جووڵە، دینامیكیەت، گەرانێكی سەقامگیرانە كە لە رووبەروبوونەوەكان و جوڵە و دەستپێكردنەكاندا رەنگ بداتەوە. كەواتە لە راستیدا زۆربەی فەیلەسوفەكان لە سەردەمی سوقرات بە دواوە وە مۆمیاكارانێك بوون كە رامانیان بە شێوەیەكی بەستو، وشك، دۆگم پێشكەشكردووە كە رێگایان لە هەموو دینامیكیەتێك گرتووە. لەم ڕووەوە دولۆز پڕۆژە فەلسەفیەكەی خۆی لە چوارچێوەی چەمكی رووەكناسیدا بەناونیشانی "ریزۆم" پێشكەشكردووە. زیمران دەربارەی رەخنەكانی دولۆز بۆ مێژوی فەلسەفە دەڵێت: دولۆز میتۆدی باو و ئاسایی نوسینی مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوای رووبەرووی رەخنە (قەیران) كردۆتەوە. بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە مێژونوسانی فەلسەفی رۆژئاوا بە چاوێكی سنوردارەوە و لە دەلاقەیەكی زۆر تەسكەوە سەیری فەیلەسوفەكانی رابردویان كردووە، بۆیە دۆلۆز خۆی خەریك كرد و دەستی دایە نوسینی رامانی فەیلەسوف گەلێكی وەك: هیوم، كانت، سپینوزا، نیچە، بریگسۆن و لایب نیتس. دۆلۆز دوو رەخنەی گرنگ و سەرەكی لە شێواز و هەڵوێستی دەزگای مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوا گرت. لە سەرەتادا رەخنەی لە سیاسەتی نەریت گرت و گوتی: هەمیشە مێژوی فەلسەفە

هۆکاری سەرەکی دەسەڵات بووە لە فەلسەفە و راماندا و هەمیشەیش رۆڵی سەرکوتکەری گێڕاوە. چۆن دەتوانرێت بە بێخوێندنەوەی بەرهەمەکانی پلاتۆن، دیکارت، کانت، هایدگر و.. بیرلە رامان بۆچوونەکانیان بکەینەوە؟ وێنای ئەو رامانەی کە ناوی فەلسەفەی لێدەنرێت، لە شێوازێکی مێژویدا فۆرمی وەرگرتووە و هەمیشەش هەوڵدەدات پێش بە جەماوەربگرێت کە بیر لە رامانە رەسەنەکان نەکەنەوە. دوکتور زەمیرات سەبارەت بە دویەمین رەخنەی دولۆز لەسەر مێژووی فەلسەفە روونیکردەوە کە دویەمین رەخنەی دولۆز رووی لە شێوازی سونەتی و کۆنی فەلسەفەیە، بە تایبەتی رەخنە لە شێوازی پەروەردەی پسپۆڕانی ئەم بوارە دەگرێت. دولۆز بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەبێت پێش بە فەیلەسوفەکان بگرین بۆ ئەوەی کە دەربارەی دیاردەکان تێڕانەمێنن. فەیلەسوف کاری خولقاندن و داهێنانە و نابێت تەنها سنوردار بێت بە بیرکردنەوە وە. لە روانگەی دولۆزەوە داهێنانی فەیلەسوفەکان بە بەراوردکردن لەگەڵ نوسەرانی دیکەدا شێوەی وێنەکارێك لە خۆی دەگرێت. مێژوی فەلسەفە کۆلێژێکی بیرکردنەوە نییە، بەڵکو دەبێت وەك شێوەکارێك داهێنان بۆ وێنا هزری و زەینییەکان بکات، هەر بەو جۆرەی کە لە شێوەکاریدا داهێنانی وێنە هزری و زەینییەکان بە ئەنجام دەگات و هەر بەو جۆرەی کە لە شێوەکاریدا وێنایەك بۆ جیهانی دەرەکی دەکێشن دەبێت لە مێژووی فەلسەفەیشدا دەست بدەینە رێگای لەو جۆرە. بەبڕوای دولۆز دەبێت توێژەری فەلسەفە سود لە هزری بیرمەندانی پێشوو وەربگرێت و بە بەرهەمهێنانی چەمکی نوێ بوار بۆ رامان و ژیانی نوێ برەخسێنێت و لە ئەنجامدا لاپەڕەیەکی نوێ لە پانتایی ئەندێشە و ژینگەی مرۆییدا ئامادە بکات.

هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە زیمران ئاماژە بە دولۆز دەدات سپینوزا بە شازادەی فەیلەسوفەکان دەزانێت، سەبارەت بە بۆچوونەکانی دولۆز لەم بوارەوە دەڵێت: دولۆز لەو بڕوایەدایە کە دەتوانین گەورەیی سپینوزا لەسەر دوو بنەمای درەوشاوەی رەسەنی ئەزموونگەرایی لە بیری ئەودا هەڵبسەنگێنن، دولۆز ئەو دو هۆکارەی لەیەك جوڵە و دەستپێکردندا کۆکردۆتەوە: یەکەم لە فەلسەفەکەیدا بابەتی ئیستعلایی (بەرزی و بڵندی) رەد دەکاتەوە و بە پێچەوانەوە روو دەکاتە چوونە ناوەوە و تواندنەوە لە دەروندا، دووەم سپینوزا بە شێوازێکی زۆر جیاوازەوە سەیری رەخنەگرتن لە ئەخلاق دەکات. لە روانگەی سپینوزاوە چاکە و خراپە ئەو تێزەیە کە لە ئایدۆلۆژیا و تێڕوانینێکی ئەخلاقیەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەو جۆرە تێڕوانینە توانای کرداریمان لاوازدەکات و ئەزمونەکان هەستێکی دژواری لاواز بوون و بێچارەبوونمان تیادا دەوروژێنێت. هەرچۆنێك بێت لە روانگەی سپینوزاوە ئەخلاق بابەتێکی بەرز و بڵند نییە، بەڵکو دەبێت ئەخلاق لەبەکارهێنانی ژیانی ئاسایدا هەڵبسەنگێنینی. بە زۆری باسکردن دەربارەی هەستەلاوازەکان لەگەڵ تیوری بێزاربوون و بەئەخلاق بوونی نیچەدا بەراورد دەکرێت. دوکتور زەمیران دەربارەی لێکدانەوەی دولۆز بۆ فەلسەفەی نیچە گوتی: ئەندێشەکانی نیچە رۆڵێکی سەرەکیان گێڕاوە لە فۆرمداین بە فەلسەفەی دولۆزدا. بە بڵاوکردنەوەی کتێبی "نیچە و فەلسەفە"ی دولۆز لە فەرەنسەدا روانگەیەکی نوێ دەربارەی نیچە برەوی پەیدا کرد، چونکە تاکو ئەو سەردەمە زۆربەی بیرمەندان نیچەیان پەیوەندیدار دەزانی بەرامانە فاشیستیەکانەوە. دولۆز لەو بڕوایەدایە لە مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوادا پەیوەندییەکی زۆر نەهێنی و

ئاڵۆز هەیە لە نێوان رامانەکانی لوکرسیوس، سپینوزا، هیوم و نیچەدا، ئەو پەیوەندییە نەهێنییە هیچ نییە جگە لە رەخنەگرتن لە چەمکی رەدکردنەوە و نکوڵی لێکردن و گەشە و پەرەستاندن بە چێژەکان، بێزاربوون لە بەدەرونی کردن (دەرونخوازبووندا) و جەخت کردنەوە لەسەر دەرەکی بوونی پەیوەندیەکان و هێزەکان و لە ئەنجامدا رەدکردنەوەی دەسەلات. بە گوێرەی بۆچوونەکانی دولۆز ئەم بلیمەتانە هەمیشە هەوڵیانداوە کە لە سایەی رۆحی رەخنەگرانەی خۆیاندا سیستەمە تۆتالیتارەکان رووبەرووی رەخنەگرتن بکەنەوە و هەوڵیانداوە تاکو فەلسەفەی جیاوازی و جیاوازبوون، جوڵە و دەستپێکردن و ژیان لە باتی سیستەمە مۆمیاکراوە ئاوەزیەکان دابنێن. سەرەڕای دولۆز، نیچە هەوڵیداوە لە بەرهەمەکانی خۆیدا روویەکی دیاردەناسی کە لەسەر بنەمای شیکردنەوەی هێزە چالاکەکان چەقیان بەستووە پێشکەش بکات و بەرەدکردنەوەی هێزە نێگەتیڤەکان، هێزە پۆزەتیڤ و ژیان بەخشەکان دەناسێنێت. دولۆز لەم بەرهەمەیدا یەکیەتی خوازبوونی مۆنیستی (تاکانەیی، یەك سەرچاوە هەیە بۆ بوون) رووبەروی رەخنەی توند دەکاتەوە و ستایشی فرەیی و پلۆڕاڵ بوون و چەند رەهەندبینی دەکاتەوە لە واتایەکی دیکەدا دولۆز ئەو فەلسەفەیە بە هۆنراوەیەك لە هێزە جیاواز و رانەوەستاوەکان دەزانێت کە لە ژێر سێبەر و ویستی دەرونیدا دەکەونە جوڵە. نیچە هەمیشە رەخنەی لە چەمك گەلێکی وەك ناسنامە، یەکیەتی و گەوهەر گرتووە و جەختی لەسەر جیاوازی، ئازایەتی، ریکەوت، فرەیی جوڵە و دەستپێکردن کردۆتەوە. دولۆزیش بەکاریگەریەتی لە ژێر فەلسەفەی نیچەدا رەخنەی لە گشت فەلسەفەی بوونگەرایی گرتووە و فەلسەفەی جوڵە و دەستپێکردن بە بەسدەزانێت بۆ گەیشتن بە مەبەست و ئامانج. زەمیران ئاماژە بە لێکۆڵینەوە هاوبەشەکانی دولۆز و گوتاری دەکات کە لە ئەنجامدا بووە هۆی نوسینی کتێبێکی دووبەرگی و گوتی بەرگی یەکەمی ئەو لێکۆڵینەوانە ناوی "دژە ئۆدیپ" بوو کە تیایدا رەخنەی توندیان سیستەمی مارکسیتی و فەلسەفەی مارکس گرتووە و پاشان هەڵسەنگاندنیان بۆ کردوە. دولۆز و گوتاری دەرونشیکاریەکانی (لاکان) بە لوتکەی کاریگەریەتیەکانی مارکسیزم لێکدەدەنەوە. لەم بەرهەمەیاندا رووبەرووی رەخنەیەکی نوێ دەبینەوە کە بەرانبەر بە مۆدێرنیتە کراوە و تەوەری رەخنەکانیش رووبەروی سەرمایەداری دەبێتەوە. دولۆز و گوتاری لە رووبەروبوونەوەیاندا لەگەڵ دەرونشیکاریدا، راڤەی شیزۆفرینیایان خستەبەر باس و بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە مەبەست لە نوسینی ئەو تیوریە لە ریشە دەرهێنانی رووبەروبوونەوە دوو رەهەندیەکان و رەدکردنەوەی مۆدێرنیتەیە بۆ زەینیەت. هاوکات لەگەڵ ئەوەدا زەمیران ئاماژە بەو بابەتە دەکات کە دولۆز و گوتاری پرۆسەی سەرکوتکردنی حەز و ئارەزو بە رێگای سنوردارکردنی هەوێنە بەرهەمهێنەرەکانەوە دەبینن کە لە سنوردارخستن یان لە بەرفراوان خستن و بەردانی حەز لە چوارچێوە و پێوەرە سەر سورهێنەرە کۆمەڵایەتیەکاندا بە نێوی سڕینەوەی پانتایی و سڕینەوەی سنوردارکردنەکان دەناسرێت و زەمیران لەم بوارەدا لەسەر شێوازی دروستترین شێوەی سڕینەوەی سنوردارکردن و سڕینەوەی پانتایی سەرمایەداری دەڵێت: دەتوانین باشترین بەڵگەی دروست بۆ ئەم بابەتە لە دروستکردنی کەسایەتی شیزۆفرینیادا دەبینین بە پێی بۆچوونی

دولۆز و گوتاری شیزۆفرینیا نەخۆشی یان شێوەیەکی بایەلۆژیکی نییە، بەڵکو هەلومەرجی دەروونییە کە دەیەوێت گەڕانەوەیان سەرهەڵدانەوەی رزگاریدەربوونی بۆ هەموار بکات. دەتوانین شیزۆفرنیا بە بەرهەمی کردنەوەی نەهێنیە رەهاکان بزانین. کەسایەتی شیزۆفرینیا زەینیەتی خۆی لە قەید و شەرتی راستیە بورژوازیەکان و خودی سەرکوتکار و سنوردارکردنەکانی نەست رزگار دەکات و ئەو داو و تۆڕانەی کە ئۆدیپ بۆی ناوەتەوە وەلا دەنێت. لەم رووەوەیە کە دەبێت شیزۆفرنیا بە مەترسیەکی قورس لێکبدەینەوە بۆ سەر سەرمایەداری. پرۆسەی شیزۆفرنیا بە ئامادەکاری بۆ رزگارکاربوونی پۆست مۆدێرنیزم دەژمێردرێت، لە واتایەکی دیکەدا شیزۆفرنیا بە مەترسیەکی جدی دەژمێردرێت بۆ سەر کاپیتالیزم و مۆدێرنیتە. لە مانایەکی دیکەدا پرۆسەی شیزۆفرنیا تایبەتمەندی هەلاَتن لە تەوەر و ناوەندی هەیە و کەسایەتی پارانۆیا و فاشیست بەرەو شۆڕش دەورووژێنێت.

لە کۆتایی ئەم دانیشتنەدا دوکتور محەمەد زەمیران سەبارەت بە دوایین بەرهەمی خۆی بە ناونیشانی "سەرەتایەك بۆ نیشانە ناسی هونەر" گوتی: لەگەڵ دەرکەوتنی مۆدێرنیتە لە ئێراندا تەنها رێگا بۆ ئاشنابوون لەگەڵ زانست تەکنەلۆژیای رۆژئاوادا وەرگێڕان بوو، لەو سەردەمە بەدواوە وەرگێڕان لە شێوازی وشە بە وشە و، وەرگێڕانی واتا یان کولتوری هاتۆتە ئاراوە. بیرمەندانی ئێمە خواستویانە بە یەکێك لەو دوو شێوازە ئەو کێشە و گرفتانە کەم بکەنەوە کە کۆمەڵگای ئێمە بۆ رووبەروو بوونەوە لەگەڵ کولتوری خۆرئاوادا هەیبووە. ئەگەرچی لە زۆر بواردا وەرگێڕانی وشە بە وشە یارمەتیدەرمان بووە، بەلاَم لەو بڕوایەدام وەرگێڕانی کولتوری گونجاوترە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانمان، چونکە رۆحی گشت ئەو لێکۆڵینەوانەی کە 150 ساڵ پێش ئێستا ئەنجامدراون لە خۆیدا کۆدەکاتەوە. نوسینەکانی منیش پەیڕەوی لەم شێوازەی وەرگێڕان دەکات. لە یەکێك لەو سیمینارانەدا کە بۆ لێکۆڵینەوەی خولی دوکتۆرا جێبەجێمان دەکرد، نیشانە ناسیمان وەك بەشێك لە لێکۆڵینەوەکان خستەمەیدان و لەو سیمینارەدا کتێبی "چندلر"مان وەك دەقی وانەیی پێشکەش کرد. زەمیران گوتی رۆحی وەرگێڕان بەسەرهەموو نوسینەکانی مندا زاڵن. جیاوازی شێوازی وەرگێڕانی کولتوری لەگەڵ شێوازی وشە بە وشە لەوەدایە کە کاتێك بابەتێك دەربارەی فەیلەسوفێك دەنوسم قەت بە تەنهایی لەیەك کتێب سود وەرناگرم، بەڵکو لە چەندین بەرهەم سود وەردەگرم تاکو واتای دروستی چەمکەکان بگوێزمەوە. قەت مەبەستی من گواستنەوەی (رووتی) وشە و زاراوەکان نیین، بەڵکو ئامانجی من گواستنەوەی کولتوریە و ئەو بابەتە بە ئەرکی خۆم دەزانم کە ئەو ئەندێشانەی لەم سەردەمەدا سودیان بۆ کۆمەڵگاکەمان هەیە وەربگێڕمە سەر زمانی خۆمان و پێشکەشی ئەو کەسانەی دەکەم کە لە زمانەکانی دیکەدا شارەزانیین و دەرفەتیان نییە سود لەو زمانانە وەربگرن.

## سەرچاوە

رۆژنامەی شەرق/ ژمارە 118، 1382

# ئۆگەستیزم لە ئەدەبدا

دێڤید نۆکس

لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

سالآنێکە زاراوەی "ئۆگەستی *Augustan*"[1] دووچاری بەدحاڵیبونێکی گەورە بۆتەوە، کە مایەی گاڵتەجارییەکی ڕەخنەییە. دۆناڵد گرین *Donald Green* (1967: 76) پێیوابوو کە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەیەم سەردەمێکی ئۆگەستینی *Ugustinian*[2] بوو، واتە مۆرکێکی مەسیحیانەی هەبوو، زیاتر لەوەی ئۆگەستی *Augustan* بێ، کە ڕیشەکانی دەگەڕێتەوە بۆ بتپەرستی چاخی ئۆگەستی لاتینی. ئێمەش لای خۆمانەوە – بە هەمان لۆجیك و بە دەستکارییەکی زیاترەوە – دەتوانین وەسفی ئەدەبی نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیە بکەین بەوەی سەر بە هەر چاخێکە (کە خوێنەر ئارەزووی دەکا). بەڵام ماکسیمیلیان نۆڤاك *Maximillian E. Novak* وای پێچاکە ناوی بنێ چاخی برۆتسی *Brutan Age*، چونکە بانگەوازکردن بۆ ئازادی لە ئینگلتەرای ئەو سەردەمەدا ئیلهامی لە (برۆتس *Brutus*)ی یەکەمەوە وەردەگرت، کە بانگەوازی بۆ ئازادی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دەکرد، هەروەها دواهەمین برۆتس کە بەرگری لەو ئیمپراتۆرە دەکرد[3]. (1984: 2). ساڵی 1916 زاراوەی "ئۆگەستی" گورزێکی کۆمیدی لە سەردەستی جۆرج سانسبێری *George Sanstsbury*بەرکەوت، ئەوەش لە کتێبەکەیدا بەناونیشانی "ژیانی ئارامی ئۆگەستییەکان *The peace of Augustans*" ناونیشانی فەرعی ئەو کتێبە بریتییە لەمە: "دیدێکی گشتی بۆ ئەدەب لە سەدەی هەژدەیەمدا بەو پێیەی دەرەتانێك بووە بۆ ئارامی و پشوودان" (کە ئینگلیزیەکەی ئەمەبوو: *A survey of Eighteen Century Literature as a place of Rest and Refreshment.*).

پاش نزیکەی شەست ساڵ (پات ڕۆجەرس *Pat Rogers*) لە کتێبی "دیدی ئۆگستی *Augustan Vision*"دا ئەو چاخەی وەسفکردووە بەوەی هەڵگری ئارەزوویەکی کاتی بووە نەك ئارامگەیەك یان ئاهەنگێکی تەواو، (ئەو وەسفە ڕووندەکاتەوە) و دەڵێ: ئینگلتەرا لە سەدەی هەژدەدا هەڵگری کۆدژییەکی ڕوون و ئاشکرا بوو کە دوو ڕووی دژبەیەکی هەبوو: هەژاری و دەوڵەمەندی،

ڕۆشنبیری و دواکەوتن، شارستانیەت و دڕەندەیی" (1974: 9). دواجار کلود ڕاوسۆن *Claud Rawson* پێیوایە "زاراوەی ئۆگستی مەبەستی خۆی دەپێکی، چونکە بە جۆرێك لە جۆرەکان هەڵگری هیچ مانایەك نییە" (1985: 243).

پێناسە باوەکانی زاراوەی ئۆگستی واتایەکی ئایدیۆلۆجی گرنگ دەبەخشن کە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد *OED* بەم دوو خاڵە گوزارشتی لێکردووە:

"1-ئۆگستی (یان ئۆگەستان) *Augustan* ئەو سەردەمەیە کە پەیوەندیی بە دەسەڵاتی ئۆگستی قەیسەرەوە هەیە، کە سەردەمی بوژانەوەی ئەدەبی لاتینییە (1704).

2-سەردەمی بوژانەوە و پوختەکردن و پەرەدانە بە ئەدەبی هەر نەتەوەیەك لە نەتەوەکان."

ئەڵبەتە پێناسەی یەکەم کە دەسەڵاتی پادشایی بەستۆتەوە بە بوژانەوە و پوختەکردنی ئەدەبەوە حاڵەتێك لە ناڕەزایی ڕەخنەیی دەبەخشێ بە زاراوەکە، چونکە دەمانباتەوە سەر کووچە تەنگەبەرەکانی سیاسەت. ئارەزووی ئەوەی زاراوەیەك بدۆزرێتەوە کە بگونجێ لەگەڵ پێشهاتە ئاڵۆزەکانی چاخێك کە ئیلهام وەرگری چاخی ڕۆمانی و ئۆگستی بوو – بە هەموو تەماحە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانی ئەو چاخەوە – خۆی لە خۆیدا بەرزڕاگرتن و نزمڕاگرتنە لە یەك کاتدا. درایدەن *Dryden* یەکێك بوو لە یەکەمین ئەو کەسانەی کە نمونەی ئۆگستی یان بەشێوەیەکی مەبەستدار وەگەرخست و باوەشیانکرد بەو بیرۆکانەی دەرهاویشتەی ئەو نمونەیە بوون، بە ئەندازەیەك هەروەك نۆڤاك دەڵێ: ئاستەم بوو بیر لە چاخێکی ئۆگستی نوێ بکەنەوە، بەڵکو تاکە خەمیان ئەوە بوو ئەو چاخە وەك خۆی دووبارە بکەنەوە. (1984: 2). لە چەند بەشێکی چامە شیعریەکەیدا (*Astraea Redux*) دڕایدەن ئیلهام لە (شوانکارەیی چوارەم)ی ڤرجیل وەردەگرێ، گەڕانەوەی چارلزی دووەم بۆ ئینگلتەرا (1660) بەراورد دەکات گەڕانەوەی دەسەڵاتی پادشایی و سەرکەوتی ئۆکتاڤیو (کە دواتر بووە یولیۆس قەیسەر) لەسەر کەشتی مارك ئەنتۆنی و کیلۆباترە لە جەنگی ئاکتیۆم-دا (31 پ.ز)، پاشان پێشبینی هاتنی چاخێکی زێڕینی نوێ دەکا کە لێوانلێوە لە ئاسایش و خۆشی و بوژانەوە و شیعر:

ئەی چاخی خۆشبەخت! ئەی ئەو سەردەمە دەگمەنانەی
کە چارەنوس بۆ عەرشی ئۆگەستی مەزنی هەڵگرتووە
چاخێك کە سەرکەوتنەکانی شانبەشانی داهێنانی هونەرین
موژدەی پادشایەك دەدا بە گوێی جیهاندا، کە تۆی!

لەگەڵ ئەوەشدا چاخی (ئۆگەستس)ی قەیسەر، هەروەك ڕەخنەگرانی ئەدەب سەرنجیانداوە، چاخی ستەمگەری و شەڕ بووە بەو ئەندازەیەی چاخی لێبوردن و شیعر بووە. گرنگترین خاسڵەتی ئەو سەردەمە – هەروەك دۆناڵد گرین دەڵێ – لەوەدا دەردەکەوێ کە "ئێمە لە ئاست ئیمپراتۆریایەکی تۆتالیتارداین کە ستەمگەرێکی بەهێز و بە توانا حوکمیدەکا، کە توانیویەتی ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیبانی بە توانای وەك هۆراس و ڤرجیل کۆبکاتەوە، ئەو ئەدیبانەی کە توانییان نایابترین ئەدەبی بانگەوازکار و ئاڕاستەکراو لە مێژوودا تۆماربکەن" (67 – 1976/ 1975: 128). کەواتە ئایا ئۆگەستیزم هاوواتایەکی مەجازیی ئیمپریالیەتی کۆلۆنیالییە؟ لۆرا براون *Laura Brown*

ڕایەکی لەمجۆرەی هەیە و، پێیوایە کە چامەی پۆپ-ی شوانکارەیی (دارستانی ویندسۆر *Windsor Forest* 1713) هەموو شفرە ئیستاتیکیەکانی ئیمپریالیزم لە خۆدەگرێ (1985: 37). کارە گەورەکانی پۆپ-یش هیچ نیە جگە لەو بەڵگەنامانەی کە ڕەنگدانەوەی پێشهات و ئایدیۆلۆجیای ئەو سەردەمەن، کە پشتئەستوورن بە وێنەکانی ڕابردووی کۆن لە پێناو داپۆشینی سەرمایەداری و ئیمپریالیزمدا (ل3). لە ڕاستیدا گروپێك لە ئەدیبە ناودارەکانی ئەو دەمە – لە نێویاندا درایدەن – بەهرەی ئەدەبی خۆیان تەرخانکردبوو بۆ خزمەتی دەسەڵات و بانگەشەکردن و ستایشکردنی ڕژێمی دەسەڵاتدار. بەڵام ژمارەیەکی زۆری ڕەخنەگرە ئەکادیمییەکانی سەدەی بیستەم پێیانوایە کە ستایشنامەکانی ئەوان مەترسییان کەمترە بە بەراورد لەگەڵ ئەدەبی هیجایی ئۆگەستس کە نوقمی هالەیەکی زمانەوانی بوو لە زیادەڕۆیی و ڕەخنە لە خۆگرتن. پاشان ئەو ڕەخنەگرانە بەوردیی لە دیاردەی ئۆگستی لێکۆڵینەوەیان ئەنجامداوە و لە بابەتگەلێکی وەك لاواندنەوە و هیجا واتای نوێیان هەڵێنجاوە سەبارەت بە خواستی ئەدیبانی ئەو دەمە بۆ جیاکردنەوەی وێنەی هونەریی پەتی *iconography* لە تێزە سیاسی و ئایدیۆلۆجیەکان *ideology*. زۆر جاریش سەرکەوتنیان لەو بوارەدا بەدەستهێناوە و پشتئەستووربوون بە وێنەی وەرگیراو لە (هۆراس) لە بری وێنەکانی چاخی ئۆگستی، هۆراس کاتی خۆی پایەیەکی سیاسی باڵای لە حکومەتی ئۆگەستی قەیسەردا ڕەتکردەوە. بەوەش ئازادی هونەری و کەرامەت و سەربەخۆیی ڕۆشنبیریی خۆی خستە سەروو فریوەکانی دەسەڵات و ڕژێمی سیاسی دەسەڵاتدار.

زاراوەی "ئۆگەستی" هەڵگری دەلالەتێکی گشتی و نەرمییەکی پۆزەتیڤی ئەوتۆیە – کە هەروەك ڕاسۆن دەڵێ – مانایەکی کراوەی هەیە بە جۆرێك واتایەکی دیاریکراو نابەخشێ. (ئەو تایبەتمەندییە) دەستی ئەدیبەکانی چاخی ئۆگەستیی والاکرد تا کانگایەکی دەوڵەمەند بۆ خەیاڵیان و ئازادیی هونەرییان بدۆزنەوە. "هەرچەندە ئۆگەستیزم دوژمنایەتی هەموو شتێکی دەکرد کە لەو چاخەدا باو بوو، بەڵام نەرێخوازیی لەو چاخەدا کاریگەریی پۆزەتیڤی لێکەوتەوە.. نەغمەیەکی پەنهانی تەوس و هەجووی بەخشییە چامەکانی مەدح و پیاهەڵدان، ئایدیالیزمی سیاسیشی خستە ژێر بەشێك لە بار و سێبەری واقعی تاڵ" (1985، ل 247). کارەکانی پۆپ و سویفت کە کاری هەجو بوون نیگەرانی نێوان بەهاکانی ئازادی و دەسەڵاتگەری بەرجەستە دەکەن، شایەتی ئەوەن کە وێنەکانی چاخی ئۆگەستی لە وەسفی ئەو کۆدژییەدا سروشتی دووفاقیان هەبووە، کەسی هونەرمەندیش دوو دڵ بووە لە نێوان مەرجە هونەرییەکان و پاشهاتی سیاسی و کۆمەڵایەتیی کارەکەیدا.

هەندێ کۆششی ڕەخنەیی هاوچەرخ هەن سەبارەت بە بڕیاردان لەسەر زاراوەی "ئۆگەستی"، هەندێکیان جەخت لەسەر واتای ئایدیۆلۆجی ئەو زاراوەیە دەکەنەوە و هەندێکیان زاراوەی ئاڵتەرناتیڤ بەکاردێنن تا ڕزگاری بکەن و بەتاڵی بکەنەوە لە ناوەڕۆکە سیاسی و ئیمپریالیەکان، وەك زاراوەی هۆراسی *Horatian* یان برۆتسی *Brutan*. بەڵام ئەو کۆششە ڕەخنەییانە ئەوە دەردەخەن کە ناڕازین بە پێناسەکەی ڕاوسۆن، چونکە ئەو سیفەتی گشتاندن و ڕەهابوون و نەرمیی ئەرێخواز دەبەخشێ بە زاراوەکە. لۆرا براون نکوڵی لە ئازادی

و خواستی هونەرمەند دەکا سەبارەت وێنەگرتنی هونەریی پەتی، چونکە چەمکی ئایدیۆلۆجی (ئیمپریالی) بەشێکی دانەبڕاوە لە پرۆسەی داهێنانی هونەری لە ئەدەبی ئۆگەستیدا. لە باسکردنی چامەی شیعریی (پەیامێك بۆ باتێرست *Epistle to Bathurst*) کە لێوانلێوە لە هێرشی رەخنەیی بۆ سەرمایەداری، لۆرا براون بیێ هیچ دوو دڵییەك ئەو قەسیدەیە بە جادوویەکی ئیمپریالی لە قەڵەم دەدا کە بە ئەفسونی ڕەوانبێژیی ئەقڵ دەوەستێنی و سیستمێك پیرۆز دەکا، کە لە بنەڕەتدا گاڵتەی پێدەکا. (1985، ل 111).

ئەو ناڕەزاییەی کە لە ئاست گشتاندنی زاراوەی "ئۆگەستی"دا بوو تەنها پەیوەندیی بە بابەتەکانی ئەو سەردەمەو ناوەرۆکەکەیەوە نەبوو، بەڵکو پەیوەندیی بە فۆرمەکانی ئەو ئەدەبەشەوە هەبوو. (جۆنسۆن) پێی وایە (درایدەن) یەکەمین کەس بووە کە دروشمی ئۆگەستی بە گشتی لە بابەت و شێوازی شیعرەکانیدا بەرجەستەکردووە، لەو بارەیەوە دەڵێ: "دەکرێ بە گوزارشتێکی مەجازی ئاسان دەربارەی شیعری ئینگلیزی بڵێین کە ئەو شیعرە لەسەر دەستی درایدەن زەخرەفە و نەخش و نیگارەی پۆشیوە هەروەك چۆن دەتوانین بڵێین رۆما لەسەر دەستی ئیمپراتۆر ئۆگەستس ڕازاوەتەوە، ئەو ئیمپراتۆرەی کە بیناو تەلارەکانی ئەو شارەی لە خشتەوە کرد بە مەڕمەڕ.

پێویسە لەسەر ئەو فرێزەی جۆنسۆن بوەستین کە دەڵێ "بە گوزارشتێکی مەجازیی ئاسان"، چونکە "سیفەتی رازاندنەوە و زەخرەفە" واتای گەشەکردنی بنەڕەتیی لە بنیاتی گشتیدا ناگەیەنێ، بەڵکو مانای رازاندنەوەی کلاسیکی دەگەیەنێ. چونکە زەخرەفەی روخامی و مەڕمەڕیی لە شیعری ئۆگەستیدا، وەك تەفعیلەی ئیامبی *Iambic* کە لە بەیتی شیعریدا دووبارە دەبێتەوە، یان دووبەیتی مەلحەمی *heroic couplet* کە قەبەیی دەبەخشێ بە شیعر تا بۆ بۆنە ڕەسمییەکان بشێن، بەڵام سەرباری ئەو گۆڕانکاریانە بنیاتی گشتی وەك خۆی مابۆوە. چەند رەخنەگرێکی سەدەی بیستەم دیدێکی لەم جۆرەیان هەیە و لە پشت رواڵەتی کلاسیکی شیعری ئۆگەستییەوە بەدوای ئەدگارەکانی کەلەپوری میللی و ناوخۆدا گەڕاون. بۆنمونە ف.ر. لیڤیز (1936–1964) و ت.س. ئیلیۆت (1921–1932) و مینارد ماك *Maynard mack* (1949–1959). لە زنجیرە وتارێکی گرنگدا هەوڵیان داوە "هێڵی زیرەکی *Line of wit*" لە شیعری (پۆپ *Pope*)دا بدۆزنەوە، هەروەها هەوڵیانداوە هەمان هێڵ لای درایدەن بدۆزنەوە و گرێی بدەنەوە بە بنەمای نیشتمانی و لۆکاڵی لە شیعرەکانی (دۆن *Donne*)دا.

یەکێك لە گرنگترین ئەنجامەکانی ئەم هەوڵ و کۆششانەی کە خرانە گەڕ، تا درایدەن و پۆپ لە چوارچێوەی شاعیرە میتافیزیکییە هاوچەرخەکاندا ئەژمار بکرێن.. بریتی بوو لە بەکارهێنانی چەند زاراوەیەك کە مۆرکی سیاسییان پێوەدیاربوو لە دایەلۆگی سیاسیی سەدەی هەژدەدا. هۆکاری ئەو بەکارهێنانەش دەگەڕایەوە بۆ ئەو وەهمەی رەخنەگران تێی کەوتبوون بەوەی دۆخێکی دابەشبوون و دژبوون هەیە لە نێوان خەیاڵێکدا کە زادەی کەلەپوری نیشتمانییە کە لە شکسپیر و دۆن دا بەرجەستە دەبوو، لەگەڵ کاریگەرییە کولتورییە دەرەکییەکان کە یاسا کلاسیکییە تازەکان *Neo – Classicism* نوێنەرایەتییان دەکرد، ئەو یاسایانەی کە ڕەمەکی و نامۆ بوون لە رووی تیۆرییەوە لیڤیز دەڵێ: "بلیمەتیی دڕایدەن بە ڕوونی لەوەدا دەردەکەوێ کە توانای بەسەر زمانی ئینگلیزی و ئاستە شاراوەکانی ئەو زمانەدا دەشکێ. هەر بۆیە

هۆپکنز *Hopkns* دەڵێ: "درایدەن کەڵترین شاعیری ئینگلیزیدا، ستایڵ و کێشی شیعرەکانی ئەو بەهێزترین کۆڵەکەی ئەدەبە کەمانی لە پتەوترین و رەقترین زەمینەی زمانی ئینگلیزیدا داکوتیوە". (1936–1964، ل33). لیڤیز پێیوایە کە "هێڵی زیرەکی" کە لە پۆپ دا کۆتایی دێ جۆرە شیعرێکی لە دوای خۆی بەجێهێشتووە کە زبری و نێرەینەیی ئینگلیزیی تێدایە نەك لوسی مەرمەڕی ئیتالی. لە سەدەی هەژدەدا ئەدیب و ڕەخنەگر جۆن دێنیس *John Dennis* ڕەخنەی لە چامەیەکی شیعریی پۆپ گرت بەناونیشانی وتارێك دەربارەی ڕەخنە *Essay on Criticism*[4]. چونکە ئەو چامەیە نکوڵی لەوە دەکا کە ئینگلیزە ئازادەکان مافی ئەدەبییان هەبێ و چامەیەکە ملکەچی تەواوی یاسا و ئایکۆنە کلاسیکیەکانە. پاشان پۆپ تۆمەتباردەکا و دەڵێ: "ئەو تەنها دوژمنی من نییە، بەڵکو دوژمنی پادشاکەم *King* و نیشتمانەکەم *Country* و عەقیدەکەم *Religion* و دوژمنی ئازادیشە *Liberty* کە تاقە ڕۆشنایی ژیانمە" (ساغکردنەوەی هۆکەر *Hooker*، 1939، بەرگی 2، ل 115).

ساڵی 1936 لیڤیز لێکۆڵینەوەیەکی بەناوبانگی نوسی لە ژێر ناونیشانی (سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنی پۆپ)، لەسەرەتای ئەو لێکۆڵینەوەیەدا دەڵێ: "پۆپ کەسێکی بەدبەخت بووە". بەڵام سێ دەیە دوای ئەو لێکۆڵینەوەیە گۆڕانکارییەکی یەکلاکەرەوە لە بەختی ئەو ئەدیبە و ئەدیبە گەورەکانی چاخی ئۆگەستی ڕوویدا لەسەر دەستی شوێنکەوتووانی ڕەخنەی نوێ *New Criticism*. چیدی پۆپ ئەو دڕندە بچووکە نەما کە دانیشتووی شارۆچکەی تویکنهام *Twinckenham* بوو، بەڵکو بووە میری شیعری داستان و هیجا و پارێزەری بەها مرۆییەکان. هەروەها درایدەن — لە دیدی ڕەخنەگرە نوێیەکاندا — وەك پیاوی هەموو چاخەکان و هەموو ڕژێمە سیاسیەکان نەمایەوە، بەڵکو بووە بانگەوازچی ڕێچکەی زیندوی گومان و کولتورێك کە شایەنی ڕێزگرتنە. هەروەها ئەو دروشمە بریندارکەرە لە سویفت *Swift* کرایەوە کە ساکێری *Thackeray* پێوەی لکاندبوو" وتەکانی وەك خوڵ وشکن، بیرۆکەکانی ئازاربەخشن، تورە و ڕق ئەستور و قسە ڕەقە"، بەڵکو بەرزکرایەوە بۆ پلەی پیاوە بەئاکار و تێکۆشەرەکان. هەروەك چۆن پێشوازی لە جۆنسۆن *Johnson* کرا و ئیعتراف بە لۆجیك و بەڵگەکانی کرا، بەڵام بەو شێوازە پڕ هەست و سۆزە نا کە نوسەرێکی وەك تۆماس ماکولی *Macaulay* (1800–1859) لە ئاستیدا نیشانی دابوو.

لێرەوە دەردەکەوێ کە ڕەخنەگرە نوێیەکان *New Critics* لە بزاوتی ئۆگەستیدا شتێکیان دۆزیبۆوە کە لەگەڵ بایەخە ڕۆشنبیریەکانی خۆیان و بانگەوازی ڕەخنەییاندا دەگونجا. چونکە ئەدیبە ئۆگەستییەکان، کە هونەر و سروشت و نەریت و بەهرەیان پێکەوە تێکەڵ کردبوو، نوێنەرایەتی ئەو چەمکە ڕۆشنبیرییە بنەڕەتیانەیان دەکرد کە لەگەڵ تەواوی فۆرمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسییدا دەگونجان لە پێناو بەهاگەلێکی ئەخلاقیدا کە دوانمایەتی بایەخی مرۆیین. ڕەخنەگرە نوێیەکان بایەخێکی زۆریان بە ئەدەبی سەدەی هەژدە و تایبەتمەندیی ئەو ئەدەبە بەخشێ سەبارەت بە کۆکردنەوەی نێوان مانا و دژەمانا، ئاڵۆزی، فرە مانایی و هاودژی[5].. ئەو تایبەتمەندییانە ئەگەری دامەزراندنی نەزمێکی ئیستاتیکیی نەرمیان هێنایەکایەوە، کە لە یەك کاتدا توانای لەخۆگرتن و سنوردارکردنی پێکهاتە پەرتەکانی ئەزموونی مرۆییان هەبێ، لە ڕێگای ئەو دەنگە جیاوازانەوە کە

لە دەقی ئەدەبیدا هەیە. بە مانایەکی تر هەروەکو یەکێك لە رەخنەگرەکان وتی:

"رەخنەگرە نوێیەکان جیهانیان وەك دارو پەردوو بینییەوە، کە ویستیان سەرلەنوێ کۆی بکەنەوە و بنیاتی بنێنەوە. لێرەوە فەرهەنگی رەخنەیی ئەوان ناوازە بوو.. بینیمان بروکس Brooks شەیدای کۆدژیی (*paradox*)ە، کە لە یەك کاتدا دوو ڕەگەزی هاودژ پێکەوە کۆدەکاتەوە. هەروەها وارین *Warren* شەیدای بیرۆکەی شیعری ناپەتی بوو *impure poetry* کە لە ڕوانیندا پشتئەستوورە بە نوێنەرایەتیکردنی هاودژەکەی خۆی. پاشان هەریەك لە برۆکس و وارین پابەند بوون بە بیرۆکەی پێکەوە ئاوێتەبوونی فۆرم و ناوەرۆك" (*Fetterley, 1985. p. 16*).

رەخنەگرە نوێیەکان لە شیکردنەوەی تایبەتمەندیی عەروزی شیعری ئۆگەستیدا پێیان وایە کە هاوسەنگی ڕاگرتنی نێوان ریتمە هاودژەکان تەنها دووبارەبوونەوەیەکی ڕواڵەتی و رۆتینی نییە لە پێناو دروستکردنی هارمۆنیدا، بەڵکو (بەرجەستەبوونێکی خەیاڵیی) ئاڵۆزییەکانی سروشتی مرۆڤە. لای ئەو رەخنەگرانە ئامانجی پێکەوە گونجاندنی توخمە نە شازەکان *Concordia discord* لە شیعرەکانی پۆپ و بەگەڕخستنی ڕەگەزی دەمامکی تەوسئامێز *Ironic masks* لە گێڕانەوەکانی سویفت-دا بریتییە لە پێشکەشکردنی جیهانێك لەلایەن ئەو ئەدیبانەوە، کە لەیەك کاتدا جیهانێکی شارستانییە و نوقمی پاشاگەردانییشە. بە بڕوای ئەوان بایەخدانی بێوچانی ئەدیبانی چاخی ئۆگەستی بە فۆرمەکانی هاودژیی ریتۆرێکی کە لەسەر توخمەکانی تەوریە *puns*، کۆدژیی *paradox* و ئەنتی تێز *Antitheses* دامەزرابوون" جۆرێك بووە لە گوزارشتکردن و

ئارەزووکردنی گەیشتن بە فۆرمێکی تایبەت کە هێندەی نیگەرانی و بەرەنگاریی دەبزوێنێ هێندە ئارامی و خۆشنوودی نابەخشێ. رەخنەگرە نوێیەکان پێیان وابوو پشتبەستنی ئەدیبانی ئۆگەستی بە نموونەی هۆراسی لەوەی کە پۆستە سیاسییە باڵاکانی حکومەتی ئۆگەستس قەیسەریان ڕەتدەکردەوە.. دەلالەت لەوە ناکا کە ئەو ئەدیبانە کەسانی گوێڕایەڵ و بێ ئیرادە بوون یان کەسانی خۆ بە زلزان بوون، بەڵکو جۆرێك بووە لە جاڕدانی سەربەخۆیی رۆشنبیری کە لە واقعی کۆمەڵایەتی جیهانی ئەواندا ڕەگی داکوتی بوو. ئەو ئەدیبانە زۆر بە چاکی سەربەخۆیی خۆیان بەشێوەیەکی ئەدەبی و هونەری بەگەڕخستبوو لە پێناو وێناکردنی خەمە ئەخلاقی و مرۆییەکانیاندا.

مینارد ماك *Maynard Mack* لە وتارێکدا بەناونیشانی زیرەکی و شیعری پۆپ *Wit and Poetry and Pope* گوزارشتی لەو دەروازە رەخنەییە کردبوو. لە شیکردنەوەی وێنەی نارسیسا *Narcissa*[6]، کە لە دێڕە شیعرێکی چامەکەی پۆپ (پەیامێك بۆ کۆبهام *Epistle to Cobham*)دا بەم جۆرە هاتووە:

"چەندە دزێوە! لە کفنێکی خامدا! کە خواپەرستەکانیش بێزی لێدەکەنەوە"

"*Odious! In wollen! Twould a saint provoke!*"

ماك لە شیکردنەوەی ئەو دێڕە شیعرەدا دەڵێ:

"لێرەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە لە چامەکەدا سانایی بیرۆکە هەیە، کە هەموو شتەکان تەفسیر دەکا.

بیرۆکەکەش ئەوەیە کە حەز و ئارەزووەکانمان تا دوا شوێن جڵەومان دەکەن. بەڵام کاتێ لە وێنە مەجازییەکە ورددەبینەوە دەبینین بە قوڵایی ئەو

قەیرانەدا شۆڕدەبێتەوە کە باڵی بەسەر مرۆڤدا کێشاوە، لە ڕێگای وێناکردنی کەسایەتی ئافرەتێکەوە. ئێمە لەبەردەم ئافرەتێکی نەرجسیی گەمژەداین، کە عاشقی خۆیەتی، ناوی ئەو کە (نێرسیسا)یە هێمایە بۆ ئەو کەسایەتییە. بەڵام هەر ئەو هێمایە فراوان دەبێ و لە مانا بەرتەسکەکە ڕزگاری دەبێ. تا دواتر دەلالەت لەوە دەکا کە لە ناو هەریەکێك لە ئێمەدا کەسێکی نەرجسی هەیە کە بەشێکی بنەڕەتیی شوناسی هەر یەکێکمانە کە ناتوانین بیسڕینەوە یان نکوڵی لێبکەین. ئێمە لە ئاست بایەخدانێکی بێ ماناداین بە دیاردە هەڵخەڵەتێنەرەکان، کە لە بۆنەیەکی وادا لە ڕێی ئاڵۆزی و ناکۆکییەوە قەبە دەکرێ، سەرباری ئەوەی لە ناخی هەر مرۆڤێکدا خواستێکی غەریزی هەیە بۆ باوەشکردن بە شتە مەئلوف و ناسراوەکاندا. هەموو ئەم مانایانە لە چوارچێوەیەکی میحوەریدا دەسوڕێتەوە سەبارەت بە کۆدژیی لە هەست و سۆزی مرۆڤایەتیدا دەربارەی مەرگ و ژیان: چونکە دەست و قاچی مردووەکان پێویستیان بە داپۆشین نییە، هەروەها ڕوخسیاریشیان کفنی ناوێ. بەڵام سروتەکانی مەرگ لای ئێمە بەجۆرێك لە جۆرەکان (ئەو مەراسیمە)یان دەوێ. کە بەگوێرەی ئەو ڕەخنەیە ئاستەکانی سۆز و ئەزمونی مرۆیی لەو دێڕە شیعرییەدا دەوروژێنێ".

(*Mack, (1949) 1959, pp.34-5* )

"ماك" لە دەروازە ڕەخنەییەکەیدا نکوڵی لە هەر گومانێکی تەقریری دەکا لە شیعرەکانی "پۆپ"دا، لە خوێندنەوەی وردی ئەم پەرەگرافەشدا دەردەکەوێ کە بە قووڵایی بە جیهانبینی شیعریدا ڕۆچووە تا وێنەکان و واتا فراوانەکانی وێنەکان لێرەو لەوێ کۆبکاتەوەو لە چوارچێوەیەکی خەیاڵیدا یەکیان بخا لە پێناو مەبەستێکی ئەخلاقی و مرۆیی کاریگەردا. ڕێچکەیەکی لەمجۆرە لە کۆششە ڕەخنەییەکانی پاش جەنگی جیهانی دووەمدا دەبینینەوە، لە پێناو سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنەوەی نوسینە هیجاییەکانی "سویفت". ئەو کۆششە ڕەخنەییانە گەیشتبوونە ئەو دەرەنجامەی کە وێنە تەوسئامێزەکان و ڕەگەزەکانی کۆدژی و بادانەوە لەو نوسینانەدا جۆرێك بوون لە ئەنگێزەی ئەخلاقی بۆ جیاکردنەوەی خێر لە شەڕ. لە شیکردنەوەیەکی ڕەخنەییدا دەربارەی بڵاوکراوەی هیجایی سویفت بەناونیشانی "پێشنیازێکی خاکی *A Modest Proposal*"[7]. مارتن پرایس *Martin Price* دەگاتە دەرەنجامێك و دەڵێ:

"خاوەنی (پێشنیازی خاکی) یەك بەیەکمان دەخاتە نێو چەقی دێوانەیی خۆیەوە. کاڵبوونەوەی هەست و سۆزەکانی بەشێکی تری ئەو کۆدژییەیە کە وەك تاوانەکانی گەندەڵیی ئەخلاقیی قێزەونە. ئەوە فێڵێك بوو کە سویفت لە نوسینەکانی خۆیدا بە گەڕی دەخست: کەسە گێل و نەخۆشەکان لای ئەو هەروەك ئەو کەسە ساختەچییانە ناشرین بوون کە هەڵیاندەخەڵەتاندن. ئەو کۆدژییە لە ڕواڵەتدا کۆمیدیایەك دەردەخا کە هەست بە بەرپرسیارێتی ناکا و لە ڕووی ئەخلاقییەوە بێ ئاگایە، کە نوسەرێکی مامۆستا و بیریارێکی وریاش نوسیویەتی. بەڵام کۆدژیەکە لە کرۆکدا باس لەو گوناهانە دەکا کە زۆبەی پیاوە پێگەیشتووەکان ئەنجامی دەدەن، کە بەرائەت و دەروون پاکییان کەمترە لە کاتێکدا بەرپرسیارێتیان زیاترە".

(1953، ل 47).

ئاشکرایە لە ناوەرۆکی هەردوو شیکردنەوەکەدا و لە چەندین شیکردنەوەی تریشدا.. خەسڵەتی گشتگیری و گەردوونی بوون بە

دیدەکەین کە تێڕوانینی ڕەخنەیی دەیخاتە پاڵ ئەو بەها ئەخلاقییانەی کە ئەدیب گوزارشتیان لێدەکا و تێکەڵی کاریگەری و تۆنە ئەدەبیەکان *Literary Tones* دەبێ بە جۆرێکی سەرسوڕهێنەر کە ناناسرێنەوە. تەوس و کۆدژی *Irony* لە شوێنێکی وادا بەشێوەیەکی زیرەکانە بەکاردێ، کە تەنها ئامرازێکی سانان و ڕاستەوخۆ نیە دەستبەجێ ڕەخنەبگرێ و واتا ببەخشێ، (واتە) جیهان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە و بە تەرازوو دابەش بکا بەسەر دوو بەرەی ڕووبەڕوودا: ڕەش و سپی، خراپەکان و باشەکان. بەڵکو کاریگەریی ئایرۆنی (تەوسی کۆدژ) لەو هەڵچوون و داچوون و هاتوچۆیەدا دروستدەبێ کە لە نێوان لایەنە ناکۆک و دۆزە دژەکاندا هەیە، بە جۆرێك بەردەوام دەبێ کە حاڵەتێك لەدوودڵیو گومان دروستدەکا کە بارو دۆخی جیهان بەهەمووئالۆزیەکانییەوە دەخاتە ڕوو.

خەسڵەتی گشتگیری و گەردونیبوون کە مۆرکی بەها ئاکاریەکانە، گرنگترین کۆڵەکەی لۆجیکی لیبراڵی مرۆییە کە بەرگریکاران لە ئەدەبی ئۆگەستی پەنایان بۆ بردووە. بەڵام نەیارانی فیکری ئۆگەستی، کە لە نوسینە هیجاییەکانی پۆپ و سویفتدا، بە چەند شێوەیەکی جیاواز باسکراون، بەوەی کە کەسانی گێل و هەڵەشە و دەمارگیرن.. لە یەك ڕوانگەوە جیهان دەبینن کە ڕوانگەیەکی خەیاڵی و ئایدیاڵە. ئەوان ئومێد دەکەن دەرونی مرۆیی لە خڵتە و گرێکانی پاك بکەنەوە، بە دوای یۆتۆپیا و سەردەمەی پیرۆزدا دەگەڕێن، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ نین جگە لە کۆمەڵێك تیۆرسازی وەهمی کە خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنن و وەهمیان پێدەفرۆشنەوە.

ڕەخنەگرە هاوسۆزەکانی وەك: واڵتر جاکسۆن بیت کە دەربارەی جۆنسۆن نوسیویەتی و مینارد ماك کە دەربارەی پۆپ نوسیویەتی، هەوڵیان داوە بەهاکانی هاوسۆزی مرۆیی لە ئەدەبی ئۆگەستیدا بەرجەستە بکەن. واتە ڕسکیان بە ئەرکی ڕەخنەوە کردووە لە پێناو ئەو پرنسیپانەدا کە ئەدیبانی چاخی ئۆگەستی باوەڕیان پێی بووە کاتێ ململانێیەکی بوێرانەیان دژی هێزەکانی دابەشکردنی مەزهەبیو ستەمی فیکری ئەنجامداوە. لێرەوە واڵتەر جاکسۆن بیت (جۆنسۆن) وەسفدەکات بەوەی کە بەهێزترین نوسەرە لە بواری "پاڵەوانێتی و ئازایەتی، ڕاستگۆترینیانە کاتێ گوزارشت لە سەفەری دەرونی مرۆیی دەکا بەناو کوچە و کۆڵانەکانی شاردا" (1975، ل ××). پاشان دەڵێ: "یەکەمین کاریگەری کە ئەدەبەکەی لەسەرمان جێدێڵێ لەوەدایە کە هەستدەکەین پەنای ئازایەتی ئەو بۆ ئێمەش گواستراوەتەوە" (ل 4).

هەوڵ و کۆششی ئەوانەی بەرگری لە بەها مرۆیی و ئەخلاقیەکانی ئەدەبی ئۆگەستی دەکەن، زیاتر پەیوەندیی بە شیکردنەوەی ستراکتوری ئەو ئەدەبەوە هەیە کە لەسەر بنەمای هاوسەنگی ڕاگرتن لە نێوان دۆزە دژ و توخمە ناکۆکەکاندا دامەزراوە، شیکردنەوەی ئەوان بە جۆرێك قووڵە کە دەخوازێ پەردە لەسەر ئەزموونی مرۆیی و ئەخلاقی هەڵماڵێ، دوور لەو تیۆرانەی کە چەند فەیلەسوفێکی وەك ڕۆسۆ و دێریدا پێشکەشیان کردووە. ئەڵبەتە هەموو ئەو تەکنیکانەی کە لە ئەدەبی ئۆگەستیدا هەیە، وەك ئەنتی تێز، هاودژی و کۆکردنەوە لە نێوان هونەر و سروشت، ئێستا و ئاییندە، ئەقڵ و سۆز و.. هتد. لە پێناو ئەوەدا بووە کە فۆرمێك یان نەزمێکی هونەری بەرهەم بێت کە زادەی پێکەوە گرێدانی ئەو توخمە ناکۆکانە بێ لە نەزمێکی پێکەوە گونجاودا، یان هەروەك ئەلکساندەر پۆپ لە چامەی (دارستانی ۆندسۆر)دا دەڵێ:

ئێمە هارمۆنی لە فرەییدا دەبینین

چونکە سەرباری جیاوازی، هەموو شتەکان یەکدەگرن

(برگەی دووەم: 15-16)

بەمجۆرە لە پەیوەندییە ناوەکی و پشێوەکانی بنیاتی یەك کاری هونەریدا بەهای شارستانی و مرۆیی لە دایکدەبن. تەنانەت لیری ئیمریس جۆنز *Emrys Jones* پێیوایە کە جیهانبینی وێناکراو لە چامەی شیعریی (گەمژە *The Dunciad*)[8]ی پۆپ-دا، هیچ نییە جگە لە بەرجەستەکردنی ڕەمزیی سەرکەوتنی شاعیر بەسەر پاشاگەردانیدا، شاعیر لەیەك کاتدا دەسەلاتی گەمژەیی *Dullness* دەسەلمێنێ و ڕووبەڕوویشی دەبێتەوە، ئەو داروپەردووەش کە لە وێرانکردنی جیهان بە جێدەمێنێ بریتیە لەو کەرەستانەی کە بنیاتی چامەی لەسەر دادەمەزرێ" (1968، ل 260). کاتێك پارچە و داروپەردووی وێرانەکان کۆدەکرێنەوە بۆ بنیاتێکی نوێ دژی وێرانەیی.. هێزی پێکەوەلکاندنی خەیاڵی و مەعنەوی مەزنتر دەبێ تا پاشاگەردانی وەرگێڕێتە سەر بنیاتێکی هونەریی خاوەن جیهانبینی پتەو.

ئەم ئاقارە مرۆییە لە ئەدەبی ئۆگەستیدا، کە ڕەخنەی نوێ سەر لەنوێ هەڵیسەنگاند و لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجامدا، لە چەندین توێژینەوەی مێژوویی تردا باسکراوە، جەخت لەسەر بوون و ڕێچکە مرۆیی ئەخلاقییەکەی کراوە و، کولتورە گشتگیرەکەی سەلمێندراوە. لە نێو ئەو لێکۆڵینەوانەدا ڕۆبن براوەر *Reuben Brawer* (1959) و ئێرل واسەرمان *Earl Wasserman* چەند باسێکیان پێشکەش کردووە بۆ شیکردنەوەی سەرچاوەکانی کلاسیکیەت و مەسیحییەت لە وێنەکانی پۆپ و ئاماژە ئەدەبییەکانیدا، بەشێوەیەکی ئەوتۆ ورد کە شایەنی ڕێزگرتنە. چونکە ئەو شتانەی لە خوێندنەوە ڕەخنەییەکاندا هاتوون تەنها چەند نموونەیەك نین لە هەڵکۆڵینی ئەدەبی، بەڵکو چەند کلیلێك *Clues* و چەند دەروازەیەکی زیندوون بۆ پەی بردن بە خەیاڵی داهێنەرانە لە شیعری ئۆگەستیدا. لەم لێکۆڵینەوە ڕەخنەییانەدا باس لە جۆرە شیعرێك کراوە کە قووڵ و فرە کانگایە، دەوڵەمەندە بەو وردەکاریانەی کە چوارچێوەیەکی ڕێکوپێك بە شیعری سەرکەوتو دەبەخشێ لە هەر کات و سەردەمێکدا. دەکرێ لەو شیعرەدا ئێستاو ڕابردوو بخوێندرێتەوە، وزە دەبەخشێ بە ئەدەبی ڕابردوو، هێزی ئەفسانەیی شیعریی نوێ دەبوژێنێتەوە. بگرە تەرجەمەکردنی پۆپ بۆ هەردوو داستانی هۆمیرۆس (ئیلیادە و ئۆدیسیا) چەندین ئاماژە و دەنگدانەوەی ئەدەبی تێدایە کە تایبەتمەندی دەبەخشن بە شیعری پۆپ، تەنانەت ماك لە مبارەیەوە دەڵێ:

"توانای هونەریی و هەستیاری پۆپ جۆرێکە لە ڕەسەنایەتی کە پێشتر بوونی نەبووە، ئەم دوو تەرجەمەیە (ئیلیادە و ئۆدیسیا) بوونەتە ئاوێنەی ڕەنگدانەوەی سێبەر و وێنە جیاوازەکان کە لە کولتوری ئەدەبیی خۆرئاوادا هەیە" (*Editor, 1967, Vol.7, P.viii*).

بەڵام ئەم دیدە ڕەخنەییە هاوسۆزە، کە (ماك) و چەند ڕەخنەگرێکی تر هەوڵیاندا لە ڕێگایەوە تایبەتمەندیەکانی شیعری پۆپ و چەند ئەدیبێکی تری چاخی ئۆگەستی کەشف بکەین، سەبارەت بە بەها مرۆییەکان و وێنە و ئاماژە ئەدەبییە دەوڵەمەند و کاریگەرەکان.. ئەم دیدە دووچاری نەیاریی سەخت و نکوڵیکردنی چاوەڕوان نەکراو بۆوە لە لایەن چەند کەسانێکەوە. کە یەکێکیان ئێرڤین ئێرنپرێز *Irvin Ehrenpreis* بوو کە لە

لێکۆڵینەوەیەکی گرنگدا بەناونیشانی (واتای ئەدەبی و بەهاکانی چاخی ئۆگەستی *1974: Literary Meaning and Augustan Volues*) هەموو ئەنجامەکانی پرۆفیسۆر ماك و دید و بۆچوونە ڕەخنەییەکانی ڕەت کردۆتەوە. ئەو لێکۆڵینەوەیە وێنەکانی پۆپ و ئاماژە ئەدەبییەکانی گەڕاندۆتەوە بۆ بایەخدانی زۆری بەلاسایی کردنەوەی نوسەرە کۆنەکان، کە چەندین وردەکارییان پێشکەش کردووە لە پێناو بەدەستهێنانی بەهای هونەریی نوێدا نا، بەڵکو لە پێناو زەخرەفە و ڕازاندنەوەی فۆرمدا تەنانەت ئێرنپرێز پێیوایە کە ئەو نمونە شێواندراوانەی ئەدەبی ئۆگەستی سەرسامی ئێمە دەبزوێنن لە ئاست کانگا کلاسیکیەکاندا و بەها نەمرەکانی کەلەپوری کۆنی ڕۆشنبیرمان یاد دەخاتەوە.

تێزەکەی ئێرنپرێز چەندین پشتیوانی بۆ خۆی پەیداکرد لە نێو ڕەخنەگرە شیتاڵگەرەکان (التفكيكيون) و پێڕەوانی بزاوتی ڕەخنەی ئافرەتاندا. بۆ نمونە لۆرا براون *Laura Brown* پێیوایە کە دیاردەی بەگەڕخستنی کەلەپوری کلاسیکی و لاساییکردنەوەی هۆراس لەلایەن پۆپ و ئەدیبانی چاخی ئۆگەستییەوە، بەڵگەن بۆ دەستکورتی و بێ توانایی نەك گشتگیری و دەوڵەمەندی ئەو خانمە دەڵێ.

"تا زیاتر لە تەوزیفکردنی کەلەپوری کلاسیکی لەلایەن پۆپەوە نزیك بکەوینەوە، زیاتر لەمانای ئەو بیرۆکەو بیروباوەڕانە تێدەگەین کە ڕێگەیان خۆشکرد بۆ ئیمپریالیزمی ئینگلیزی" (1985، ل 27).

ڕەنگە ئەو ڕەخنەگرانە زیادەڕۆییان کردبێ لە گاڵتەکردن بە کۆششی پێڕەوانی "ڕەخنەی نوێ" بۆ بەستنەوەی ئاماژە و کاریگەرییە ئەدەبییەکان بە کەلەپوری کلاسیکییەوە. پێیان وابوو ئەو کۆششە جۆرێکە لە بانگەشەی ڕۆشنبیری کە تەنها پەیوەندیی بە دەستەبژێرێکی تایبەت و چەند دەزگایەکی دیاریکراوەوە هەیە کە ئیدعای ئەوە دەکەن شارەزاییان لە ئەدەبی ئۆگەستی و ناسینی ئەو ئەدەبەدا هەیە. ئەو ڕەخنەگرانە (بە پێچەوانەوە) هەوڵیاندا فاکتەرەکانی کەموکورتی و کەمتەرخەمی ئەدەبی سەدەی هەژدە دەربخەن بەرامبەر کەمینەکان و ئافرەتان و پەراوێزخراوەکان. گرنگترین لێکۆڵینەوە کە لە ڕوانگەی ڕەخنەی فێمێنیستییەوە نوسراوە، کتێبەکەی (فیلستی نوسباوم *Felicity Nussbaum*) و (لۆرا براون)ە لە ژێر ناونیشانی "سەدەی هەژدەی نوێ *1987, the New Eignteenth Century*". ئەو دوو خانمە نوسەرە سەرلەنوێ پەیوەندیی کارە ئەدەبیەکانیان بە ئافرەت و ئەزموونی ئافرەتەوە خوێندۆتەوە، جا ئیتر ئافرەت ڕۆڵی نوسەری بینیبێ یان خوێنەر یان کەسایەتی لە ڕۆمان و کاری ئەدەبیدا. ئەو خاڵە بەرجەستانەی ئەو دوو نووسەرە پێی گەیشتوون ئەوەیە کە ئافرەت ماف و پێگەی خۆی لە کولتوری چاخی ئۆگەستیدا وەرنەگرتووە، هەرچەندە پێڕەوانی ئەو چاخە پێیان وایە سەدەی هەژدە سەدەیەکی لیبراڵی بووە بۆ فیکر و ڕۆشنبیر، سەدەیەکی گشتگیر بووە لە رووی ڕێچکەی مرۆڤگەرییەوە.. (بەڵام ئەو دوو نوسەرە) پێیان وایە کە لەو سەدەیەدا ڕەگەزپەرستی کولتوری و جیاوازیی چینایەتی و سوکایەتیکردن بە ئافرەت و پەراوێزخستنی ڕۆڵی ئەو ڕەگەزە و هەژاران و چەوساوەکان بەشێوەیەکی بەرچاو بەربڵاوبووە (ل.2).

ئەم دابەشبوونە تیژە لە دیدوبۆچوونی ئەو دوو گروپەی ڕەخنەگراندا کە لایەنێکیان ئاماژەیان بە ڕێچکەی مرۆڤگەریی چاخی ئۆگەستی داوە و

**لایەنەکەی تریشیان دژی کولتوری ڕەگەزپەرستی ئەو چاخە بوون.. زادەی جیهانبینی هەردوو گروپەکەیە لە ئاست کارە ئەدەبییە فەردییەکاندا کە دیدی مەعریفی ئەوتۆ لە خۆدەگرن کە خزمەتی هەردوو گروپەکەی ڕەخنەگران دەکا. لە کاتێکدا لیفیز و لۆرا براون هاوڕان لەسەر ئەوەی کە پۆپ دەنگێکی گوزارشتکار بووە لە بەهاکانی چاخی ئۆگەستی، ناکۆك و جیاوازە سەبارەت بە دیاریکردنی چەمکی ئەو بەهایانەی کە ئەدەبی پۆپ نوێنەرایەتییان دەکا. لیڤیز پێیوایە ئەو بەهایانە گوزارشت لە کۆمەڵگەی زۆرینەو شارستانیەتی باوی چاخەکە دەکەن، بەڵام لۆرا براون پێیوایە ئەو بەهایانە گوزارشت لە بەرژەوەندیی چینێکی بەرتەسك دەکەن کە دابڕاو بوون لە هەموو توێژەکانی کۆمەڵگە.**

**سەرباری جیاوازیی لە دید و بۆ چوونی ئەو دوو گروپەدا، بەڵام هەردووکیان نامۆبوونی کۆمەڵایەتی و دەروونی پشتگوێ دەخەن، کە بەشێوەیەکی تایبەت بووە هۆی تەقینەوەی شیعرە هیجاییەکانی پۆپ و سویفت. ئەو شیعرانە بە شێوازی چاوبەستەکی گوزارشت لە هێزی ئەو نامۆبوونە لەسەر ویژدانی هەردوو ئەدیبەکە دەکەن. چەند لێکۆڵینەوەیەکی هاوچەرخ باسیان لە هەستی نامۆبوون کردووە لای ئەدیبانی چاخی ئۆگەستی کە کاریگەریی بەسەر بەرهەمەکانیانەوە بەجێهێشتووە. بۆ نمونە برین هامۆند *Brean Hammond* (1986) پێیوایە کەمئەندامیی پۆپ لە ڕووی جەستەییەوە بۆتە هۆی نوقسانی لە هەستی سێکسیدا. ئەو نوقسانییە بۆتە هۆی ئەوەی لە تەواوی کۆمەڵگا دابڕێ، ئەو کۆمەڵگەیەی کە شانازیی بە نێرایەتییەوە دەکرد (ل 154). هۆوارد ئێرسکین هیل (1975) و دۆگلاس برۆکس دیڤیز *Douglas Brooks – Davies* (1985) لە ئاماژە مێژوییەکانی ئەدەبی پۆپ–دا ئەوە هەڵدەگۆزن کە کاسۆلیکیەتی پۆپ کاریگەریی لەسەر دەروونی هەبووە کە ئینتمای بۆ کەمینەیەکی چەوساوە هەبووە. بەڵام سویفت –لە دیدی ئەواندا– بەدەست تاڵاوی نامۆبوونی سیاسی و دەرونییەوە ناڵاندوویەتی، چونکە بە زۆر نەفی کراوە بۆ ئایرلەندا، تەنانەت لە نامەیەکیدا بۆ (بۆلنگبۆرگ *Bolingboroke*)ی هاوڕێی ساڵی 1713 نوسیویەتی: "من دوور خراومەتەوە بۆ وڵاتی کۆیلە و سواڵکەران.. تا لە ڕق و توڕەییدا، وەك مشکێکی ژەهر خواردوو، بمرم.." (نامەکانی سویفت. ساغکردنەوەی ولیامز *Williams*، 63–1965، بەشی سێیەم، ل 382).**

**بە کورتی، ئێمە ناتوانین حوکم بەسەر هەموو بەرهەمی چاخی ئۆگەستیدا بدەین گەر هەر ئەدیبێك بە جیا بگرین، چونکە هەر یەکێك لەوانە دۆزی تایبەتی خۆی هەیە کە بەرهەمەکەی ڕەنگی پێوەگرتووە و جیهانی ئەخلاقی و تێڕوانینی هونەریی بۆ دروستکردووە. لەسەر ئەم بناغەیە هەندێك لە باسەکانی ساڵانی هەشتای سەدەی بیستەم لە دایکبوونێکی نوێی سەدەی هەژدەیان ڕاگەیاند، ئەو سەدەیەی پڕ بوو لە هەمەجۆری و کۆدژیی و ئەزمونکاریی و فرە ڕوانین، بەجۆرێك ناکرێ تەنها لە ژێر زاراوەی "ئۆگەستی"دا، بەشێوەیەکی کرچ و سنوردار، کۆبکرێنەوە و پۆلێن بکرێن.. هەروەك لەسەرەتای ئەم نەسکەدا ئاماژەمان پێدان.**

## پەراوێزەکان

1–سەرەتا دەبێ ئاماژە بۆ دوو چاخی ئۆگەستی بکەین، کە یەکەمیان نموونەی چاخی دووەمیانە، واتە چاخی دووەم

شوێن پێی چاخی یەکەم هەڵدەگرێ. چاخی ئۆگەستیی یەکەم، ئەو چاخەیە کە ئەدەبی لاتینی لەسەر دەستی شاعیرە گەورەکانی وەك فرجیل و هۆراس و ئۆڤید و چەند شاعیرێکی تر گەشەی بەخۆوە بینی، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئۆگەستس قەیسەری ئیمپراتۆردا (27 پ.ز).

چاخی ئۆگەستیسی دووەم لە ئەوروپا، لە نیوەی سەدەی حەڤدەوە تا دەورووبەری ناوەڕاستی سەدەی هەژدە دەخایەنێ، بریتیە لە چاخی رۆشنگەری *Enlightment* کلاسیکیەتی نوێ *Neoclassicism* کە شوێن پێی نەریتی لاتینی لە ئەدەب و فیکردا هەڵگرت. (خەسڵەتەکانی بریتی بوون لە) رێزگرتن لە دەسەلاتی، ئەقڵ فیکر روونی، بایەخدان بە نەرمی و پێکەوە گونجان، پەرۆشی بۆ هونەرەکانی ئەدەب و رێزگرتن لە مرۆڤ. لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی فیکر و ئەدەب لە سەرانسەری ئەوروپا دەرکەوتن و ناویان درەوشایەوە. لە ئەڵمانیا کانت (1724–1804) و لیسینگ (1729–1781). لە فەرەنسا ڤۆڵتێر (1694–1778) و دیدرۆ (1713–1784) و کۆرنێ و راسین و مۆلییر. لە ئینگلتەرا درایدەن (1694–1778) و سوێفت (1667–1745) و ئەدیسۆن (1672–1719) و ستێل (1672–1729) و پۆپ (1688–1744) و فیلدنگ (1707–1754) و جۆنسۆن (1709–1784) و چەند ئەدیبێکی تر. زاراوەکە ئاماژەیە بۆ سەردەمی بوژاندنەوەی ئەدەب لە مێژوی هەر نەتەوەیەك.

2–*Ugustinian* پەیوەندیی بە قەشە ئۆگەستینەوە هەیە. لە نەسکی یەکەمی ئەم بەشەدا کە تایبەت بوو بە چاخەکانی ناوەڕاست باسکرا.

3–برۆتۆسی یەکەم (لیۆسیۆس جۆنیۆس) سیاسەتمەدار و پیاوی دەوڵەتی رۆمانییە. لە کۆتاییەکانی سەدەی شەشەمی پێش زایین ژیاوە، رۆڵی هەبووە لە لابردنی ئیمپراتۆری ستەمگەر تارکۆین (509 پ.ز) و دامەزراندنی کۆماردا.

برۆتۆسی دووەم (مارکۆز جۆنیۆس 85–42 پ.ز) سیاسەتمەداری رۆمانی کە لەگەڵ کاسیۆس–دا دەستی تێکەڵکرد بۆ تیرۆرکردنی یۆلیۆس قەیسەر وەك بەرگریکردن لە کۆمار. قسە بەناوبانگەکەی قەیسەر کە وتوویەتی: "تەنانەت تۆش ئەی برۆتۆس!.. *Et tu, Brute*" دەربارەی ئەو وتراوە (کاتی قەیسەر لە کاتی تیرۆرکردنیدا دەیڵێ). پاش شکستی مارك ئەنتۆنی لە شەڕی فیلیبی (42–پ.ز) خۆی کوشتووە.

4–چامەیەکی فێرکارییە، ساڵی 1711 پۆپ بڵاویکردۆتەوە کاتێ تەمەنی بیست و یەك ساڵان بووە، بەڵام ناوی خۆی نەخستۆتە سەری. بەشێوازی دووبەیتی داستانئامێز داڕێژراوە بۆ شیکردنەوەی یاسا کلاسیکیەکانی چێژی هونەری و زەرورەتی سودوەرگرتن لە ئەدەبی کلاسیکی. چەندین نمونەی تر لەمبارەیەوە هەن کە ئەدیبەکان لە هەندێکیاندا پێڕەوی ئەو یاسایەنە و لە هەندێکی تریاندا سەرپێچی دەکەن. جۆن دینیس (1657–1734) کە ئەدیبێکی هاوچەرخی ئەوە دژی ئەو چامەیە وەستاوەتەوەو گاڵتەی زۆری بە بیرۆکەکانی کردووە، کە دواتر شەڕێکی ئەدەبیی لە نێوان ئەو و پۆپدا لێکەوتەوە.

5–دەربارەی ئەم زاراوانە بروانە پەراوێزەکانی نەسکی دووەم – بەشی یەکەم.

6–ناوێکی رەمزییە کە شاعیر بۆ یەکێك لە کەسایەتییە ژنەکانی سەردەمەکەی هەڵیبژاردووە. ئەو کەسایەتیەش (ئان ئۆڵد فیلد *Anne Oldfield*)ەو لەو نامەیەدا هاتووە کە باسکرا بە یەکەمین چوار چامە ئاکارییەکەی شاعیر *Moral Essays* لە قەڵەم دەدرێ و کەلە نێوان ساڵانی 1731–1735دا بڵاویکردۆتەوە.

7–بڵاوکراوە یان نامیلکە *Pamphlet* دانراوێکی کورتە کە بەشێوەیەکی خراپ چاپدەکرێ و بەشێوەیەکی بەرفراوان دابەشدەکرێ ستایلی هیجایی و گاڵتەجاڕی دەربارەی بابەتێك لە بابەتە گشتییەکان یان کەسێك لە کەسەکان بەکاردێنێ. ناونیشانی نامیلکەکەی سویفت ئەمەبوو:

"پێشنیازێکی خاکی بۆ دورخستنەوەی منداڵانی هەژاران تا نەبنە ئەرك بەسەر کەس و کار و وڵاتەکانیەوە بەوەی بکرێنە خۆراکی دەوڵەمەندان".

سویفت ئەم نامیلکەیەی ساڵی 1729 نوسی دەربارەی بارودۆخی ئایرلەندا. تیایدا بەوردی باس لە چەند بابەتێکی

ترسناك دەكا و بەشێوەیەكی گاڵتەجاڕی باس لە هەژاران دەكا لە چەقی ئازارەكانیاندا. هانیان دەدا بەشێوەیەكی زانستیانە بیربكەنەوە و پەنا نەبەن بۆ وروژاندنی سۆز و لاواندنەوە. نوسەر لەم جۆرە نوسینانەدا هەست و سۆزی خۆی بێ لایەن دەگرێ و لە زیادەڕۆیی و ستایلی ڕاستەوخۆ دوور دەكەوێتەوە، پاشان تەوسەكانی كاریگەرییەكی زۆر لەسەر خوێنەر جێدێڵن.

8–چامەیەكی داستانئامێزی، هیجایی، گاڵتەجارییە.. كە تیایدا پۆپ دژی گەمژەیی و پووچی هەست و سۆزی مرۆڤ بە گشتی قسە دەكا، بە تایبەتی لای ئەو ئەدیب و نوسەرانەی كە لە بەشێك لە هێرشەكەیدا باسیان دەكا. بەڵام ئەم كارە شیعرییە دژی كەسانێكی دیاریكراو نییە، چونكە بە گشتی باس لە دیاردە ئەدەبییە خراپەكان دەكا. ساڵی 1728 سێ بەشی بەناوێكی خواستراوە وە لێ بڵاوكردەوە. پاشان ساڵی 1735 ناوی خۆی ڕاگەیاند. ساڵی 1743 تەواوی كارەكەی لە چوار بەرگدا بڵاوكردەوە.

## سەرچاوە

دیفید نوكس، الاوغسطیة. الادب و النقد و التاریخ الادبي.
ت: د. عبد الحمید شیحة. المجلس الاعلی للثقافة،
ص 203–220.

# وەرن، هەمووتان!.

فەی وێلدن

لەئینگلیز ییەوە: تۆفیق عەبدول

ماورین تیمسۆن سەری لە هەموو شتێك سوڕئەما، كاتێك كە تەمەنی هەژدە سالآن بوو، بەلآم هیچ شتێك بە قەد هاوڕێكەی ئۆدری تۆماس. بێزاری نەكردبوو، ئەگەر بەهاوڕێی دابنێت!. هەردوكیان لە كۆلیژ بوون، زمانیان ئەخوێند. هەردوكیان لە یەك ژوردا بوون لەبەر ئەوەی بە پێی پیتی ئەلف دەست پێدەكات ناویان بە تەنیشت یەكەوەبوو، جۆرێك لە یەك چارەنوسیی ونزیكیی بەسەرا سەپێنراو كۆی كردبونەوە.

ماورین لەهەمو شتێكداسەردەرچوتر بوو، ئۆدری (بە بۆچونی ماورین) سەرچڵ بوو. بەلآم ئۆدری چاوساغ بوو، وماورینی پەل كێش ئەكرد، ماورین تێنەئەگەیشت، تەقەی سەری ئەهات، تووڕە ئەبوو، هەڵئەچو.

ماورین ئەیویست بەناخی شتەكاندا ڕۆبچێت تا ئەگاتە كانونی كانیان، بۆ ئەوەی بەردەوام شیتەڵیان بكات و وەكو قەیتانێكی قۆندەرەی گریێ كوێرەلێدراو گرێكانیان بكاتەوە، بەلآم هەندێك شت هەبوون سەرو بنیان نەبوو، گرێكانیان نەئەكرایەوە، نەپچڕایە ئەمەش ڕەوا نەبوو.

ماورین، جوان بوو، تەنیا ئەوەندەی بەس بوو سەیری ئاوێنەی ژووره هاوبەشەكەیان بكات بۆ ئەوەی ئەوەبزانێت.(دایكی ماورین زۆر ڕقی لە ئاوێنەبوو، یەكێك بوو لەوانەی بڕوایان وابووجوانی ئافرەت لە ڕەوشت بەرزیدا ئەبینرێت نەك لە ئاوێنەدا) بەلآم ئاوێنە لە هەمو شوێنێكدایە. ئەی وانیە؟ گۆلە ئاوەكان، جامخانەی كۆگاكان خۆتت نیشان ئەدەن، یان چاوەتێر نەخواردوەكان بەلایەنی كەمەوە بەشێك لەڕواڵەتیخۆتت بەرەوڕوو ئەكەنەوە.

ئۆدری هەتا بلێیت ناشیرین بوو، دەم و چاوی وەكوئیدیس یپوره گەورەی ماورین ئەیوت لەپشتی پاص ئەچێت.

(دایكی ماورین هەشت پووری هەبوو، لەهەمویان زیاتر ڕقی لە ئیدیس بوو، جگە لەوەش ڕقی لەهەمو كەسێك بوو، گاڵتەی بەلاوازەكەیان ئەكرد، بە قەڵەوەكانیان، بە ناشیرینەكانیان، بەجوانەكانیان كەخۆیان ئەدەنە بەر ئاوێنە، بەكورتی، هەندیك جار، ڕقی لە هەمو ڕەگەزی مرۆڤ بوو، گاڵتەی بەهەمو مرۆڤێك ئەكرد، بێجگە لە خێزانەكەی خۆی).

ماورین تاقانه بوو، دایکی زۆر له باوکی بێزاربوو، هەر زوو له ماڵەکه دەری کردبوو، هێشتا ئەم چلەی نەچوبوو.

(ماورین باوکی دەهاتەبەرچاو به جوتێك بووتی ئەستورو هەناسەی بۆنی بڕەی لێدەهات و به ساتمەکردنەوه بەرارەوه شێدارەکەدا و به کاو گەلاّخەمناك داپۆشراوەکاندا دەروات و بۆ هەتا هەتایه له ماڵ دەردەچێت، ئەمیش یەکەم گریانی مناڵیی، وەك له یەکەم پەنجەرەی دەسته ڕاستی قاتی دوەمەوه بەرز بوبوەوه).

ماورین ناوقەدێکی باریکی ناسکی هەبوو بەلاّم ئۆدری لولەیی بوو، یەك موور سەرتاپا گۆشتن بوو.

ئەمه ئەو شتانەیه که ئەبێت بیزانیت ئەگەر له ژورێکی هاوبەشدا بیت.

ماورین لەوەوپێش هەرگیز له ژوری هاوبەشدا نەژیا بوو. زۆر بەلایەوه سەیر بوو ئۆدری بەو لەش ولاره نارێك و ناقۆلاّیەوه به ئاسودەییەوه بەڕووتی بەدەوری ئەمدا بسوڕێتەوه، بەلاّم ئەم پێی پەست ئەبوو. ماورین زیرەك بوو، لەتەمەنی سیانزە ساڵییەوه، بۆ جارێکیش هەڵەی له ڕێزماندا نەدەکرد ئۆدری گۆڕێك و گۆشەیەکی تیژی لێك جیانەدەکردەوه. خوا خۆی ئەزانێت بەچی دەستبڕین و ساختەچێتییەك گەیشتۆته زانکۆ. ماورین ماکیاڤیللی ئەخوێندەوه، هەرچی ئۆدری بوو گۆڤارو بلاّوکراوەی ژنانی ئەخوێندەوه. بەلاّم هێشتا هەندێك شت لەئۆدری دا هەبوو که له ماوریندا نەبوو. ئۆدری چاوساغ و ماورین دوای ئەکەوت. تاوێك بەخۆشی وتاوێك به ناچاریی.

ماورین گۆشەگیر بوو، بەلاّم ئۆدری نا، ماورین لەوه بێزار بوو گۆشەگیره.

-"تۆ به ئاسانی هاوڕێ ئەگریت.." ماورین بەئۆدری وت به ئاوازێك که بۆنی گلەیی لێدەهات و بێتوانایی زگماکی له جیاکردنەوەدا پیشان دەدا.

-"چۆن دەتوانیت وا بکەیت؟"

ئەمەبەلاّی ئۆدریەوه سەیر بوو، که زۆر به ڕێکەوت شت هەبوو به لایەوه سەیر بێت

-"بەس ئەوەنده قسه لەگەڵ خەڵك بکەو لوتت بەرز نەبێت". وەلاّمی دایەوه

-"هەر کەسێك بێت؟". ماورین به مۆنییەوه لێی پرسی

-"بەڵێ، چی تیایه.." ئۆدری وەلاّمی دایەوه.

هەر قسه کردن نەبوو، هەندێ جار له قسه کردنیش دەرئەچو، ئەچونه ناو جێگاو بەیەکەوه ئەنوستن.لەناو جێگای یەکێکەوه بۆناو جێگای یەکێکی تر، هەر کەسێك بوایه. هەمو (هەرکەسێك) به توڕەییەوه خۆی کۆئەکردەوەو بەجێی ئەهێشت بۆ (هەرکەسێك)ی تر، ئۆدریش دەستی ئەکرد به گریان و گلەیی کردن له بەختی خۆی، بەلاّم وەکو ماورین ئەیوت تا ئەوپەڕی توانای هەوڵی دابوو تا ئەوچرکەساته توانیبووی کچێنی خۆی بپارێزێت بۆئەوەی به سەلامەتی بیداته دەست سکرتێری (کۆمەڵەی گفتوگۆکردن) که کوڕێکی تێگەیشتوی دەوڵەمەندی خاوەن ئوتومبێل و جێی باوەڕ بوو.

ئۆدری هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبوو هیچ ڕویدابێت.

ئۆدری لەگەڵ هەمو کوڕاندا بەینی خۆش بوو بەلاّم ماورین بەشی خۆی ئیهەڵئەبژاردن، ئەوه مەسەلەکه نەبوو، بەلاّم کاتێك که سەیری ئاوێنەی چاویانی دەکرد، له ئۆدری کەمتری دەبینی. بەلاّم بۆئێستا هەست بەوه ئەکات؟. ویستی ئەم پرسیاره له ئۆدری بکات.

-"ئەی تۆ چی له چاویاندا دەبینی؟". ئۆردی پرسی "بێجگه له ئارەزووه گشتییەکەی جووتبوون؟"

-"بەرژەوەندییەکی کەسیی". ماورین وتی، پێش ئەوەی بواری بیرکردنەوەی هەبێت.

هەردوكیان لەدوای بینینی فیلمێك لەكافتیریایەكی چینی دانیشتبون، ئۆدری شیرمۆزێكی بە هێلكەی ئەخواردەوە كە بێگومان ماورین قێزی لێ ئەهاتەوە.

"ئۆە، من ئەزانم ئەو كەسانە حەزم لێدەكەن". ئۆدری وتی.

ماورین هەستی بە گرژبونێك كرد، لە حەژمەتا قومێكی گەورەی لە چا تیژە كولاوەچینیەكەی بەردەمی دا، هەمو دەمی سوتاند. تا چەند ڕۆژێك دەمی تفت بوو. بەلام هیچی نەوت.. ئەبوایە چی بلێت؟. بابەتەكەی لە بیر كرد.

ئەوەی لەبیری نەئەچوەوە ئۆدری بوو، ڕۆژێكی بەهار لەسەر تەپۆلكەیەكی لم بە مایۆیەكی مەلەی یەكپارچەوە ڕاكشابوو، قژەكەی بەدەم شەماڵەوە شەپۆلی ئەدا، پشتی كردبووە ئەو كۆمەڵەی كە دوای كەوتبون، ئەو كۆمەڵەی لە هەمو شوێنێك بەدوایەوە بوون. بانگی ئەكردن:

وەرن، هەموتان!.

هەمویان هاتن.

دۆست، ناسیاو، دوور، گەنج، پیر، منال، هەمو نێرینەی سەر زەوی بەدەوری ئەم چەقی قورساییە سازگارو ناسك و نازدارو دڵفراوانەدا كە ئۆدریە ویزەیان ئەهات.

وەرن هەموتان! و هەمویان هاتن.

ماورینیش هەر وای كرد، تـاوێك پێچەوانـەی ویستی خۆی و تاوێك بەویستی خۆی. بیری لە ژیانی منالیی نەخشەبۆكێشراوی ئارام و دڵتەنگی خۆی كردەوە.

پشیلەیەك دوای نانی ئێوارە دەرگای لەسەردائەخرێت و نابێت بچێتە دەرەوە، نان وچای ئامادەكراوی دو كەس، دایك و كچێك. دوای ئەوەی لە خەو هەڵسایت پەتێك و دوسەرو هەر یەكەی بەلایەكدا ڕایئەكێشێت.

هەندێك بۆگەن بوون بە قووڵی لەناخیدا چەكەرەی كرد.

لەگەڵ خەڵكەكەدا بەكۆمەڵ لەتەپۆلكە لمەكەوە ڕای ئەكردە خوارەوە، ئۆدری یەكەم كەس بوو گەیشتە دەریاكە: وەرن، هەموتان! ئاوەكەی گەرم و خۆشە.

بێگومان وانەبوو، پێی ڕائەبواردن. ئاوەكە زۆر سارد بوو، هەمو ئەیانقیژاند و ئۆدری ئاوی پیا ئەكردن.

–چۆن ئەوێریت ؟!. ماورین تووڕە بوو بوو ناوچەوانی گرژكردبوو. بەلام هەمویان پێیان خۆش بوو، بەویشەوە.

ئۆدری ڕێكخەری ئاهەنگەكە هەریەكێكی لەسەرەتای چێژێكی خۆشدا ڕاگرت. ئەمەی چۆن بۆ گونجابوو ؟.

دوای ئەوە هەركەسێك ڕێگای خۆی گرتە بەر. ئۆدری بۆ كۆرسیدوەمی پۆلی دوەمی وپێداچونەوەی هەندێك وانەی زانستە كۆمەلایەتیەكان. ماورینیش بۆگەڕانەوە بۆ برۆسڵ بۆخۆئامادە كردن بۆ تاقیكردنەوەی چونە كۆلیژ (*E.E.C*) كە ئاواتی لەمێژینەی بوو. هەندێك شتی تریش هەبوون كە زۆر هاندەربوون بۆ بیركردنەوە لەكاركردن لەوشارەدا، كرێیەكی باش، گواستنەوە بە ماشینێكی بچوك، دەستەیەك خانوی بچوك.

ئەبوایە بچوایەتە جێگەی ڕازگری (كۆمەڵەی گفتوگۆكردن) كە لەكارەكەی دەركرابوو لەبەر ئەوەی لەكومپانیای ماركس و سپنسەر دامەزرابوو لە نیوكاسڵ. ئەم جۆرە پەیوەندیانە لەنێوان ماورین و ئەو كوڕە گەنجە دەوڵەمەندەدا ئاسایی بوو چونكە خوێندكاری یەك كۆلیژبوون. ماورین زۆری پێناخۆش بوو كەزانی ئەو ساڵە ژنیهێناوە. خوێندكارێكی كۆلیژی هێنابوو كە دەساڵ لەخۆی گەورەتر بوو.

ماورین ئەو هاوینە ڕۆیشتبوەوە بۆلای دایکی لە پەیگنتۆن بۆ بەسەربردنی پشوی سالأنە، بەلأم ئەوەندە ناخۆش و دلتەنگ بوو بڕیاری دا جارێکی تر سەری پیانەکاتەوە.

دوانزە سالە لەبرۆسلْ وئێستا لە بەرێوەبەرایەتی کێلگەیەکی کشتوکالیی فەرمانبەرەو تائێستاش تەنیابالە. ناچارتوشی بووە بەتوشی کابرایەکی خاوەن ژن و مالەوە– بەلأم کوا پیاو ماوە ژن ومالی نەبێت؟! ئەم بلێت چی؟!.

لەئەنجامی چاوەڕوان کردنی تەلەفۆن و بەلێنی نهێنی و پەیمانی شکاو و ژیانی ناکۆمەلأیەتی، ئەم هەر بەتەنیایی مایەوەو وای لێهات بۆهەتا هەتایە بیر لەشوو نەکاتەوە.سەرئەنجام وازی هێنا.

ئەم کچە چی لێقەوماوە؟!.

دوای ئەوە نامەیەکی لە ئۆدریەوە پێگەیشت.

ئەبێت ئێستا ئەو کچە چی بەسەر هاتبێت؟!. ئایا ئەتوانن یەك ببینن؟.ئەمە بیرکردنەوەی ئۆدری بوو. ماورینیش بیری کردەوە: بۆچی ئەبێت یەکێك پەیوەندی خۆی لەگەلْ کەسێکدا بپارێزێت لەبەر ئەوەی لەیەك کۆلیژ بوون یان بەپێیپیتی ئەلف و بێی ناوی باوکەکانیان جێگاکانیان لەتەنیشت یەکەوە بووە؟!.

بەلأم وەلأمی نامەکەیدایەوە. ئۆدری بانگهێشتی کردبوو، جەژنی سەریسالْ لای ئەوان بێت.

بەلێ، شووی کردبوو بەخاوەن سێمنالێك لە لادێییەك، ژمارەیەکی زۆر ئاژەلیشی هەبوو.

ماورین لە دلی ئۆدریدا بوو... وەرن، هەموتان. (بێگومان بۆ شوێنێکی دلتەنگی قوڕو چلپاوی قەرەبالغی شپرزە، لە هەر سوچێکەوە پشیلەیەك چاوت لێ زیت ئەکاتەوە). بەلأم ماورین چوو.

مالەکەیان هەلڕژاو و هەلپڕژاو بوو، بێگومان وابوو. ماورین جوتێك دەستکێشی لە دەست کردو دەستی کرد بەمالْ پاکردنەوە. درەختی لە دایکبونەکەی تەکاندو لە جێی خۆیدا جێگیری کردەوە. دەستی کرد بە گۆرەوی چنین. خۆی لای منالەکان شیرین ئەکرد، شۆکۆلاتەی مارس ی ئەدانێ، قسەی خۆشی بۆ ئالانی مێردی ئۆدری ئەکرد و دلخۆشیی ئەدایەوە.

ئۆدری دوای ئەوەی منالەکانی ئەخەواند وچانی نەبوو، ئەبوایە خەریکی ئامادە کردنی چوار جۆر ناواخن بێت بۆ داگرتنەوەی دو قەلی بچکۆلە، چونکە ئەوە زۆر دەست ڕەنگینانەتر ئەبێت لە یەك جۆر ناواخن یان سێوێك بخەیتە ناو سکی قەلەنێرێکی گەورەوە.

–بەلأم ئەوە ئیشی زۆری ئەوێت ئۆدری.

–ئەزانم ماورین، بەلأم چار چیە، ژیانی خێزان خۆماندوکردن و ڕازاندنەوەی ئەوێت.

ماورین گومانی هەبوو لەوەی خۆماندو کردن و ڕازاندنەوە بەس بێت. ئالان ڕۆژنامەنوسێکی سیاسی بوو، بیروباوەڕی چەپی هەبوو. ئەبوایە سالأنە بەلایەنی کەمەوە سێجار بە هەلوێستی خۆیدا بچوایەتەوە.

ماورین وای بۆئەچو ئۆدری زۆر گوێ ناداتە ئەوەی کە لەدلی مێردەکەیدایە، بەلأم بەردەوام سۆزێکی گەرمی نیشان ئەدا بۆئەوەی کامەرانی بکات.

–خۆشەویستەکەم ئالان ئەوە چیتە ؟. باوەشی پیائەکردو دەستێکی ئەکردە ملی.

لەکاتێکدا ئالان چاوی ئەبڕیە لیستی پارەی کارەباکەو (داگرتنەوەی دو قەل سێ ئەوەندەی داگرتنەوەی یەك قەلی تێئەچێت وەك ماورین بۆی حساب کردبوو) نا بەدلْ زەردەخەنەیەك ئەیگرت.

ماورین زۆر باش ئەیزانی نابەدلە. لەڕاستیدا وای هەست ئەکرد زۆر چاك لە ئالان ئەگات. بنچینەکانی ڕاگرتنی خێزانەکەی دەست نیشان کردبوو. منالەکان، سۆزی گەرم، ئاژەلەکان، هات و

چۆی ڕۆژانە بەناو قوڕو چڵپاودا، ڕایی کردنی ئەو دۆست و برادەرانەی کە لە چەندکیلۆمەترێکەوە دێن و دەڕۆن. بیری کردەوە: ئەمانە، لەگەڵ تۆزێك ڕێك خستنەوەدا زۆر سودیان لىٚوەرئەگرم. بیری کردەوە، ئەمانە هەموی بۆ خۆی بکات.

ئەبوایە چوار ساڵ چاوەڕوان بکات، لەو ماوەیەدا بەردەوام سەری لە خێزانەکە ئەدا.

ئۆدری ئەیزانی وەکو ماورین شتی وا بکات، بەڵام لە گەڵ پیاوێکی ژن وماڵ داردا پەیوەندیی هەبوو. ماورین بەچاکی توێکاریی ئەو پەیوەندییەی ئەزانی.

–خۆم زۆرم پىٚناخۆشە... ئۆدری بە دەم وردکردنی کاکڵە گوێزەوە بۆناواخنی یەکێك لە قەلەکان، بە مۆنێکەوە وتی... ئالانم زۆر خۆشئەوێت، بەڵام چی بکەم خۆم بۆناگیرێت.

–تۆش هەقتە، ئەزانم پێویستت بە بایەخ پێدان و پیاهەڵدان و ڕازی کردن هەیە. ماورین بەهێمنیی پێی وت.

ئۆدری لەو ماوەیەدا گۆڤاری ژنانی زۆر خوێندبووەوە، بەڵێ، هەر لەڕۆژانی کۆلیژەوە زۆری لەو شتە ژنانانە ئەزانی کەئالان دەرکی پىٚنەئەکردن. بەڵام جێی داخە، ئەو پیاوە بەدەست خۆی نەبوو کە ئەوەندە سارد بوو نەیئەتوانی بە ئاستی پێویست سۆزو گەرم و گوڕیی بنوێنێت بۆئەوەی ئەم لەدەرەوەی خێزانەکەی مووشەی خۆشەویستیی نەکات.

فرمێسکەکانی ئۆدری ئەوەرینە سەر قاشە لیمۆکان و هەویرەکەی بەردەستی زیاتر تەڕ ئەکرد.

–خۆزگە بمتوانیایە بەئالان بڵێم ولەوبارەیەوە قسەم لەگەڵدا بکردایە، ئیتر مێشکم ئەحەسایەوەو گیانم پشوی ئەدا.

–لەوانەیە بتوانیت.. ماورین پێی وت. بىٚئەوەی بڕوای بە سەرئەنجامەکەی بێت.

–ئێوە ژن و مێردایەتیتان گەرمە، ئەگەر ئالان خۆی بەجۆری ئەو پەیوەندیە بزانێت ئەڕوخێت. ئەو بە ڕاستی ئەیەوێت ژیانی خێزانیتان بپارێزێت. با شتی وا جارێکی تر هەرگیز ڕوو نەدات.

–واتە دان پیانان؟!. ئۆدری، دەستە ناسکەکانی لە هەویر شێلان وەستان. تروسکەیەکی هۆش هاتنەوە تاریکیی مێشکە بە خۆشەویستیی نەخۆشەکەی ڕەواندەوە. بەڵام تەنیا بۆچرکەیەك.

دۆستەکەی تریشی بێگومان ژنی هەبوو، هەموشەوی جەژنێکی سەری ساڵی بەدیار ویسکی کۆنەوە لای خێزانێکی تر ئەبردە سەر.

ئەتوانین تا ڕاددەیەك بڵێین دانپیانان نیە. ماورین لەسەری ڕۆیشت.. بەڵکو وەفادارییە، ژیانێکی ڕێك و پێکی وەکو تۆ و ئالان چۆن ئەچێتەسەر ئەگەر وەفاداریتان نەبێت بۆیەکتری.. وابزانم ئەوەندە قەرزاری ئالان و شووکردنیت ئەوەی پىٚ بڵێیت. دوای ئەوە ماورین لەگەڵ مناڵەکان چوە دەرەوە بۆ ناو دارستانەکە بۆ گەڕان، ناو دارستانەکە تەماویی وگەڵاکان شەونماوی وئەویش هاواری ئەکرد: وەرن، هەموتان!. بانگی ئەکردن و لەجانتاکەی شوکولاتەی مارسی بوو دەرئەهێنان. چۆن پەلاماریان ئەدا!.

لە کاتێکدا هەردوکیان گۆرەوی جەژنی سەری ساڵیان لە دیاری پڕ ئەکرد، ئۆدری ئالانی تێگەیاند. هەمو شتێکی دەربارەی خۆشەویستیە نهێنیەکەی بووباس کرد، دەربارەی ژوانەکانی لەپشتی ئوتومبێلدا، لەفەرمانگەکانیاندا، لەپشت درەختەکانەوە، لەژێر تاوێرەکاندا.. کە لە هاوینەوە بەردەوامەو..چۆن ئەو بەڕاستیی ئالانی خۆش ئەوێت و ئەگەر ئەو تۆزێك دڵنەرمتر و لەگەڵیدا گەرمتر بووایە هەرگیز شتی وا ڕووی نەئەدا، بەڵام ئەم چەند بایەخی بە ژن ومێردایەتیی ئەدا ئەو ئەوەندە بىٚ بایەخ سەیری ئەکرد.

–وەکو خانمی بەرگی گۆڤار قسە مەکە. ئالان تەنیا ئەوەندەی وت و لەم سەری ژوورەکەوە تا ئەوسەری ژوورەکە بە بۆکس بردی.

لەو جەژنی بۆکسێنەدا، ئۆدری جانتاکانی کۆکردەوەو ڕۆیشت، ئەبوایە هەر وای بکردایە، بەقیژەو کەف چەراندن و هستیریاوە منالەکانی بەجێهێشت، مالی ژن و مێردایەتی و هەمو شتێکی بەجێهێشت، چونکە لە کاتی تەلاقدا هیچیانی نەئەکەوت.

(دۆستەکەی بڕیاری دابوو بەوەفا بێت بۆژنەکەی). دوای ئەوە تەنیا ماورین هەبوو کە یارمەتیی خێزانەکەی ئەدا لە بەڕێوەچونی ئەو جەژنی سەری سالە پڕ مەینەتیەدا. شارەزای بەڕێوەبردنی مال و ڕاگرتنی دلی ئالان بوو. وەکو دایکی ئالان ئەیوت زۆر کەیبانو بوو.

بۆجەژنی سەری سالی داهاتو، ماورین نەك هەر تەنیا دامەزرابوو بە خزمەتگوزاری مالەکە بەلکو سکیشی پڕ بوو بە نۆبەرەکەی و ئەیوت:چەند دێن وەرن. هەموتان، وەرن !.

لەکاتی نان خواردن دا هەرگیز خۆی بە تەنیا خواردنی لێ نەئەنا بەلکو لەمالەکەدا یارمەتیدەری هەبووجگە لەپیشەیەکی باش (بەگوێرەی چەندایەتی و چونێتی کرێ وەرگرتنەکەی) کە لقێکی یەکێتی جوتیارانی ناوچەکەی ئەبرد بەڕێوە.

–"ئەوە مەلێ!". ئالان تکای لێئەکرد، "مەلێ: وەرن، هەموتان!".

–بۆچی؟!.

–زۆر پێی پەست ئەبم. نازانم بۆچی.

"کەواتە تۆ ناماقوولانە بیر ئەکەیتەوە" بە ڕەقییەوە وتی و بەردەوامبوو لەسەر وتنی "هەمووتان وەرن" بەلام ((وەرن، هەموتان!))ەکەی ئەم وەکو ئەوەی ئۆدری گەرم و گوڕ نەبوو، کەس بەپیریەوە نەئەهات و هەمو دۆست و میوانەکان تەکینەوەو هەمو شتێك بەدەم ژیانەوە ئەتریقایەوەو چلەشۆڕەکانی گولەسۆسەنەکان کە لەڕابوردودا گەلاکانی لەخەمناکیدا خشەخشیان ئەهات، گەشانەوەو ڕاست بونەوەو هەلئەزنان..بەرەو دەست کردنە ملی خۆر.

## فای وێلدن:

–لەنیوزیلەندە لەدایك بووەو گەورە بووە، دوایی چۆتەزانکۆی سان ئەندروۆس.

–لەسکۆتلەندە و بەشی دەروونناسی و ئابووری تەواوکردوە.دوای دەسال نەبوونیی وکاری ناڕەحەت.

–وەکو ڕۆماننوسێك دەستی کردوە بەنوسین و تائێستاش بەردەوامە.

–جگە لەڕۆمان، کورتە چیرۆك ودرامای ڕادیۆیی و تەلەفیزیۆنیش ئەنوسێت.

–بەرهەمەکانی ئەم ژنە بۆچەندین زمانی زیندو وەرگێڕدراون.

## سەرچاوە

*Leader of the Band*

*By:Fay Weldon*

*Come on,Every one!*

*pp177-182*

# گۆڕەکە

## گی دی مۆپاسان

لە ئینگلیزییەوە: ئومێد فایەق قەرەداغی

حەڤدەی تەموزی ساڵی هەزار و هەشت سەد و هەشتاو سێ، کاتژمێر دوو و نیوی بەیانی، پاسەوانی گۆڕستانەکەی بێزێی، کە لە کوختەیەکی بچووکی قەراخ ئەم کێڵگەیەی مردووواندا دەژیا، لە وەڕینی سەگەکەی وەخەبەر هات، کە لە ناو چێشتخانەکەدا دەرگای لێ داخرابوو. پاساوانەکە بە خێرایی چووە خوارەوە و بینی ئەو بەسزمانە بۆن بە کونی دەرگاکەوە دەکات و شێتگیرانە دەوەڕێت وەك ئەوەی هەندێ پیاو خراپ بە دزییەوە لە دەوری ماڵەکە بگەڕێن.

ڤنسنتی پاسەوان، تفەنگەکەی هەڵگرت و چووە دەرەوە. سەگەکەی کە پێشی کەوتبوو دەست بەجێ بە ئاراستەی شەقامی گشتی بۆنێ ڕایکرد، لە مۆنۆمێنتی خاتوو تۆمۆیسۆدا لە پڕ دەوەستا، پاسەوانەکە بە ئاگاوە نزیك دەبووەوە، هەر کە ڕووناکیەکی کزی لە تەنیشت شەقامی ماڵێنڤەرەوە بینی، کە لە نێوان گۆڕەکانەوە دزەی دەکرد، کردەوەیەکی سامناکی بەدکاری بۆ دەرکەوت. پیاوێك تابوتی کچێکی لاوی، کە ئیوارەی پێشوتر نێژرابوو، هەڵکەندبووەوە و تەرمەکەی لێ دەردەهێنا. چرایەکی بچوکی بێ شەوقیش لەسەر کوڕایی زەوییەکە دانرابوو و ئەو دیمەنە بێزراوەی ڕووناك دەکردەوە.

ڤنسنت بازیدایە سەر کابرای بێ ڕەوشت، فڕێی دایە سەر زەوی و دەستەکانی بەست و بردی بۆ بنکەی پۆلیس.

کابرا پارێزەرێکی گەنج و دەوڵەمەند و بەڕێزی شارۆچکەکە بوو، ناویشی کۆرباتای بوو، ڕاکیشرایە دادگا و جێگری گشتیش کێشەکەی بەرەوانەکردنی کارە چەپەڵەکانی بۆ پشکنەر بیرنران، کردەوە. شەپۆلێك لە رق و کینە باڵی کێشا بەسەر هۆڵی دادگادا، کاتێك دادوەر دانیشت جەماوەری کۆبووەوە هاواریان کرد "مردن! مردن!" دادوەری سەرۆککار بە نارەحەت بێ دەنگی ڕاگرت و پاشان بە سەنگینی گوتی: "پارێزەر، چی هەیە تا لە بەرگریکردنتا بیڵێیت؟" کۆرباتای کە کەسێکی لاو و باڵابەرز و ئەسمەر بوو تۆمەتەکەی ڕەتکردبووەوە، هەستا سەرپێ، روخسارێکی قسە

له ڕوو، شێوازێکی چالاك و چاوانێکی بێ ترسی هەبوو. هیچ گرنگیەکی نەدا بە فیکە لێدانی نێو هۆڵەکە، بەدەنگێك دەستی کرد بە قسەکردن کە لە سەرەتادا نزم و داپۆشرابوو، بەڵام پاشان لە کاتێکدا بەرەو پێشتر دەچوو توندتر دەبوو:

"جەنابی سەرۆك، پیاوانی بەڕێزی دەستەی خوێندخواران: من زۆر کەم ووتەم هەیە کە بیڵێم. ئەو ژنەی کە من گۆڕەکەیم هەڵداوەتەوە خۆشەویستم بوو. خۆشم ویست. "خۆشم ویست، بە خۆشەویستیەکی هەستی نا، تەنها بە ناسکی دڵ و گیان نا، بەڵکو بە خۆشەویستیەکی ڕەها و تەواو، بەشەیداییەکی سەراپاگیر، لێم تێبگەن ساتێك بۆ یەکەم جار پێیگەیشتم دەرکم بە هەستێکی نامۆ کرد، نە سەرسامی بوو، نە پەسەندکردن، تەنانەت ئەوەش نەبوو کە پێی دەڵێن خۆشەویستی لە یەکەم نیگاوە، بەڵکو هەستکردن بوو بە دۆخێکی خۆش وەك ئەوەی لە نێو گەرماوێکی شلەتێندا نوقم کرابێتم! ئاماژەکانی سەرنجیان ڕاکێشام، دەنگی شەیدای کردم، و کە دەمڕوانی بۆ جەستەی ئەوە چێژێکی بێ کۆتایی هەبوو. وا دەردەکەوت لام کە پێشتر بینیبێتم هەروەها بۆ کاتێکی دوور و درێژ ناسیبێتم. لە ناخیدا بەشێك لە ڕۆحی منی هەبوو. وەك وەڵامێك دەهاتە بەرچاوم بۆ ئەو هاوارەی کە لەلایەن ڕۆحمەوە دەردەبڕا، بۆ ئەو گیانە وێڵ و یەکبینەی لەگەڵیدا لەماوەی سەراپای ژیانماندا داوای ئاوات دەکەین. کاتێك کەمێك باشتر ناسیم، تاکە بیری دووبارە بینینەوەی پڕی کردم لە پەرێشانییەکی قوڵ و بەتین، لای من گرتنی دەستەکانی شادیهێنەرتر بوو لە هەر شتێك کە بیرم لێ کردبێتەوە، زەردەخەنەکەی پڕی دەکردم لە کەیفێکی شێتانە، لەگەڵ ئارەزووی ڕاکردن و هەڵپەڕین، بۆ خۆ هەڵدانم بەسەر زەویدا "لەبەرئەوە ئێمە بووینە خۆشەویستی یەکدی" بەڵێ، لەوەش زیاتر ئەو هەموو ژیانم بوو و لەسەر زەویدا بۆ هیچ شتێکی دی نەدەگەڕام، و هیچ ئارەزووی زیاترم نەبوو. پەرۆشی هیچ شتێکی دی نەبووم. ئێوارەیەکیان کاتێك بەردەوام بووین لە پیاسەیەکی تارادەیەك دوور و درێژ بە تەنیشت ڕووبارەکەدا باران دایکرد بەسەرماندا، ئەو توشی هەڵامەت بوو، هەڵامەتەکە ڕۆژی دوایی گەشەی کرد بۆ سوتانەوەی سیەکانی، وە هەفتەیەك دواتر مرد. لە ماوەی کاتژمێرەکانی ئازار چەشتنیدا، سەرسامی و شپرزەیی ڕێگایان گرت لە تێگەیشتن و ڕامانم لێی، بەڵام کاتێك کە مرد بێ ئومێدی ئەوەندە ڕوخاندمی کە چیتر هیچ بیرکردنەوەیەکم نەمابوو. گریام لەمەودای هەموو وردەکاریە سامناکەکانی بەخاك سپاردنەکەیدا، پەرۆشی و ئازاری دژوارم وەکو شێتیەك کە جۆرێك لە خەمی هەستی و جەستەیی وابوو. پاشان کاتێك کە ئەو ڕۆشت، کاتێك لە ژێر گڵدا بوو، جارێکی دی ئەقڵم لە پڕ خۆی دۆزییەوە، و بە زنجیرەیەك ژانی ڕەفتاریدا تێپەڕیم، کە ئەوەندە ترسناك بوون، تەنها مەگەر ئەو خۆشەویستییەی ئەو بۆی نیشاندا بووم ئەوەندە گران بوو بێت. لە دوایدا ئەو بۆچوونە جێگیرەم بۆ هات: جارێکی دی نایبینمەوە. کاتێك کەسێك سەراپای ڕۆژێك لەو بیرکردنەوەیە بکۆڵێتەوە، وا هەست دەکات بەرەو شێتی دەچێت. تەنها بیر لەوە بکەوە! ئافرەتێك هەیە و تۆ پێی سەرمەستی، ئافرەتێکی تاکە، لە هەموو دونیادا یەکێکی دی وەك ئەوی تێدا نییە. ئەو ژنە خۆی دەداتە تۆ و لەگەڵ تۆدا یەکێتیەکی نادیار دروست دەکات کە پێی دەڵێن خۆشەویستی. چاوەکانی لە بۆشایی فراوانتر، لە ژیان دڵرفێنتر دەرکەون لات، ئەو چاوەڕوونانە لەگەڵ سۆزدا زەردەخەنە بگرن. ئەم ژنە تۆی خۆشبوویت، کاتێك

دەدوێت بۆت دەنگی شادی دابارێنێت بەسەرتا. و لەپڕ دیارنەمێنێت! بیر بکەنەوەلێی! دیارنەمێنێت، نەك تەنها لای تۆ، بەڵکو بۆ هەتا هەتایە، ئەو دەمرێت. تێدەگەن ئەمە مانای چییە؟ هەرگیز، هەرگیز، هەرگیز، لەوە زیاتر لە هیچ جێگایەك نامێنێت چیتر ئەو چاوانە دووبارە بە هیچ شتێكدا ناروانێت، جارێكی دی نە ئەو دەنگە و نە هیچ دەنگێكی وەكو ئەو وشەیەك دەرنابڕێت بە هەمان ئەو شێوەیەی ئەو دەریدەبڕی! جارێكی تر ڕوخسارێك لە دایك نابێت وەك ڕوخساری ئەو، هەرگیز، هەرگیز! قاڵبی پەیكەرەكان لەناو ناچن، دارشتەكان دەمێنن و كەسێك دەتوانێت تەنی وایان لیٚ دروست بكات كە هەمان هیلكاری و شێوەی هەبێت، بەلاٚم ئەو تاكە جەستە و ئەو تاكە ڕوخسارە جارێكی دی دووبارە لەسەر زەویدا لەدایك نابێتەوە. وە هێشتا ملیۆنان و ملیۆنان وە لەوەش زیاتر بوونەوەر لەدایك دەبن، و ئەم تاكە ژنە لە نێو هەموو ژنانی داهاتوودا دەرناكەوێتەوە. ئایا دەشیٚ؟ كەسیٚ شێت بكات كە بیر لەوە بكاتەوە.

ئەو بیست ساڵ ژیا، زیاتر نا، و بۆ هەمیشە وون بوو، بۆ هەمیشە بۆ هەمیشە، بۆ هەمیشە! ئەو بیری كردەوە، زەردەخەنەی كرد و خۆشیویستی. و ئێستا هیچ! ئەو مێشانەی لە پایزدا دەمرن ئەوەندەی ئێمە زۆرن لەم جیهانەدا. وە ئێستا هیچ! هەروەها پێموابوو كە جەستەی، جەستەی ناسكی، زۆر گەرم، زۆر شیرین، زۆر سپی و زۆر نازەنین لەوێدا لەو سندوقەدا لە ژێر زەویدا دەڕزێت. گیانی بیركردنەوەی، خۆشەویستیەكەی لە كوێیە؟ نەبینینەوەی ئەو بۆ جارێكی دی! بیركردنەوە لەو جەستە داهێزراوە، كە ڕەنگبوو هێشتا بیناسمەوە، شپرزەی كردم. ویستم جارێكی دی لێی بڕوانم.

بە خاكەنازێك و چرایەك و چەكوشێك ڕۆشتمە دەرەوە، بەسەر دیواری گۆڕستانەكەدا بازمداو گۆڕەكەم دۆزییەوە، كە هێشتا بە تەواوی دانەپۆشرابوو، تابووتەكەم هەڵدایەوە و تەختەیەكم لیٚ كردەوە. بۆنێكی ناخۆش، بۆنی گەنین خۆی كرد بە كونە لوتەكانمدا. ئای جێگاكەی بۆنی ئۆریسی لیٚ درابوو! هێشتا هەر تابووتەكەم كردەوە، چرا داگیرساوەكەم شۆڕكردەوە بۆ ناوی و ئەوم بینی، ڕوخساری شین، ئاوساوو سامناك بوو. شلەیەكی ڕەشیش لە دەمی چۆرابووە دەریٚ. ئەو! ئەمە ئەو بوو! ترس دایگرتم. بەلاٚم قۆڵم درێژ كرد تا ئەو روخسارە ناشیرینە بەرەو لای خۆم ڕاكیشم. وە پاشان دەستگیركرام. بەدرێژایی شەو ئەو بۆنە ناخۆشەی ئەم جەستە ڕزیوە، بۆنی خۆشەویستە باشەكەمم پاراست، هەروەك چۆن كەسێك بۆنی خۆشی ژنێك لە پاش لە ئامێزگرتنی سۆزیارانەی دەپارێزێت. (چیم لەگەڵ دەكەن بیكەن).

بێدەنگیەكی نامۆ باڵی كێشا بەسەر هۆڵەكەدا وا دەردەكەوت كە چاوەڕوانی هەندیٚ شتی زیاتر بن. دەستەی سوێندخۆران چوون بۆ بڕیاردان. چەند خولەكێكی كەم دواتر كە گەڕانەوە تاوانبار كراوەكە هیچ ترسێكی نیشاننەدا وە تەنانەت وا دەرنەدەكەوت كە بیر بكاتەوە. سەرۆكی دادگا لەگەڵ ڕەوشتە عادەتیەكاندا ئاشكرای كرد كە دادوەرەكانی دووپاتیانكردەوە كە تاوانبار نییە.

## سەرچاوە

***All available works of Guy de Maupassant***

***The grave***

***From Internet***

# یانسیب

## شرلی جەکسن

له ئینگلیزییەوە: شاهۆ قادر خانزادە

بەیانی ڕۆژی بیست و حەوتی مانگی جون ڕوناك و خورەتاو بوو. گەرمایەكی تازەی ڕۆژێكی تەواو هاوینی هەبوو. گوڵەكان گوڵ و گەڵایەكی بێ ئەندازەیان دەركردبوو، گیایش زۆر سەوز بوو. نزیكەی كاتژمێر دە خەلكی دێ كە خەریكی كۆ بوونەوە بوون لە گۆڕەپانەكە لە نێوان پۆستەخانە و بانكەكەدا. لە هەندێ شارۆچكەدا ئەوەند خەڵك هەبوون كە یانسیبەكە دوو ڕۆژی ئەخایاند و ئەبوایە ڕۆژی بیست و شەشی مانگی جون دەستی پێكرایە. بەڵام لەم گوندەدا كە تەنیا سێ سەد كەسی تێدابوو هەموو یانسیبەكە كەمتر لە دوو كاتژمێری ئەخایاند و ئەكرا كاتژمێر دەی بەیانی دەستی پێكرایە و لە كاتی گونجاودا تەواو ببوایە كە خەڵكی ئاوایی بۆ نانی نیوەڕۆ بگەنە ماڵەوە.

بێ گومان یەكەم جار مناڵەكان كۆبوونەوە. ماوەیەكی كورت بەر لە ئێستا كاتی خوێندن لە خوێندنگا تەواو ببوو هەستی ئازادبوون ناسەقامگیرانە لەسەر زۆربەیان نیشتبوو. بەر لەوەی كە بڕۆنە ناو گەمە پر لە بەزم و هەراكە ئەیانویست بۆ ماوەیەك بێ دەنگ بەیەكەوە كۆببنەوە. هێشتا باس باسی كلاس و مامۆستا و كتێب و تەمێ كردنەكان بوو. پێشتر و بۆبی مارتین، گیرفانەكانی پڕ كردبوو لە بەرد و كوڕەكانی تریش خێرا ئەویان كردە نمونەی خۆیان و سافترین و خڕترین بەردەكانیان هەڵبژارد. لە ئەنجامدا بۆبی، "هەری جۆنز" و "دیكی دێلاكرۆی" كۆگایەكی گەورە بەردیان لە سوچێكی گۆڕەپانەكەدا دروست كردو لە دژی هێرشی كوڕەكانی تر پاسەوانی یان لێ ئەكرد. كچەكان لە سوچێك وەستابوون و بەیەكەوە قسەیان ئەكرد و لەسەر شانیان سەیری كوڕەكانیان ئەكرد و مناڵە بچوكەكانیش لەناو تەپ و تۆزا تلیان ئەخوارد یان بە دەستی خوشك و برا گەورەكانیانەوە لكابوون.

لە ماوەیەكی كورتدا پیاوەكان كۆ بوونەوە، سەیری مناڵەكانیان ئەكرد و لە بارەی كشتوكاڵ و باران، تراكتۆر و باجەوە قسەیان ئەكرد. بەیەكەوە وەستان، دوور لە كۆگا بەردەكە لە سوچەكەدا و بە ئارامی قسەی خۆشیان ئەكرد و زیاتر زەردەخەنە

لەسەر لێویان بوو تا پێکەنین. ژنەکان کە جل و بەرگی کاڵەوە بووی ناوماڵیان لەبەردا بوو کەمێك دوای پیاوەکانیان هاتن. سلاویان لە یەکتر کرد و چەند قسە و قسەلۆکیان ئاڵوگۆڕ کرد کاتێك کە بەرەو لای پیاوەکانیان ئەچوون. پاش ماوەیەکی کورت ژنەکان کە لە تەنیشت پیاوەکانیان وەستابوون قاویان کرد لە مناڵەکانیان و ئەوانیش پاش چوار یان پێنج جار بانگ کردن بەنابەدڵییەوە هاتن. بۆبی مارتین لە دەستی دایکی کە گەرەکی بوو بیگرێ خۆی دزییەوە و بە پێکەنینەوە بەرەو کۆگای بەردەکان ڕای کردەوە باوکی بە توندی هاواری کرد و بۆبی بە پەلە هات و جێگای خۆی لە نێوان باوکی و بە تەمەنترین برای کردەوە.

یانسیبەکە بەڕێوە برا. لە هەمان کاتدا سەمای گۆڕەپانی*، یانەی هەرزەکاران و بەرنامەی هالووین لە لایەن بەڕێز "سامێرز"، کە کات و وزەی هەبوو بۆ ئەنجام دانی چالاکی مەدەنی سازدران، سامێرز پیاوێکی گەرم و گوڕ و دەم و چاو گرد و بەڕێوەبەری بازرگانی ڕەژوو بوو. خەڵك بە پەژارەوە بوون بۆی چونکە مناڵی نەبوو ژنەکەشی تووڕە و لۆمەکار بوو. کاتێك کە گەیشتە گۆڕەپانەکە بە باوڵە دارینە ڕەشەکەوە، خەڵکی ئاوایی دەستیان کرد بە چرپە چرپ و ئەویش دەستی بەرز کردەوە و هاواری کرد "خەڵکینە ئەمڕۆ کەمێك درەنگە". دوا بەدوای ئەو بەڕێز "گرەیڤز" بەرپرسی پۆستەخانەکە کورسییەکی سێ پایەی بێ پشت و دەسکی هەڵگرت و کورسییەکە لە ناوەراستی گۆڕەپانەکەدا دانراو بەڕێز سامێرزیش باوڵە ڕەشەکەی لەسەر دانا. خەڵکی ئاوایی دوور مانەوە بۆ ئەوەی لە نێوان خۆیان و کورسییەکەدا دۆژێك هەبێ. کاتێك بەرێز سامێرز پرسی ئایا کەسانێك لە ئێوە یارمەتیم ئەدەن؟ دڕدۆنگییەك هەبوو لەبەردەم دوو پیاودا، بەڕێز مارتین و کورە هەرە گەورەکەی، "باکستر"، هاتنە پێشەوە تا باوڵەکە لەسەر کورسییەکە توند بگرن کاتێك بەڕێز سامێرز کاغەزەکانی تێدا تێکەڵ ئەکرد.

یەکەم شت بۆ ئەنجامدانی یانسیبەکە لە کۆنەوە لە دەس چوو بوون و باوڵە ڕەشەکەی ئێستا لەسەر کورسییەکە دانراوە تەنانەت پێش لە دایك بوونی وارنر پیرە پیاو، بە تەمەنترین پیاوی شارەکە، کەڵکی لێ وەرگیرا بوو. چەندین جار لە بارەی دروست کردنی باوڵێکی نوێوە بەڕێز سامێرز لەگەڵ خەڵکی گوندەکەدا قسەی کردبوو. بەڵام هیچ کەس پێی خۆش نەبوو تەنانەت ئەوەندە لە نەریت تێك بدات کە باوڵە ڕەشەکە پیشانی ئەدا. چیرۆکێك هەبوو کە ئەیوت باولەکەی ئێستا لە هەندێ پارچەی باولەکەی پێش خۆی دروستکرابوو، ئەو باولەی یەکەم کەسانێك کە نیشتەجێی ئەم گوندە بوون دروستیان کرد. هەموو ساڵێك دوای یانسیبەکە بەڕێز سامیرز دەستی ئەکرد بە قسە کردن لە بارەی باوڵێکی تازەوە بەڵام گشت ساڵێك بابەتەکە لە بیر ئەکرا بێ ئەوەی شتێك ئەنجام بدرێ. باوەڵە ڕەشەکە هەر ساڵ کۆنترو شپرزەتر ئەبوو. ئێستا ئیتر بە تەواوی ڕەش نەبوو. لە لایەکەوە ئەوەندە پیس تویخی هەڵدابوو کە ڕەنگی بێخ دارەکە دیار بوو چەند جێگەیشی کاڵ و پەڵە پەڵە بوو.

رێزدار مارتین و کورە گەورەکەی، باکستر، باوەڵە رەشەکەیان توند لەسەر کورسییەکە گرت تا کاتێك بەرێز سامێرز کاغەزەکانی بە تەواوی بە دەستی تێکەڵ هەڵدا. لەبەر ئەوەی کە هەندێ دابی ئاییني لە بیر کرابوون یا وازیان لێ هێنرابوو، بەرێز سامێرز توانیبووی پارچە دارەکان کە بۆ چەندین نەوە کەڵکی لێ وەرگیرا بوو بگۆڕێ بە پارچە کاغەز.

رێزدار سامێرز وتبووی پارچە دارەکان زۆرباش بوون کاتێك کە دێکە بچوك بوو بەلاَم ئێستا کە ژمارەی دانیشتوان پتر لە سێ سەد کەسە و لەوانەیە زیاد بکا، پێویست بوو لە شتێك کەڵك وەرگیرێ کە بە سانایی تر لەناو باولە ڕەشەکەدا جێ خۆی کاتەوە. شەوی بەر لە یانسیبەکە رێزداران سامێرز و گرەیڤز پارچە کاغەزەکانیان دروست کرد و خستنیانە ناو باوڵەکەو پاشان برا بۆ ناو قاسەکەی کۆمپانیای ڕەژووی بەڕێز سامێرز و داخرا تا ئەو کاتەی بەرێز سامێرز ئامادەبوو بەیانی دواتر بیبا بۆ گۆڕەپانەکە.

پاشمەنەی ساڵەکە باوڵەکە لائەبرا، جارێك لە شوێنێك و جارێك لە شوێنێکی تر. ساڵێك لە کادێنی بەرێز گرەیڤزدا بوو ساڵێکی تریش لەبەر پێدا لە پۆستەخانە و بۆ ماوەیەکیش لەسەر تاقێك لە بەقاڵی مارتین و لەوێ بەجێ هێڵرا.

هەرا و هۆریایەکی زۆر هەبوو کە ئەنجام بدرێ بەر لەوەی بەرێز سامێرز دەسپێکی یانسیبەکە ڕاگەیەنێ. چەند لیست لە سەرۆکی ماڵباتەکان و سەرۆکی ئەندامانی ماڵەوە لە هەر ماڵباتێکدا و ئەندامانی هەر ماڵباتێك ئەبوا دروست بکرابا. بەڕێز سامێرز لە پاڵ سەرۆکی پۆستەخانەدا وەك فەرمانبەری یانسیبەکە سوێندی یاسایی خوارد. هەندێك لە بیریان بوو سەردەمێك جۆرێك خوێندنەوە بە دەنگی بەرز هەبوو کە فەرمانبەری یانسیبەکە ئەنجامیدا، ئاوازێکی سانا و سەرزاری کە هەموو ساڵێك لە کاتی خۆیدا خێرا و لەسەر یەك ئەوترایەوە. هەندێ خەڵك باوەڕیان وابوو کە فەرمانبەری یانسیبەکە ڕاهاتبوو بە دروستی و وریایی ڕاوەستێ لە کاتی ووتن یا خوێندنەوەدا، هەندێکی تر وا بیریان ئەکردەوە کە فەرمانبەرەکە ئەبوایە ڕێی کردبا لە نێوان خەڵکەکەدا، بەلاَم چەندین ساڵ پێش ئەم بەشە لە دابە ئاییننییەکە بەرگی سستی بۆ لەبەرکرابوو. هەروەها سلاَوێکی ئاییینی هەبوو کە فەرمانبەری یانسیبەکە پێویست بوو لە سەری کە بیڵێ لە کاتی قسەکردن لەگەڵ هەر کەسێکدا کە ئەهاتە پێش بۆ دەس کردن بە ناو باوەڵەکەدا، بەلاَم ئەمەیش بە درێژایی کات گۆڕا بوو. ئێستا وا هەست ئەکرا تەنیا بۆ فەرمانبەرەکە پێویست بێ لەگەڵ هەر کەسێکدا نزیك ئەبێتەوە قسە بکا. بەرێز سامێرز لە هەموو ئەمانەدا زیرەك بوو. لە کراسە زۆر سپی و جینزگەلی شینیدا و کاتێك دەستێکی بەبێ خەمی ئەخستە سەر باوڵە ڕەشەکە و بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵ بەرێز گرەیڤز و مارتین و ماڵباتیدا قسەی ئەکرد زۆر شیاو و دەست ڕۆیشتوو دەرئەکەوت.

هاوکات لەگەڵ ئەوەی بەرێز سامێرز سەرەنجام قسەی تەواوکرد و ڕوی کردە خەڵکەکە و خاتو هاچنسن بە پەلە لە ڕێگا تەنگەبەرەکەوە خۆی گەیاندە گۆڕەپانەکە و بلوزەکەی خستبووە سەر شانەکانی و خزایە پشت حەشیمەتەکە. بە خاتوو دێلاکرۆی کە لە پاڵیدا وەستابوو وتی"بە تەواوی لە بیرم چوو ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە". ئەنجا بە ئارامی پێکەنین. خاتوو هاچنسن درێژەیداو وتی "وام ئەزانی پیاوە پیرەکەم لە دەرەوەیە و دار کۆ ئەکاتەوە پاشان سەیری دەرەوەی پەنجەرەکەم کرد و منداڵەکان ڕۆیشتبوون، ئەنجا کەوتە بیرم ئەمڕۆ بیست و حەوتەمەو هاتم ڕامکرد". دەستەکانی بە بەرهەڵبێنەکەی وشك کردەوەو خاتوو دیلاکرۆی وتی "سەرەڕای ئەوە درەنگ نەهاتووی. ئەوە ئەوان لەو سەرەوە هێشتا خەریکی قسە کردنن".

خاتوو هاچنسن ملی درێژ کرد و لەناو حەشیمەتەکەدا مێردەکەی و منداڵەکانی پەیدا کرد کە نزیك ڕیزی پێشەوە وەستابوون. بەهێواشی لە

قۆڵی خاتو دیلاکرۆیدا وەك خواحافیزی وتن و خۆی کرد بەناو حەشیمەتەکەدا. خەڵك بە ڕوخۆشییەوە جیابوونەوە کە ڕێگای بۆ بکەنەوە. دوو یا سێ کەس بە دەنگێکی بەو ئەندازە بەرز کە خەڵکەکە گوێیان لێی بێ وتیان "هاچنسن ئەوە خانمت خەریکە دێ" و "بیل ئەو سەرەنجام هات". خاتو هاچنسن گەیشتە مێردەکەی و بەڕێز سامێرز کە چاوەڕێی بوو بە ڕوخۆشییەوە وتی "تێسی، وای بۆ ئەچووم کە بێ تۆ بڕۆینە پێش". خاتو هاچنسن دەمی پان کردەوە و پێکەنی و وتی "جەو"، تۆ ناهێڵی من دەفرەکانم لە دەفرشۆرگەکەدا جێبێڵم. ئەتەوێ؟ پێکەنینێکی نەرم حەشیمەتەکەی گرتە خۆ کاتێك خەڵك کەوتنە جمو جۆڵ بۆ دواوە بۆ شوێنی خۆیان دوای گەیشتنی خاتو هاچنسن.

بەڕێز سامێرز هێمنانە وتی ئێستا باشترە دەست پێکەین و تەواوی بکەین بابتوانین بچینەوە سەر کارەکەمان. کەسێك هەیە لێرەدا ئامادە نەبێ؟

چەند کەس وتیان "دونبەر، دونبەر، دونبەر."

بەڕێز سامێرز سەیری لیستەکەی کرد و وتی "کلاید دونبەر. بەڵێ ڕاستە. پای شکاوە وانیە؟ کێ پشکی بۆ ئەخا؟"

ژنێك وتی "وابزانم من." بەڕێز سامێرز ڕوی تێکرد و سەیری کرد و وتی "ژن بۆ مێردەکەی پشك ئەخا؟ کوڕێکی گەورەت نیە کە ئەو کارەت بۆ ئەنجام بدا جێنی؟" سەرەڕای ئەوەی کە بەڕێز سامیرز و هەموو کەسێك لە گوندەکەدا زۆر بە باشی وەڵامی پرسیارەکەیان ئەزانی، ئەرکی فەرمانبەری یانسیبەکە بوو بە شێوەی ڕەسمی ئەو جۆرە پرسیارانە بپرسێ. بەڕێز سامێرز بەدەم و چاوێکی پڕ لە حەز و ئەدەبەوە چاوەڕێ بوو کاتێك خاتو "دونبەر" وەڵامی دایەوە.

خاتو دونبەر بە پەشیمانییەوە وتی "هوراس" هێشتا شانزە ساڵیەتی من ئەم ساڵ ئەبێ ئیشی پیاوە پیرەکە ئەنجام بدەم".

بەڕێز سامێرز وتی "باشە" و لەسەر لیستەکەی دەستی شتێکی نووسی. پاشان پرسی "ئایا ئەم ساڵ کوری واتسۆن پشك ئەخا؟" کوڕێك لە ناو حەشیمەتەکەوە دەستی بەرز کردەوە ووتی "من ئامادەم بۆ خۆم و دایکم پشك بخەم". بەنیگەرانییەوە چاوی تروکاند و سەری داخست کاتێك چەند دەنگ لە ناو خەڵکەکەدا شت گەلی لەم بابەتەیان وت "جەك، هەڤاڵی باش" و "شادین دایکت توانی پیاوێك پەیدا بکا ئەو کارە ئەنجام بدات". بەڕێز سامێرز وتی "باشە ئەوە هەموان. وارنر پیرە پیاو ئامادەیە؟"

دەنگێك وتی "ئامادەم". و بەڕێز سامێرز بە نیشانەی تێگەیشتن سەری لەقاند.

بێ دەنگیەك هەموو حەشیمەتەکەی گرتە خۆ لەو کاتەی کە بەڕێز سامێرز کۆکەیەکی کرد و سەیری لیستەکەی کرد و قاوی کرد "هەموو ئامادەن؟ ئێستا ناوەکان ئەخوێنمەوە — یەکەم سەرۆکی ماڵباتەکان — پیاوەکان هاتنە پێشەوە و کاغەزێکیان لەناو باولەکە دەرهێنا. کاغەزەکە لەناو دەستاندا قەد بکەن بێ ئەوەی سەیری بکەن تا ئەو کاتەی هەر کەسێك سەرەی ئەگات. گەیشتن؟"

خەڵك ئەوەندە ئەم کارەیان ئەنجام دابوو کە هەر نیواونیو گوێیان لە قسەکان گرت. زۆربەیان بێ دەنگ بوون و لێوەکانیان تەڕ ئەکرد و سەیری دەوروبەریان نەئەکرد. ئەنجا بەڕێز سامێرز دەستێکی بەرز کردەوە و وتی "ئارامز". پیاوێك خۆی لە ئاپۆرەکە دەربازکرد و هاتە بەرەوە. بەڕێز سامێرز وتی "سڵاو ستیڤ". بەڕێز ئادامزیش

وەڵامی دایەوە و وتی "سڵاو جەو". بە ڕوخۆشی و بە نیگەرانییەوە بەرەو یەك بە دەمێکی پانەوە پێکەنین. پاشان بەڕێز ئادامز گەیشتە باولە ڕەشەکە و کاغەزێکی قەدکراوی دەرهێنا. گۆشەیەکی توند گرت و بەرەو دوا وەرچەرخاو خێرا گەڕایەوە بۆ جێگەکەی لەناو ئاپۆرەکەدا، کەمێك دوور لە ماڵباتی وەستا و سەیری دەستی خۆی نەئەکرد.

بەرێز سامێرز وتی "ئالێن، ئاندرسۆن، بێنتام".

خاتو دێلاکرۆی بەخاتو گرەیڤز کە لە ڕیزی دواوە بوو وتی "وا دیارە ئیتر هیچ کاتێك لە نێوان یانسیبەکاندا نەبێ. ئەڵێی هەفتەی پێشوو بوو یانسیبەکەی ڕابردوومان تەواو کرد".

خاتو دێلاکرۆی وتی "ئەوە پیاوە پیرەکەم خەریکە ئەڕوا. هەناسەی وەستاند کاتێك مێردەکەی چووە پێشەوە.

بەڕێز سامێرز وتی "دونبەر" خاتو دونبەریش قنج و قیتانە بەرەو باولەکە ڕۆیشت و کاتێك یەکێك لە ژنەکان وتی "جەینی برۆ" یەکێکی گەیشت وتی "ئەوا ئەڕوا" خاتو گرەیڤز وتی "پاشان سەرەی ئێمەیە". و سەیری ئەکرد کاتێك بەرێز گرەیڤز لەلای باولەکەوە هات بەجدییەتەو سڵاوی لە بەڕێز سامێرز کرد و کوتێك کاغەزی لە باولەکە هەڵبژارد. تا ئێستا هەموو پیاوەکان لە ناو حەشیمەتەکەدا کاغەزی بچوکی قەدکراویان لە دەستە گەورەکانیاندا هەبوو بە نیگەرانییەوە ئەیان خولاند و ئەیان خولاند. خاتو دونبەر کوتە کاغەزەکەی لە دەستدا بوو لەگەڵ دوو کورەکەی وەستا بوو.

"هاربرت.. هاچنسن".

خاتو هاچنسن وتی "بیل هەستە لەویا". خەڵکەکەی پاڵ ئەویش پێ کەنین.

"جەونز"

بەرێز ئادامز بە "وانر پیرە پیاو"، کە لە نزیکیدا وەستابوو وتی "ئەوان بە دڵنیاییەوە ئەڵێن لەو گوندە لە باکور باس باسی وازهێنانە لە یانسیبەکە".

وارنر پیرە پیاو فنەفنێکی کرد ووتی "کۆمەڵێك پیاوی شێت و بێ عەقڵ. بەڕو گرژییەوە زیادی کرد بە گوێ گرتن لە لاوەکان، دەرئەکەوێ هیچ شتێك بۆ ئەوان بە ئەندازەی پێویست باش نیە. شتێکی کە تۆ ئەزانی، ئەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ ژیان لە ئەشکەوتدا، کەس ئیتر ئیش ناکا یاخود ماوەیەکیش بەو شێوە ناژی. قسەیەك هەبوو ئەیوت "یانسیب لە مانگی جوون دابێ، بەم زووانە دەخڵودان زۆر ئەبێ"، یەکەم شت خۆت ئەزانی، خەریکی خواردنی گژوگیای پیشاو و ناوکە بەڕو ئەبین. هەردەم یانسیبەکە هەربووە. خراپە چاومان بکەوێ بە "جەوسامێرز"ی لاو لەو سەرە خەریکی نوکتە بازییە لەگەڵ هەموو کەسێکدا"

خاتو ئادامز وتی "هەندێ شوێن پێشتر وازیان لە یانسیب هێناوە"

وارنر پیرە پیاو بە ئازاییەوە وتی "هیچ شتێك لەوەدا نیە جگە لە بەڵا. کۆمەڵێك لاوی بێ عەقڵ".

"مارتین" بۆی مارتین سەیری باوکی کرد کە چووە پێشەوە.

خاتو دونبەر وتی "خۆزگە پەلەیان بکردبا. بریا پەلەیان بکردبا"

کوڕەکەی وتی "نزیکە و تەواو بونن"

خاتو دونبەر وتی "ئامادەی ڕاکردن بە بەرەو لای باوکت و پێی بڵێ".

بەڕێز سامێرز قاوی لەناوی خۆی کرد و ئینجا بە ووردی هەنگاوێکی بۆ پێشەوە هەڵێنا و لەتێك کاغەزی لە باولەکە هەڵبژارد. پاشان قاوی کرد "وارنر"

وارنر پیرە پیاو لە کاتێك کە بەناو حەشیمەتەکەدا ڕۆیشت وتی "حەفتاو حەوت ساڵە من لەناو یانسیبەکەدام. حەفتاو حەوت جار"

"واتسن" کورە باڵا بەرزەکە پەشۆکاوانە لای حەشیمەتەکەوە هات. کەسێك وتی "جەك نیگەران مەبە" بەڕێز سامێرزیش وتی "پەلەمەکە، کورەکە" "زانینی".

دوای ئەوە وەستانێکی درێژ هەبوو، وەستانێکی دژوار تا کاتێك بەڕێز سامێرز کە لەتە کاغەزەکەی لە دەستدابوو وتی "زۆر باشە، هاوڕێیان" بۆ خولەکێك هیچ کەس جوڵەی نەکرد و پاشان هەموو لەتە کاغەزەکان کرانەوە. لەناکاو تێکڕای ژنان دەستیان کرد بە قسەکردن، ئەیان وت "کێیە؟" کێ بردییەوە؟" "ماڵباتی دونبەرە؟" "ماڵباتی هاچنسنە؟" ئینجا دەنگ هات کە "هاچنسنە" "بیلە" "بیل هاچنسن بردیەوە".

خاتو دونبەر بە کوڕە گەورەکەی وت "بچۆ بە باوکت بڵێ"

خەڵك بۆ بینینی ماڵباتی هاچنسن سەیری دەوروبەریان ئەکرد. بیل هاچنسن بێ دەنگ ڕاوەستا بوو چاوی بڕی بۆوە کاغەزەکە لە دەستی دا لەپڕ تێسی هاچنسن بەسەر بەڕێز سامێرزدا نەڕاندی "تۆ کاتی پێویستت پێ نەدا کە هەر کاغەزێك ئەیویست هەڵی بگرێ. چاوم لێت بوو. ئەوە دادوەرانە نەبوو".

خاتو دێلاکرۆی قاوی کرد "تێسی، خۆشحاڵ بە" خاتو گرەیڤزیش وتی ئێمە هەمووومان هەمان شانس مان هەبوو".

بیل هاچنسن وتی "وس بە تێسی"

بەڕێز سامێرز وتی "زۆر چاکە، هاوڕێیان ئەوە تارادەیێ زوو ئەنجام دراو ئێستا ئەبێ کەمێ زیاتر پەلە بکەین بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا تەواو ببێ"

سەیری لیستەکەی دوایی کرد و وتی "بیل تۆ بۆ ماڵباتی هاچنسن پشك بخە. تۆ ئەو دەرفەتەت هەیە بۆ کەسێکی کە لە ئەندامانی خێزانی هاچنسن پشك بخەی"

خاتو هاچنسن هاواری کرد "دان و ئیڤا ماون با ئەوان بەختی خۆیان تاقی کەنەوە" بەڕێز سامێرز بە ئارامی وتی "تێسی کچەکان لە تەك ماڵباتی شوەکانیان پشك ئەخن. تۆیش وەکو هەموان ئەوە ئەزانی"

تێسی وتی "ئەوە دادوەرانە نەبوو"

بیل هاچنسن بە پەشیمانییەوە وتی "گومان ناکەم، جەو. کچەکەی من لەگەڵ ماڵی شوەکەی پشك ئەخاو ئەوە دادوەرانەیە و من هیچ خێزانێکی کەم نیە جگە لە مناڵەکان"

بەڕێز سامێرز ڕوونی کردەوە و وتی "تا ئەو شوێنەی پێوەندی بە ماڵباتەکانەوە هەبێ هەر خۆتی و تا ئەو شوێنەیش پێوەندی بە ئەندامانی ماڵباتەکان هەبێ هەر خۆت بڕیاردەری. تێگەیشتی؟

بیل هاچنسن وتی "بەڵێ".

بەڕێز سامێرز بەشێوەیەکی ڕەسمی پرسی "بیل چەن دانە منالێ؟"

بیل هاچنسن وتی "سێ دانە. بیل و نانسی و دەیڤ بچوك و تێسی و من هەین".

بەڕێز سامێرز وتی " زۆر باشە. هەری تۆ بلیتەکانت پێ دانەوە؟"

بەڕێز گرەیڤز وەك بەڵێ وتنێك سەری لەقاند و کوتە کاغەزەکەی بەرزکردەوە.

بەڕێز سامێرزیش پێی وت "ئینجا بیانخەرە ناو باوەڵەکە. ئەوەی بیل یش هەڵگرە و بیخەرە ناوی"

خاتو هاچنسن تاتوانی بە هێواشی وتی "لەبیر ئەوەدام ئەبێ دیسانەوە دەست پێ بکەین. پێتان

ئێژم ئەوە دادوەرانە نەبوو. کاتی پێویستان پیێ نەدا بۆ هەڵبژاردن. هەموو ئەوەیان بینی"

بەرێز گرەیڤز پێنج کوتە کاغەزەکانی هەڵبژارد بوو خستبونیە ناو باوەڵەکە، هەموو کاغەزەکانی خستە ناو جگە لەوانەی کەوتنە سەر زەوی و سروە هەڵیانیگرت و بردیانی.

خاتو هاچنسن بە خەڵکی دەورووبەری ئەوت "هەمووتان گویێ بگرن".

بەرێز سامێرز پرسی "بیل ئامادەی؟" بیل هاچنسنیش چاوێکی بەژن و منداڵەکانی هەڵخشاند و سەری بە نیشانەی بەڵیێ وتن جوڵاند.

بەرێز سامێرز وتی "لەبیرتان بیێ. کاغەزەکان هەڵگرن و بەقەد کراوی وەیان هێڵین تا ئەو کاتەی هەر کەسێك دانەیەکی هەڵگرتووە. هەری تۆ یارمەتی دەیڤ بچوك بدە" بەرێز گرەیڤز دەستی کورە چکۆلەکەی گرت کە بە حەزەوە بۆ لای باوەڵەکە لەگەڵیدا هات. بەرێز سامێرز وتی "دەیڤی، کاغەزێك لە باوەڵەکە دەربهێنە" دەیڤی دەستی کرد بەناو باوڵەکەدا و پێکەنی. بەرێز سامێرز وتی "تەنیا یەك کاغەز هەڵگرە. هەری تۆ بۆی هەڵگرە" بەرێز گرەیڤز دەستی منالەکەی هەڵگرت و کاغەزە قەدکراوەکەی لە مستی دەرهێناو گرتیە دەس و دەیڤ بچوکیش لە تەنشتی وەستا و بەسەر سوڕمانەوە سەیری کرد.

بەرێز سامیرز وتی "سەرەی نانسییە" نانسی دوانزە ساڵی بوو و هەڤاڵانی خوێندنگەی بە گرانی هەناسەیان هەڵکێشا کاتێك چووە پێشەوە و تەنورەکەی گۆڕی و کاغەزێکی بە نەرمی لە باوەڵەکە دەرهێنا. بەرێز سامیرز وتی "بیل" بیل، کە دەموچاوی سور هەڵگەڕابوو پێکەنی زیاد لە ئەندازە گەورە، تا رادەیەك باولەکەی کوتا کاتێك کە کاغەزێکی دەرهێنا. بەرێز سامێرز وتی "تێسی" تێسی بۆ ماوەی خولەکێك دوو دڵ بوو بەرانگارانە سەیری دەورووبەری کرد و ئینجا لێوی گوشی و بەرەو باوڵەکە بەریێ کەوت. کاغەزێکی بەپەلە لە باولەکە دەرهێناو لە پشت خۆی رایگرت.

بەرێز سامێرز وتی "بیل" و بیل هاچنسن دەستی درێژ کردە ناو باوڵەکەو گەڕاو دواجار دەستی بە کاغەزێکەوە دەرهێنا.

حەشیمەتەکە بیێ دەنگ بوون. کچێك چرپاندی "هیوادارم نانسی نەبیێ." دەنگی چرپەکە گەیشتە لێوارەکانی حەشیمەتەکە.

وارنر پیرە پیاو بە ڕوونی وتی "ڕۆژگارەکە گۆڕاوە. خەڵك وەك جاران نەماون "

بەرێز سامێرز وتی "زۆر باشە. کاغەزەکان بکەنەوە. هەری تۆ ئەوەی دەیڤ بچوك بکەرەوە.

بەرێز گرەیڤز لەتە کاغەزەکەی کردەوە و هەناسە هەڵکێشانێکی گشتی هەبوو لە ناو حەشیمەتەکەدا کاتێك کە بەرزی کردەوە و هەموان توانیان ببینن کە هیچی تێدا نەنووسرابوو. نانسی و بیل هاوکات کاغەزەکانیان کردەوە و هەردووکیان گەشانەوەو پێکەنین و ڕویان کردە حەشیمەتەکە و لەتە کاغەزەکانیان لەسەر و سەریانەوە ڕاگرت.

بەرێز سامێرز وتی "تێسی" وەستانێك هەبوو، پاشان بەرێز سامێرز سەیری بیل هاچنسنی کرد و بیل کاغەزە قەدکراوەکەی کردەوە و نیشانی دا. بۆش بوو. بەرێز سامێرز وتی "تێسی یە" و ئینجا دەنگی بێدەنگ کرا.

"بیل، کاغەزەکەیمان پیشان بدە"

بیل هاچنسن چوو بۆ لای ژنەکەی و بە زۆر لەتە کاغەزەکەی لە دەستی دەرهێنا. خاڵێکی رەش لە سەری بوو. بەرێز سامێرز شەوی پێشو خاڵە رەشەکەی بە پێنووسێکی داری ئەستوور لە نووسینگەی کۆمپانی رەژوو کێشابوو. بیل

هاچنسن کاغەزەکەی بەرز راگرت و لەناو حەشیمەتەکەدا وروژانێك پێکهات.

بەرێز سامێرز وتی "هەڤالآن، زۆر باشە، با زوو تەواوی بکەین"

گەرچی خەڵکی ئاوایی نەریتە ئایینییەکەیان لەبیر کردبوو و یەکەم باوڵە رەشەکەیان لەدەست دابوو، هێشتا لەبیریان بوو بەرد بەکار بهێنن. کۆگا بەردەکە مناڵەکان پێشتر دروستیان کردبوو ئامادەبوو. لەسەر زەویەکە بەرد هەبوو لەگەڵ وردە کاغەزی پرژ و بلأو کە لە باوەلەکە هاتبوونە دەر. خاتو دێلا کرۆی بەردێکی هێندە گەورەی هەڵبژارد کە پێویست بوو بە هەر دوو دەست هەڵیگرێ و روی کردە خاتو دونبەر و وتی "وەرە، زووکە"

خاتو دونبەر لە هەر دوو دەستی دا بەردی بچوکی پێ بوو و کەوتە هەناسە برکێ و وتی "بە هیچ جۆرێك ناتوانم راکەم. ئێوە لە پێشەوە برۆن من پێتان ئەگەمەوە".

مناڵەکان پێشتر بەردیان پێ بوو کەسێکیش هەندێ وردە بەردی دا بە دەیڤی هاچنسنی بچوك.

ئێستا تێسی هاچنسن لە ناوەڕاستی شوێنێکی بێ گرێ دابوو. دەسەکانی هیوا بڕاوانە درێژ کرد لەو کاتەی خەڵکی ئاوایی بەرەو ئەو کەوتنە جموجۆڵ.

وتی "ئەوە ڕەوا نیە" بەردێك درا لە لایەکی سەری.

وارنر پیرە پیاو ئەیوت "وەرن هەموتان وەرن."

ستیڤ ئادانر لە پێشەوەی ئاپۆرەی خەڵکی ئاوایی بوو و خاتوو گرەیڤزیش لە تەنیشتیدا.

خاتو هاچنسن هاواری کرد "دادپەروەرانە نییە، رەوا نییە" و هەموو هێرشیان بردە سەری.

## پەراوێز

*جۆرێك سەمایە بەپێی نەریتی ئەمریکی کە تێیدا سەماکاران لە دەستەگەلی چوار جوتییدا بەرامبەر یەکتر و لە گۆڕەپانێکدا دەست ئەکەن بە سەما کردن.

## سەرچاوە


*Literatare*

*Stracture, Sound, and Sense, second edition,*

*Laurence Perrine,*

*Southern Methodist University, Pages 218-225*

## فایلی ژماره

# ئێدوارد سەعید



- کورد و ئێدوارد سەعید
- ژیان و بەرهەمەکانی
- رادیکاڵ و شیك لە بەرزەخی نێوان وەرگرتن و لە دەرەوە مانەوەدا
- لەگەڵ ئێدوارد سەعید دا
- سەرزەنشتکردنی خۆرئاوا "ئێدوارد سەعید و عەلی شەریعەتی"
- پێکدادانی جەهل
- نمایشکردنەکانی ڕۆشنبیر
- ئەدۆنیس و دامەزرێنەری هونەری شیعری عەرەبی
- فرۆید و ناسنامەی یەهودی
- گفتوگۆیەك لەگەڵ ئێدوارد سەعید دا
- لەبارەی ئێدوارد سەعیدەوە

# کورد و ئێدوارد سەعید

مەریوان وریا قانیع

بۆ ئێمەی کورد ئێدوارد سەعید ڕۆشنبیرێکی گرفتئامێزە، کەسانێك هەن تا ئەو شوێنە دەڕۆن کە بڵێن ئەم ڕۆشنبیرە کەسێکە دژ بە مەسەلەی کورد و دژ بە داخوازییە نەتەوەییەکانی ئەم میللەتە، پیاوێکە نکوڵیی لە ئازار و نەهامەتی و برینەکانی مێژووی ئێمە دەکات. ئەم تێڕوانینە بۆ سەعید لەگەڵ سادەیی خۆیدا لە خۆڕا و بێبناغە نییە. لەو ساتە کەمانەدا کە ئێدوارد سەعید لە بابەتگەلێك دواوە پەیوەندار بە مێژوو و تراژیدیا و چاوەڕوانییە نەتەوەییەکانیی ئێمەوە، کۆمەڵێك شتی گوتووە هەڵە و نابەرپرسیار و بریندارکەر، لە هەمانکاتدا ناکۆکیش بەو جیهانبینی و میتۆد و ڕۆحیەتە ڕەخنەییە کە خەسڵەتی سەرەکی فیکر و کەسایەتی ئەم ڕۆشنبیرە خۆیەتی. ئەو شتانەی سەعید لە پەیوەندیاندا بە کوردەوە نووسیویەتی لە قسەی ئەو ڕۆشنبیرە ڕەخنەییە ناچێت کە وەك خۆی دەڵێت وەزیفەیەتی "لەبەردەم دەسەڵاتدا هەقیقەت بڵێت" بەڵکو لە دووبارەکردنەوەی قسەی کەسانێك دەچێت کە بیانەوێت هەقیقەتی دەسەڵاتێکی ناشیرین بشارنەوە.

لانیکەم لە دوو شوێندا سەعید بەشێوەیەکی وا لە کورد دواوە کە درزێکی گەورە دەکاتە ئەو وێنەیەوە کە ئەو بۆ خۆی و بۆ کەسایەتی ڕۆشنبیری وەك بوونەوەرێکی ڕەخنەیی و ئینسانی و ڕۆشنگەر هەیە.

لە ساتەوەختی یەکەمدا ئێدوارد سەعید نیشانەی پرسیار لەسەر ئەو ڕاستییە دادەنێت کە بەعس شاری هەڵەبجەی بە چەکی کیمیاوی بۆمببارانکردبێت. لە دوای داگیرکردنی عێراقەوە بۆ کوێت ئەمریکا دەکەوێتە هەڵدانەوەی لاپەڕە ڕەشەکانی مێژووی بەعس و بۆ کۆکردنەوەی ڕای گشتی لە دەوری شەڕەکە بە شێوەیەکی بەرفراوان تراژیدیای هەڵەبجە دەگێڕێتەوە. ئێدوارد سەعیدیش وەك ڕۆشنبیرێکی ڕەخنەیی گومان لە هەموو ئەو بەهانانە دەکات کە ئەمریکا بۆ ڕەوایەتیدان بە جەنگی دژ بە عێراق دەیانهێنێتە کایەوە لەوانەش گومان لەوەی کە عێراق چەکی کیمیاوی دژ بە کورد لە هەڵەبجەدا بەکارهێنابێت. سەعید لە مانگی مارتی ساڵی 1991 لەم بارەیەوە دەنووسێت: "بەهانەی ئەوەی کە عێراق گازی

ژەهـراوی بـە هاولاّتیـانی خۆیـدا کردبێـت زۆرجـار دووبارەکراوەتەوە، لە باشترین دۆخدا ئەم مەسەلەیە شـوێنی گومانــە، لەســەر ئــەم مەســەلەیە لانیکــەم راپـۆرتێکی کۆلێـژی جـەنگ لـە بەردەسـتدایە بـاس لــەوەدەکات کـــە ژەهراویکردنـــی کوردەکـــان لـــە هەڵەبجەدا کارێك بووە ئێرانییەکان ئەنجامیانداوە. ئەم راپۆرتـە کاتێـك نووسـراوە کـە عێـراق دۆسـت و هاوسـەنگەری ئـەمریکا بـووە، ئـەمرۆ لـە میدیاکانـدا خەڵکانێکی زۆر کەم هێما بەو راپۆرتە دەکەن".

لەم پەرەگرافەدا ئێدوارد سەعید بە پشتبەستن بــە راپــۆرتی دەزگایـــەکی ئـــەمریکی دەربـــارەی رووداوەکانی جەنگی ئێران و عێراق گومان لەو کارە دزێوەی عێراق بەرامبەر بە کورد دەکات.

ساتەوەختی دووهەمیشیان ساتەوەختی پلانی ئەمریکایـــە بـــۆ کۆکردنـــەوەی جیهـــان لـــە دەوری جـەنگێکی نـوێ دژ بـە عێـراق، بـەلاّم ئـەمجارەیان بـۆ روخاندنی رژێمەکەی سەدام حوسەین. لەو رۆژانەدا کـە بـاس لـە قۆنـاغی دوای سـەدام دەکـرا بـاس لـە دامەزرانـــدنی سیســـتمێکی سیاســـی فیـــدراڵی دیمـوکراس دەکـرا لـە شـوێنی سیسـتمە سیاسـییە تۆتالیتارییەکی سەدام حوسەین. ئێدوارد سەعید لە گفتوگۆیـــەکی تۆمـــەتئامێز و ناحەزانـــەدا لەگـــەڵ رۆشـنبیریی عێراقی کەنعان مەکییـە دژایـەتی خـۆی بۆ سیستمی فیـدراڵی لـە عێراقـدا دەردەبرێـت و وەك دووبارەکردنـــەوەی ئـــەزموونی یۆگســـلاڤیای دوای تیتـــۆ وێنایـــدەکات. واتـــە سیســـتمی فیـــدراڵی لـــە عێراقـدا وەك سـەرەتایەك بـۆ جـەنگ و پێکـدادانی ناوەکی و هەڵوەشاندنەوەی ئەو ولاّتـە دەبینێـت و بێگوێدانـە ویسـت و داخوازییـەکانی گـەلی کـورد و گەلانی عێراق بەکارێکی هەڵەی دەزانێت.

ئاشـکرایە سـەعید لـە هـەردوو دۆخەکـەدا بـە هەڵەداچـــووە، نـــە ئێـــران هەڵەبجـــەی کیمیابـــاران کـــردووە و نـــە فیدرالیـــەتی عێـــراق، بـــە هـــەموو دیموکراسییەکانییەوە، دووبارەکردنەوەی سیناریۆی یۆگۆســـلاڤیای دوای تیتۆیـــە. یەکـــەمیان کارێکـــە دەوڵەتەکـــەی ســـەدام حوســـەین لێپرســـراوە و دووهەمیشـــیان چارەســـەرێکی گونجـــاوە لەگـــەڵ پێکهـات و ویسـت و چـاوەڕوانی هێـزە سیاسـی و دینی و ئەتنییە گرنگەکانی ناو عێراقدا.

بەلاّم ئایا سـەعید ئـەم دوو هەڵەیـە بـۆ دەکات؟ سەرچـاوەی ئـەم هەلاّنـە لـە کوێدایـە؟ ئایـا ئـەوەی سەعید دەیڵێت دووبارەکردنەوەی تۆمەتە هەمیشـە ئامادەکـــانی ناسیۆنالیســـتە عەرەبـــەکان و هێـــزە ئوسوڵییەکانی ئیسلامی سیاسییە؟ یان سەرچاوەی ئـەم هەلاّنـە لـە شـوێنێکی دیکـەدان لـە دەرەوەی فیکـری ناسـیۆنالیزم و دۆگمـای ئیسـلامی سیاسـی عەرەبیدا؟

بە بۆچوونی من سەرچاوەی هەڵەکانی ئێدوارد سەعید لـە فیکـری ناسیۆنالیزمی عـەرەبی و فیکـری هێـــزە ئیســـلامییەکانی جیهـــانی عەرەبیـــدا نییـــە، سەعید دورو نزیك پەیوەندی بەم دوو رێبازە فیکری و ئایدیۆلۆژییـەی جیهـانی عەرەبـەوە نییـە، بـەڵکو سەرچـاوەی ئـەو هەلاّنـە لـە نێـو ئـەو هەڵوێسـتە سیاسـیانەدایە کـە چـەپی ئـەوروپی و ئـەمریکی لـە پـازدە سـاڵی رابـردودا بەرامبـەر دەسـتێوەردانەکانی ئـــەمریکا لـــە جیهـــانی دوای جـــەنگی ســـاردا وەریانگرتووە. رەخنەی سەعید لە رۆژئاوا بە گشتی و لـە ئـەمریکا بـە تایبـەتی رەخنەیـەك نییـە لـە گۆشەنیگای ناسیۆنالیزمی عەرەبییەوە نووسرابێت، واتە رەخنەیەك نییە لە هەڵوێستی دەوڵەتە عەرەبی و رۆشـــنبیرە ســـوڵتەوییەکانیی ئـــەم رژێمانـــەوە نووســـــرابێت. هـــــەروەها رەخنەیـــــەك نییـــــە سەرچـاوەکانی بگەڕێتـەوە بـۆ نـاو ئـەو گوتـارە ئیســـلامییە نارسیســـتیەی کـــە بـــەردەوام لـــە رەســـەنایەتی و خۆمـــاڵیبوون و شوناســـێکیی فـووتێکراو دەدوێـت کـە گوایـە دوای نـامۆبوون و

ڕێونکردنێکی مێژوویی درێژ سەرلەنوێ دۆزراوەتەوە. بە مانایەکی دیکە ڕەخنەی سەعید لە ئەمریکا و لە ڕۆژئاوا ڕەخنەی بە شەیتانکردنی ئەو بەشەی جیهان نییە لە دیدێکی دینی و نەتەوەییەوە، ڕەخنەیەك نییە ڕەگەکانی لە دەرەوەی وشیاریی سیاسی و فەرهەنگی ڕۆژئاوا خۆیدا بێت لە پرۆسەی خۆخوێندنەوە و خۆڕەخنەکردنێکی بەردەوامدا، ئەگەرچی هەم ناسیۆنالیستە عەرەبەکان و هەم هێزە ئیسلامییەکانی جیهانی عەرەب بەشێوەیەکی خراپ دەرەنجامەکانی فیکری سەعید بۆ پڕوپاگەندەکردن بۆ مەبەستە سیاسییەکانی خۆیان دەخەنەگەڕ. ئەم خراپ بەکارهێنانەش بەڕادەیەکە سەعید ناچار دەبێت لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا لە پێشەکی یەکێك لە چاپە تازەکانی کتێبی "خۆرهەڵاتناسیدا" بە ئاشکرا باس لەم خراپ بەکارهێنانەی ناسیۆنالیست و ئیسلامییە عەرەبەکان بۆ دەرەنجامە فیکریەکانی خۆی بکات، هەروەهائەو پەیوەندییەی ئەو دوو هێزە لە نێوان کارەکانی ئەو و پڕوپاگەندە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆیاندا دروستیدەکەن بە درۆبخاتەوە. سەعید باوەڕی وایە خراپترین خوێندنەوەیەك بۆ نووسینەکانی ئەو کرابێت لە جیهانی عەرەبیدا بووە. سەعید پێیوایە کتێبەکانی ئەو بوونە هۆی لەدایکبوونی نەوەیەکی نوێ لە نووسەر و لێکۆڵەری زانستی لە وڵاتانی وەك هیند و ئەندەنوسیا و مالیزیا و وڵاتانی دیکەی ڕۆژئاوای ئاسیا و یاباندا، کەچی لە جیهانی عەرەبدا دەرەنجامە فیکرییەکانی ئەو جگە لە بەکارهێنانی ئایدیۆلۆژیانەی لەلایەن ناسیۆنالیست و ئیسلامییەکانەوە بۆ هێرشکردنی بەردەوام بۆ سەر ڕۆژئاوا شتێکی ئەوتۆی قابیلی باسکردنی نەخستۆتەوە. سەعید بە هەڵە لە جیهانی عەرەبدا وەك دوژمنێکی سەرسەختی ڕۆژئاوا و وەك بەرگریکەر لە ئیسلام و نەتەوەی عەرەب وێنادەکرێت و فیکری سەعید وەك بەشێك لە دیوە ڕەخنەییەکەی بیری ڕۆژئاوا خۆی نابینرێت. لە ڕاستیدا فیکری فۆکۆ چەند بەرگری لە نەتەوەی عەرەب و ئیسلام دەکات، کە نایکات، فیکری سەعیدیش هەر ئەوەندە دەیکات، ئەگەرچی لە خوێندنەوەی هەندێك ڕۆشنبیریی عەرەبدا فیکری فۆکۆش دەخرێتە خزمەتی گوتاری ناسیۆنالیستی عەرەبییەوە، بۆ نموونە لای نووسەرێکی وەك مەتاع سەفەدی. هێماکردن بۆ فۆکۆ لێرەدا پەیوەندی بەو ڕاستییەوە هەیە کە سەعید لە ژێر کاریگەری کارەکانی ئەودا نووسیویەتی و بیریکردۆتەوە.

خاڵێك لێرەدا پێویستە جەغتی لێبکەین ئەوەیە کە فیکری سەعید فیکرێك نییە بیەوێت نهێنی شاراوەی کۆمەڵگاکانی دەرەوەی ڕۆژئاوا بدۆزێتەوە و باسبکات، یان پێمانبڵێت ڕۆژهەڵاتی ڕاستەقینە چیی و کامەیە؟ کێشەکانی کامانەن و چارەسەری ئەو کێشانەش چۆن دەبێت؟ هەروەها فیکرێکیش نییە بیەوێت نیشانیبدات ئیسلامی ڕاستەقینە چییە و کامەیە؟ یان کێشەکانی ناسیۆنالیزمی عەرەبی چین؟ بۆ نموونە کتێبی "ڕۆژهەڵاتناسی" سەعید سەرباری ئەوەی تەرخانە بۆ باسکردنی ڕۆژهەڵات، کتێبێك نییە دەربارەی ڕۆژهەڵات، بەڵکو کتێبێکە دەربارەی وێنەکانی ڕۆژهەڵات لە خەیاڵی مەعریفی ڕۆژئاوادا. فیکری سەعید فیکرێکە سەرقاڵی خوێندنەوەی چۆنیەتی وێناکردنی ڕۆژئاوایە بۆ دەرەوەی خۆی، لەوانەش وێناکردنی ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەڵات، بۆ ئیسلام بۆ کولتوریی نەتەوەکانی تر. سەعید نایەت لە کۆمەڵگاکانی دەرەوەی ڕۆژئاوا بکۆڵێتەوە، کێشەکانیان دەستنیشانبکات، ئاسۆی دەربازبوون لەو کێشانە نیشانبدات، بەڵکو ئەو لە خودی ڕۆژئاوا خۆی دەکۆڵێتەوە، باس لەوەدەکات چۆن ڕۆژئاوا دەرەوەی خۆی وێنا و نمایشدەکات، چۆن



"ئەوەکانی دی" خۆی بەرهەمدەهێنێت. ئەم کارەی سەعیدیش بەشێکە لە هەوڵدانی فیکری ڕۆژئاوا بۆ خوێندنەوەی خودی ڕۆژئاوا خۆی. فیکری سەعید بەشێکەلە فیکری ڕۆژئاوا لە ساتەوەختی تێرامانێکی ڕەخنەیی ئەم فیکرە لە خۆی و لە چۆنیەتی وێناکردنی کۆمەڵگاکانی دەرەوەی خۆیدا. فیکری سەعید فیکرێك نییە هاریکاریمان بکات بۆ تێگەیشتن لە ڕۆژهەلات و کولتوری کۆمەڵگاکانی دەرەوەی ڕۆژئاوا، بەڵکو فیکرێکە یارمەتیمان ئەدات بۆ تێگەیشتن لە ڕۆژئاوا خۆی، بۆ تێگەیشتن لە ئاستێك لە ئاستەکانی کارکردنی خەیاڵ و عەقڵی ڕۆژئاوایی: ئاستی بەرهەمهێنانی ئەویدی. کەوابوو فیکری سەعید فیکرێك نییە بەرگری لە ئیسلام و جیهانی عەرەبی بکات بەڵکو فیکرێکە باس لەو وێنە هەڵە و ناڕاستانە دەکات کە ڕۆژئاوا لە ڕەوتی پەیوەندییەکی نایەکسانی دەسەلاتدا بۆ ئیسلام و جیهانی عەرەب دروستیان دەکات. تەواو وەکچۆن فۆکۆ "ئەویدی"یە ناوەکییەکانی ڕۆژئاوا لە فۆرمی دێوانە و نەخۆش و شازدا دەدۆزێتەوە، سەعید "ئەویدی"یە دەرەکییەکانی ڕۆژئاوا لە فۆرمی دنیا و کۆمەڵگا و کولتورەکانی دەرەوەی ڕۆژئاوادا ئەدۆزێتەوە.

فیکری سەعید سەر بەو بەشەی فیکری خۆرئاواییە کە لە پەیوەندییەکی ڕەخنەییدایە لەگەڵ خۆیدا، فیکرێك کە لە دۆخی سەعیدا ڕەگەکانی لەناو فیکری فیکۆ و مارکس وگرامشی و فۆکۆدایە. ئەم قوتابخانە فیکریانەش سەر بەو بەشەی فیکری ڕۆژئاوان کە بە فیکری ڕەخنەیی ناونوسکراوە، فیکرێك کە ڕەخنەکردنی جیهان و ڕەخنەکردنی نایەکسانییەکانی هەڵقەیەکی گرنگیەتی، هەروەها فیکرێکە دەروازە لەسەر دیدێکی مێژوویی گرنگ دەکاتەوە و ئەو شتانەی لە جیهاندا ڕوودەدەن، لە ڕووداوە سیاسییەکانەوە بۆ بەرهەمهێنانی تێکستەکان، لەناو هاوکێشە مێژووییە ئاڵۆزەکاندا جێگیر دەکات. فیکری سەعید بەم مانایە فیکری بەدنیاییکردن و بە مێژووییکردنی دیاردە و تێکست و ڕووداوەکانە.

سەرەڕای ئەو بۆچوون و هەڵوێستە نێگەتیڤانەی سەعید لەسەر چەند بابەتێك کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە مێژوو و کۆمەڵگای کوردییەوە هەیە، فیکری ئەم پیاوە فیکرێکە هەڵگری ڕستێك چەمك و دید و وێناکردنی ڕەخنەیی گرنگە کە دەتوانێت سیستمی پرسیار و وەلامدانەوە لە ڕۆشنبیری ئێمەدا تازەبکاتەوە.

هەم هەڵەکانی سەعید و هەم لێکدانەوە و خوێندنەوە قووڵەکانی بۆ فیکر و تێکستە گرنگەکانی ڕۆژئاوا دەتوانن وزەیەکی نوێ بە ڕۆشنبیری ئێمە بدەن و ببنە سەرچاوەی هێنانە پێشەوەی کۆمەڵێك پرسیار و خوێندنەوە و گۆشەنیگای نوێ. ئیشکردنی سەعیدیانە لەسەر تێکست، لەسەر پەیوەندی نێوان مەعریفە و دەسەلات، لەسەر نمایشکردنی کولتورەکان بۆ یەکتری، لەسەر پەڕینەوەی گریمانە فیکرییەکان لە واقیعەوە بۆ ناو جیهانبینییەکان، لەسەر کۆچی تیورە و چەمکەکان، لەسەر ڕۆڵ و کاری ڕۆشنبیر، لەسەر دەموچاوە جیاوازەکانی مەنفا، دەتوانێت ڕۆشنبیری ئێمە لە زیاد لە ڕووبەرێکدا تازە بکاتەوە و دەوڵەمەند بکات.

# ئێدوارد سەعید
# -ژیان و بەرهەمەکانی-

شوان ئەحمەد



## یەکەم/ ژیانی

-ئێدوارد سەعید، ناوی تەواوی ئێدوارد وەدیع سەعیدە و بەرواری 1ی تشرینی دووەمی 1935 لە شاری قودس لە فەلەستین هاتۆتە دنیاوە.

-کوڕی بنەماڵەیەکی مەسیحی پرۆتستانت مەزهەب بووە.

-ساڵی 1948 لەگەڵ یەکەمین جەنگی نێوان عەرەب -ئیسرائیل پاش ڕاگەیاندنی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل، لەگەڵ خانەوادەکەیدا قودس جێدێڵن و ڕوودەکەنە وڵاتی میسر.

-لە میسر دەچێتە کۆلێژی ڤیکتۆریا بۆ خوێندن کە دیارترین و بەناوبانگترین خوێندنگای میسربووە لەوسەردەمەدا، کەسانی وەك شا حسێنی پادشای پێشوی ئوردن و ئەکتەری بەناوبانگ عومەر شەریف لە خوێندکارەکانی ئەوێبوون.

-بەهۆی ئەو سستمە تەقلیدیەی خوێندن کە لە کۆلێژی ڤکتۆریادا هەبووە، ئێدوارد سەعید هەڵناکات و لەگەڵ مامۆستاکانیدا دەکەوێتە کێشەوە، ناچار باوکی بڕیار دەدات ڕەوانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای بکات تا درێژە بە خوێندن بدات.

-سەعید وەك لە زۆر چاوپێكەوتنەكانی و لە بەشێكی كتێبی (*out of place*)دا باسیدەكات، منداڵێكی گۆشەگیر و كەمدوو بێ هاوڕێ بووە، ئەمەش وایلێكردووە زیاتر هۆگری كتێب خوێندنەوە بێت. ئەو لە سەرەتای تەمەنیەوە خولیای كتێب خوێندنەوەی دەبێت، بەڵام ئەو كتێبانە ناخوێنێتەوە كە خانەوادەكەی بۆی دەستنیشان دەكەن، وەك كتێبەكانی: (ڕۆبنسۆن كرۆزۆ و ئیڤانهۆ و تەرەزان و شارلك هۆڵمز)، بەڵكو بە دزییەوە لە كتێبخانەكەی باوكیدا شەو درەنگان دەست دەكات بە خوێندنەوەی (ڕاڤەكردنی خەونەكان)ی "سیگمۆند فرۆید". سەعید كاتێك ئەمە دەكات تەمەنی سیانزە ساڵان دەبێت.

-ساڵی 1951 دەچێتە ولاٌتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاو لە ماساشۆستس و برنستۆن و هارڤەردا دەخوێنێت. لە زانكۆی هارڤەرد دەستدەكات بە خوێندنەوەی ئەدەبی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتاڵی و یۆنانی و ڕۆمانی و ئاشنایەتی لەگەڵ بیری بیریارانی وەك: (ڤیكۆو گرامشی و مارتن هایدگەرو ئۆرباخ و تیودۆر ئەدرنۆ و میرلۆپۆنتی و گۆڵدمان و كلۆدلێڤی شتراوس و میشێلفۆكۆو ڕۆلان پارت و...)، پەیدا دەكات.

-ساڵی 1957 لە زانكۆی برنستۆن بەسەركەوتویی خوێندن تەواو دەكات. پاشان لە ساڵی 1964 لە زانكۆی هارڤەرد بڕوانامەی دكتۆرا لە ئەدەبی بەراوردكاریدا وەردەگرێت.

-لە ساڵی 1963 وەكی مامۆستای ئەدەبی ئینگلیزی و ئەدەبی بەراوردكاری لە زانكۆی كۆلۆمبیا لە شاری نیویۆرك دەست بەكاردەبێت.

-پاش شكستی حوزەیرانی 1967، بایەخ بە كێشەكانی جیهانی عەرەبی و مەسەلەی فەلەستینی دەدات و دەبێتە هەڵسوڕاوێكی دیاری ئەو بوارە لە ولاٌتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا.

-ساڵی 1969 سەردانی ولاٌتی ئوردون دەكات و ساڵی 1970 بە چاوی خۆی شەڕی ئەیلولی ڕەش دەبینێت، لە نێوان سوپای ئوردون و چەكدارە فەلەستینیەكاندا.

-هەر لەو ساڵەدا ئوردون بەجێدێڵێت و ڕوودەكاتە بەیروت، لەوێ خانمێكی لوبنانی بەناوی "مریام قرطاس" دەهێنێت و دەبێتە هاوسەری ژیانی و دوو منداڵیان دەبێت بە ناوی (وەدیع و نەجلاء).

-ئەو ماوەیەی كە لە لوبنان دەمێنێتە، لەسەر دەستی "ئەنیس فەریحە" خۆی فێری زمانی عەرەبی دەكات و هەر لەو ماوەیەشدا دەست دەكات بە خوێندنەوەی (ئیمامی غەزالی و ئیبن خەلدون و تۆفیق حەكیم و تەها حسێن و نەجیب مەحفوز).

-ساڵی 1977 دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی فەلەستین لە مەنفا.

-لە 15ی تشرینی دووەمی 1988 لە ولاٌتی جەزائیر، لەگەڵ مەحمود دەروێش و چەند كەسێكی تردا جاڕنامەی سەربەخۆیی فەلەستین فۆرمەلە دەكەن.

-وەك نیشاندانی ناڕەزایی بەرامبەر ڕێكەوتننامەی ئاشتی ئۆسلۆ، ساڵی 1991 دەست لەكار كێشانەوەی خۆی لە ئەنجومەنی نیشتمانی فەلەستین ڕادەگەیەنێت. لە وتارێكدا لە ژێر سەردێڕی: (پرۆسەی ئاشتی لە خۆرهەلاٌتی ناوەڕاستدا، وێنە چەواشە كارەكان و هەقیقەتە ڕەقەكان) دەنووسێت: ( ڕاگەیاندنی ئەو سەرەتایانەی لە ئۆسلۆ ئیمزا كران، لە ڕاستیدا دژوارترین كارەساتی سیاسیان بەسەر مەسەلەی فەلەستینیدا هێنا. یەكەمجارە لە مێژوودا




سەرکردایەتیەکەمان زۆر بە ئاسانی واز لە مافی چارەی خۆنوسین و چارەنووسی ئاوارەکان و ئایندەی شاری قودس بهێنێت و ئەم سێ مەسەلە سەرەکیە، جێبهێڵێت بۆ گفتوگۆکانی کۆتایی. یەکەمجاریشە ڕازی بێت بەدابەشکردنی گەلەکەمان، ئەو گەلەی لە ساڵی 1948وە خەبات لە پێناو یەکخستنەوەیدا دەکەین).

-ساڵی 1991 و لە تەمەنی پەنجاو شەش ساڵیدا دوچاری شێر پەنجەی خوێن (لۆکیما) دەبێت، ئەمەش هەمان ئەو نەخۆشیەیە کە "فرانز فانۆن"ی ڕاپێچی مردن کرد.. هەمان ساڵ کۆمەڵەی داکۆکیکاران لە یەهودیەت، دژ بە هەڵوێستەکانی ئێدوارد سەعید لەمەڕ کێشەی ئیسرائیل – فەلەستین، ئاگر لە ئۆفیسەکەی بەردەدەن لە زانکۆی کۆلۆمبیا.

-ئێدوارد سەعید ئەگەرچی هەڵگری ڕەگەزنامەی ئەمریکی بوو، بەلاّم بۆ یەکەمین جار دوای چل و پێنج ساڵ ئاوارەیی لە ساڵی 1992دا توانی بگەڕێتەوە فەلەستین و چاوی بە وڵاتەکەی بکەوێتەوە.

-ئێدوارد سەعید جگە لە خەلاّتی بۆیدوین، لە هۆڵەندا بەرواری 24ی تشرینی یەکەمی 1999 یەکەم کەس بوو کە خەلاّتی سپینۆزای پێبەخشرا.

-پاش ئەوەی بۆ ماوەی دوانزە ساڵ ململانێی لەگەڵ نەخۆشیەکی کوشندەدا کرد، بەرەبەیانی ڕۆژی پێنج شەممە 25ی ئەیلولی 2003 لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی شاری نیویۆرکدا و لە تەمەنی شەست و هەشت ساڵیدا ماڵئاوایی لە ژیانکرد.

## دووەم/ بەرهەمەکانی:




1- **کتێب**

-جۆزیف کۆنراد و ڕۆمانی ئۆتۆبیۆگرافی، 1966.

-سەرەتاکان: مەبەست و میتۆد، 1975.

-خۆرهەلاّتناسی، 1978.

-دۆزی فەلەستین، 1979.

-ئەدەب و کۆمەڵگە، 1980.

-نیشاندانی ئیسلام، 1981.

-جیهان، دەق، ڕەخنەگر، 1983.

-پاش دواهەمین ئاسمان، 1986.

-یادەوەری زستان – چەند بیروبۆچونێك دەربارەی ژیان لە تاراوگە، 1987.

-فیقهی ئیسلامی و کلتوری فەرەنسی – لێکۆڵینەوەیەك لە کار و بەرهەمەکانی ئەرنست رینیان و لویس ماسینیۆن، 1987.

-سەرزەنشتکردنی قوربانی – لەگەڵ کریستۆڤەر هچنز، 1988.

-ڕەخنەی زانستی، 1988.

-تیۆریا گەڕۆکەکان، 1989.

-چەند لێکۆڵینەوەیەکی مۆسیقی، 1991.

-کلتور و ئیمپریالیزم، 1992.

-وێناکردنەکانی ڕۆشنبیر، 1994.

–سیاسەتی ئەبستراکت و فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی – لەگەڵ بێرنارد لویس، 1995.

–غەزە – ئەریحا، ئاشتی ئەمریکایی، 1995.

–ئاشتی و ناڕەزایی، 1995.

–چەند بەدواداچونێك لەمەڕ خۆرهەڵاتناسی، 1996.

–لێکۆڵینەوەیەکی مێژویی ئەدەب و پەیامی ڕۆشنبیر، 1997.

–دەرەوەی شوێن (*out of place*)، 1999.

–فرۆید و نائەوروپی، 2003.

–هاوسەنگی و هاودژی – لەگەڵ دانیل بارنبوام، 2003.

2- **بەشێك لە لێکۆڵینەوەکانی:**

–دەق وەك پراکتیزەکردن و ئایدیایەك، لە گۆڤاری: ***Language Notes Modern***، ساڵی 1973.

–ڕۆمانی نوێ و ڕەخنە، لە گۆڤاری: ***Tri – Quarterly***، ساڵی 1975.

–شارەزاکان و نامۆکان، پاشکۆی ئەدەبی گۆڤاری تایمز، 10ی ئەیلولی 1976.

–ئایدیۆلۆژیای جیاوازی، لە گۆڤاری: ***Critical Inquiry***، پایزی 1985.

–ئیعتیبار گێڕانەوە بۆ خۆرهەڵاتناسی، لە گۆڤاری: ***Europe and Its others***، 1985.

–بیریاران و جیهانی پۆست کۆلۆنیالیزم، لە گۆڤاری: ***New Left Review***، 1986.

–ئیسلام و خۆرئاوا، لە گۆڤاری: کەرمل، ژمارەی یەك – زستانی 1981.

–فۆکۆ و فانتازیای هێز، لە بڵاوکراوەی: زانکۆی ئۆکسفۆرد، 1986.

–ناسیۆنالیزم و کۆلۆنیالیزم و ئەدەب، 1988.

–دەنگی فەلەستینیەکان لە تاراوگە، لە گۆڤاری: ***Third Text***، 1988.

–ڕەتکردنەوەو توندوتیژی، لە گۆڤاری: ***New Left Review***، 1988.

–جین ئۆستن و ئیمپراتۆریەت – تێڕوانینێکی ڕەخنەیی، لە بڵاوکراوەکانی: زانکۆی کامبریدج، 1989.

–ڕاپەڕین و سەربەخۆیی، لە گۆڤاری: ***Social Text***، 1989.

–بیریارانی جیهانی سێیەم، لە گۆڤاری ***Raritan***، 1990.

–جوگرافیا و ڕاڤەکردن، لە گۆڤاری: ***New Left Review***، 1990.

–ژان پۆل سارتەر و عەرەب، 2000.

–ڕۆڵی کۆمەڵایەتی نوسەران و ڕۆشنبیران، 2002.

–شەڕی گەمژەکان، 2003.

**سێهەم/**

**هەندێك لەو کتێب و لێکۆڵینەوانەی دەربارەی "ئێدوارد سەعید" نوسراون:**




–ڕاناجیت جەحا و گایاتری چارکرافۆرتی: چەند لێکۆڵینەوەیەکی هەڵبژاردە – زانکۆی ئۆکسفۆرد، 1988.

–مایکل سبرینکەر: ئێدوارد سەعید، خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی – کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیەکە دەربارەی فیکری ئێدوارد سەعید.

–ئێدوارد ئەلکسەندەر: پرۆفیسۆری تیرۆر– وتارێکە لە گۆڤاری *Commentary*،1989.

–بێل ئەشکرۆفت و بال ئەهلوئەلیا: ئێدوارد سەعید و ئیشکالیەتی شوناس – لەندەن، 1999.

–بۆڵ ۆڵف: ئێدوارد سەعید و ئەرکی ڕەخنەگر، 2003.

–ئیعجاز ئەحمەد: خۆرهەڵاتناسی و پاش خۆرهەڵاتناسی– وەرگێڕانی: سائر دیب – دیمەشق، 2004.

–لەیلا غاندی: ئێدوارد سەعید و ڕەخنەگرانی، گۆڤاری کەرمل.

–کەمال ئەبودیب: ئێدوارد سەعید، کلتور و هەژمونگەری، گۆڤاری نەزوا.

## چوارەم/ گفتوگۆکان

–ئێدوارد سەعید و پەیامنێرانی عەرەب – گفتوگۆی سیڤان ئیمانوێل، گۆڤاری: *The Jerusalem Quarterly*، 1985.

–دەربارەی شوناسی فەلەستینی – گفتوگۆی سەلمان ڕوشدی، گۆڤاری: *New Left Review*، 1986.

–گفتوگۆیەك لەگەڵ ئیمری سالۆزنسکی – گۆڤاری: *Criticism in Society*، 1987.

–بیریارانی ئەمریکا و سیاسەتەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، گۆڤاری: *Social Text*، 1988.

–گفتوگۆیەك دەربارەی خۆرهەڵاتناسی، گفتوگۆی سوبحی حەدیدی – قودسی عەرەبی، 1995.

–گەمەو خۆشەویستی و شەڕ – گفتوگۆی: وان سمێس، ڕۆژنامەی گاردیان، 2001.

–محەمەد شاهین: ئێدوارد سەعید – وتارو گفتوگۆ، 2004.

## پێنجەم/ هەندێ شتی دیکە

ئەوەی لە سەرەوەدا خستمانە ڕوو، بەشێکی ئێجگار کەمی ئەو شتانەیە کە "ئێدوارد سەعید" نوسیویەتی یاخود لەسەر خودی خۆی و کار و بەرهەمەکانی نوسراوە، ئەو پیاوێك بووە جگە لە سیاسەت و فیکر گەلێ شتی سەیر و قەشەنگی دەربارەی موزیك و سینەما و ئۆپێرا و شیعر و سەمای خۆرهەڵاتی نوسیوە. بۆ نمونە "سەعید" وتارێکی تایبەتی دەربارەی سەماکەری میسری "تەحیە کاریوکا" نوسیوە، هەروەها وەکی ئەکتەریش لە فیلمی (الآخر – ئەوی دی)دا ڕۆڵی بینیووە، ئەم فیلمەش لە دەرهێنانی دەرهێنەری ناوداری میسر "یوسف شاهێن"ەو هەر یەك لە "نەبیلە عوبەید و مەحمود حەمیدە و هانی سەلامە و حەنان تورك"، ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەبینن. "ئێدوارد سەعید" سەرەتاکانی تا نەوەدەکان وەکی بیریار و ئەکادیمیستێك ناسرابوو، بەڵام لەوە بەدواوە وەکی "پییەر بۆردیۆ" لە فەرەنسا، کاری خۆی گۆڕی و زیاتر وەکی ئەکتیڤیستێك ڕەفتاری دەکرد.

پرۆژەی فیکری "سەعید" هەمەلایەن و بەرفراوان بوو، بەڵام سەرچاوە سەرەکیەکانی کۆمەڵە بیریارێکی دیاریکراو بوون، وەك: (ڤیکۆ، جۆرج لوکاش، میشێل فۆکۆ، فرانز ڤانۆن، ئەنتۆنیۆ گرامشی). هاوکات یەکێکە لەوانەی کە خوێندنەوەی ڕۆمان زادی سەرەکی پرۆژە فیکریە گەورەکانی بووە، هەر لە (ئۆریانتالیزمەوە) تا (کلتور و ئیمپریالیزم). ڕۆمان بۆ ئەو، ئەو فۆرمە ئەدەبیە سەرەکیە بووە کە تیایدا بۆ فۆرمەلە بوونی

هەڵوێستی ئیمپریالیستیانە گەڕاوە، بە تایبەت لە بەرهەمەکانی: (جۆزێف کۆنراد و جین ئۆستن و ئی می فۆرستەر و کاترین مانسفێڵد و تۆماس هاردی و ڕۆدیارد کیبلنگ و ئەندرێ ژید و ئەلبێر کامۆ و ئەندرێ مالرۆ و.. هتد).

"ئێدوارد سەعید" سەرەڕای ئەوەی بیریارێکی دیار و مەزنە، شوێن دەست و کاریگەری لەسەر زۆر کایەی ڕۆشنبیر دنیا و ڕۆشنبیرانی وەك "هومی بابا و تاریق عەلی" هەیە و، چەندین لایەنگر و خوێندکار و هەواداری لێرەو لەوێ هەیە و درێژە پێدەری پرۆژە فیکریەکانی ئەون، هاوکات سەرەڕای ئەوەی ڕەخنەگرێکی گەورەی ئەورووپا مەرکەزی و سیاسەتی هەژمونگەری ئەمریکایە لە دنیادا و خۆی وەکی داکۆکیکەرێکی بەشخوراوانی دنیا ناساندووە، بەڵام دەرهەق بە هەندێك کێشەو مەسەلەی سیاسی و ئینسانی تر خەمسارد بووە، بە تایبەت کێشەی کورد و هەلومەرجی وڵاتێکی وەکی عێراق لە ژێر حوکمڕانی بەعسدا. ئەڵبەتە کتێبی (دڵڕەقی و بێدەنگی) کە لە نوسینی "کەنعان مەکییە"یە، بە وردی بێدەنگی ڕۆشنبیرانی عەرەبمان نیشان دەدات کە "ئێدوارد سەعید" یەکێك لەوانە و ئەو بێدەنگیەش لەو بارودۆخە وەحشیگەرانەیە، تەعبیرە لەوپەڕی بێهەڵوێستی و لاموبالاتی ڕۆشنبیرانی عەرەب.

یەکێك لە خاڵە سلبیەکانی دیکەی "ئێدوارد سەعید"، جگە لەوەی لەسەرەوە باسمان لێکرد، تاوانبارکردن و تەشهیر پێکردنی ئەو کەسانەیە کە وەك ئەو بیریان نەکردۆتەوە یاخود ڕەخنەیان لێگرتووە، هەندێك وتاری هەیە لە دژی ئەو کەسانە مرۆڤ کە دەیانخوێنێتەوە، هەرگیز ناڵێت ئەمە لە بیریارێکی وەك "ئێدوارد سەعید" دەوەشێتەوە. ئەو لەم ساڵانەی دوایدا لیستێکی ڕەشی هەبوو کە کەسانی وەك: (بێرنارد لویس و ئەرنست گلنەر و دانیال بابیس و جۆدیت میللەر و کەنعان مەکییە و فوئاد عەجمی و شبلی تەلحومی و مەئمون ئەفەندی و.. هتد)، تێدا ڕیزکرا بوو، هەریەك لەوانەشی بە نەزان و دڵ ڕەش و بازاڕی و ملهوڕ و خۆ فرۆش و کاسەلێس وەسف دەکرد.

## سەرچاوە

بۆ ئەم بابەتە، سود لەم سەرچاوانە بینراوە:

1-صبحي حديدي: ادوارد سعيد، المثقف امام واجب الانشقاق – المدى الثقافي- العدد (10)، الثلاثاء 7/ تشرين الاول/ 2003.

2-د. سيار الجميل: ادوارد سعيد، المفكر البنيوي و السياسي الأكاديمي – موقع الايلاف، السبت 27/ ايلول/ 2003.

3-مجلة (اقلام) الالكترونية، WWW.aklaam.com.









# رادیکاڵ و شیك

## لەبەرزەخی نێوان وەرگرتن و لە دەرەوە مانەوەدا

محەمەد قائید

لە فارسییەوە: رەزا مەنوچەهری



مەرگی ئێدوارد سەعید لە نێو میدیا و رۆژنامەکانی جیهاندا پەرچەکرداری زۆری هەڵخڕاند لە بەر هۆکاری جۆراو جۆر لاپەڕەی گۆڤار و رۆژنامەکان ئاخێنران لە یادداشت و وتار کە پەیوەست بوون بە ژیانی ئێدوارد سەعیدەوە، بەڵام لەم نێوانەدا دەگمەن بوون ئەو یادداشتانەی کە هەڵوێستێکی ڕەخنەگرانەیان هەبووبێت بەرانبەر بە تێڕامانەکانی سەعید. ئەو بابەتەی کە لە خوارەوە دێت لە نوسینی "محمد قائد"ە و لە روانگەیەکی رەخنەگرانەوە رۆڵی روناکبیریی سەعید و کتێبە بەناوبانگەکەی "خۆر هەڵاتناسی" شیدەکاتەوە.

"خۆر هەڵاتناسی" بەناوبانگترین بەرهەمی ئێدوارد سەعیدە کە لە کۆتایی دەیەی 1970دا بڵاوبۆتەوە دەتوانین کتێبەکە لە چەند رستەیەکدا کورت بکەینەوە: خۆرهەڵاتناسی فەرەنسیەکان و بەریتانیەکان پێشکەوتووترە لە توێژینەوەی هاوکارەکانیان لە شوێنەکانی دیکەدا. ئەو ڕوانگەیەی کە بووە بە میراتی ئەمریکای پاش جەنگی جیهانی دووەم کاریگەریەتی و دەرەنجامێکی سیاسی هەبوو هەروەها بوو بە ئامڕازێك بۆ مانەوەی دەسەڵاتی کۆلۆنیالی.

لەسەرەتادا دەستنیشانی دەکات کە چ بابەت گەلێکی نەهێناوەتە نێو توێینەوەکەی: هیند، چین، ژاپۆن و ئێران، هەروەها حسابی بۆ لێکۆڵینەوەی توێژەرانی ئەڵمانی، ئیتالی، روسی، ئیسپانی، سویسری، هۆڵەندی و نەمسایی نەکردوە. جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە کە ئەمریکیەکان پاش جەنگی جیهانی دووەم نوێنەری دەوڵەتی ئەمریکان کە پێشەنگ و پێشڕەوی ئەو زلهێزەن بۆ هاتنە نێو رۆژهەلاّتی ناوەڕاست تاکو ببێتە میرات خۆری کۆلۆنیالیزمی فەرەنسە و بەریتانیا. شتێك بە لێکۆڵەرێکی سەربەخۆی ئەمریکای بوونی نییە کە جیاواز بێت لە دەسەلاّتی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. کارڵ مارکس بۆچوونێکی دەربارەی ناپیلیونی سێیەم هەبوو کە لە راستیدا ناپیلیون خۆی بە نوێنەری ئەو موڵکدارە بچوکانە دەزانی کە "لە توانایاندا نەبوو خۆیان نوێنەری خۆیان بن و دەبێت یەکێکی دی نوێنەریان بکات" ئێدوارد سەعید ئەو رستەیەی چەندەها جار بۆ وەسفکردنی بۆچوونی توانج ئاسای رۆژهەلاّتناسان بەرانبەر بە دانیشتوانی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست دوپات کردۆتەوە و، دەپرسێت ئەوە چۆنە کە فەرەنسی و بەریتانی و ئەمریکی دەتوانن ببنە ڕاڤەکاری کولتوری مسوڵمانان و عەرەبەکان، بەلاّم ئەو گەلانە بۆ خۆیان لەو دەسەلاّتە بێبەشن؟

ئەدوارد سەعید بەرانبەر بەوەی کە بایەخ بە عەرب نەدراوە گەلێك هەستیارانە قسە دەکات، رەخنە لە حەزی رۆژهەلاّتناسان دەگرێت کە بەبیّ قەید و شەرت بڕیار لەسەر هەموو عەرەب بە گشتی دەدەن و گلەیی دەکات کە ئەوان هەموو عەرەب بەسەر و بنی پیازێك دەزانن. لە رۆژهەلاّتناسیدا هەر قسە و باسێك کە رەخنەگرتن بێت لە عەرەبەکان بەبیّ جیاوازی بە مانای دژایەتیکردنی عەرەبی لێکداوەتەوە لە چەندین شوێندا ئاماژە بەوە دەکات کە خۆر هەلاّتناسان باسکردن دەربارەی رۆژهەلاّتی جوان و ئەفسانەیی کە هیندو زمانی سەنسکرێتی و ئێران و رەچەڵەکی ئاری و ئاڤێستا دەگرێتەوە، لە عەرەبە بیابان نشینەکان جیاکردۆتەوە کە "زمانی عەرەبەکان ئاوازێکی ناخۆشە بە گوێیان و لە قولاّیی قوڕگیانەوە دێتە دەرەوە" و لە رووی بەرخوردی سۆزەوە، ئەو دوانەیان لە دوو جێگای جیاوازدا داناوە. ئەوەی کە دەمێنێتەوە بانگەشەیەکە دژی سیّ هێزی کۆلۆنیالیستی (بەریتانیا و فەرەنسا و ئەمریکا) هەروەها دژی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە توێژەرانی ئەو ولاّتانە دەربارەی عەرەبەکان نوسیویانە، دەڵێت: "هەر لێکۆڵینەوەیەك کە لە بواری رۆژهەلاّتناسیدا بێت و لێکۆڵەرە ئەڵمانیەکانی لەبەرچاو نەگرتبێت شیاوی سەرکۆنەکردنە و منیش خۆم سەرزەنشت دەکەم". بەلاّم کتێبەکەی ئاماژەیەکی زۆر دەداتە ناو و بەرهەمی لێکۆڵەرە ئەڵمانیەکان. هۆی ئەو ناهاوسەنگیە لەوەدایە کە گرنگی دان بە بەرهەمی رۆژهەلاّتناسانی ئەڵمانی تیوریەکەی ئەو سەبارەت بە پەیوەندی تۆکمەو نەپچڕاوی رۆژهەلاّتناسی لەگەڵ کۆلۆنیالیزمدا لاواز دەکات.

بنەماکانی بانگەشەکەی ئەدوارد لەسەر دروستکردنی ئەو وێنایەیە کە رۆژهەلاّتناسان لەسەر عەرەبەکان کێشاویانە، بە نیاز خراپیەوە هەڵسوکەوتیان کردووە و ئاستی عەرەبەکانیان تاکو ئاستی کێویەك (دەشتەکیەك) هێناوەتە خوارەوە، لە وێنەی ئاوەژوکراوی رۆژهەلاّتناسان و ئیسلامناسانی رۆژئاوادا عەرەبەکان یان تیرۆرستن یان نەوت فرۆش. لە ئەنجامدا جولەکەکان نەك تەنیا خۆیان بە رۆژئاوایی دەزانن، بەڵکو کاریان گەیاندۆتە ئەو ئەنجامەی کە رەفتاری

خۆرهەڵاتناسانەیش دەکەن، بۆ نمونە ئیدوارد سەعید لە هەر دەرفەتێکدا کە دێنە دەستی هێرش دەکاتە سەر برنارد لویس (برناردلویس هیچ وەڵامێکی بەهێرشەکانی سەعید نەداوەتەوە).

ئەمەندە بە تووڕەییەوە نارەزایەتی خۆی دەردەبڕێت کە کەمتر دەتوانێت ئەوەمان نیشان بدات کە رۆژئاواییەکان سەبارەت بە دەق و کلتوری عەرەبەکان لە چ بابەتگەلێکدا ساختەکاری و چەواشەکاریان کردووە. گلەییەکەی سەعید هەم لەو دەرەنجامەیە کە بەشێوەیەکی تەواو رەها زانستیە و هەروەها لەو تێگەیشتنانە کە بۆ کلتوری هەیە، بۆیە بانگەشەی ئەوە دەکات لە دادوەریەکانیاندا (رۆژئاوایەکان) سوکایەتیان بە عەرەبەکان کردووە. لە راستیدا هەموو توێژەرە رۆژئاواییەکان ئەو سۆزەی کە بەرانبەر بە شارستانیەتی چینی و ئێرانی و هیندی هەیانبووە بەرانبەر بە عەرەبەکان نەیانبوە، هەرچۆنێك بێت خۆشویستن ئیمتیازێکە، بەلاّم بەویژدان بوون مافە.

ئیدوارد سەعید زۆرجار بەتێروتەسەلی هێرش دەکاتە سەر ئێرنست رێنان. ئەوەی کە دەربارەی رێنان و گوینۆ و کەسانی وەك ئەوان دەگوترێت تاڕادەیەك راستن، و ئەوان نەك نەژادگەرا بوون، بەڵکو راسیست بوون، بەلاّم لەو سەردەمەدا و لە ئەوروپادا هەموان بەو جۆرە بیریان دەکردەوە. باسەکەمان ئەوە نییە کە لەبەرئەوەی هەموان یەکجۆر بوون کەواتە هەموو بێتاوانن، بەڵکو دەڵێین هزری راسیزم وەك خەنجەرێك بەدژی عەرەبەکان دروست نەکراوە. رامانی ئەو جۆرە مرۆڤانە و جیهانی ئەوان لە کەشێکدا بوو کە تیایدا پڕۆتستانە سپیی پێستەکان لەسەر دەستی خودی پڕۆتستانە سپی پێستەکانی دیکە کوشتار دەکران و تاکو سەدەی بیستەمیش درێژەی هەبووە.

زۆر جێگای گومانە کە رووبەڕووبونەوەی رۆژئاواییەکان لەگەڵ (سلاڤ)ە روسەکاندا، تەواو خۆشەویستانەتر بووە لە رووبەرو بوونەوەیان لەگەڵ عەرەبەکاندا هەرچۆنێك بێت بەرهەمی خۆرهەڵاتناسانی رۆژئاوا لە پلەی یەکەمدا بۆ کۆمەڵە زانستیەکان و خوێندکارانی زانکۆ و ئەکادیمیسێنەکانی خودی ئەو ولاّتانە نەنوسراون. زۆربەی رەخنەکانی سەعید دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەیەم، ئیدی لێکۆڵینەوە لەسەر رۆژهەلاّت و ئیسلامیەکان بە تەنها لەدەستی ئەوروپییەکاندا قۆرغ نییە، بەڵکو تا دێت کۆرسی لێکۆڵینەوەی لەو جۆرە لە زانکۆکانی رۆژئاوادا بە زۆری دەکەوێتە دەستی ئەو مامۆستایانەی کە بۆ خۆیان خەڵکی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست و هێدی هێدی توێژەرانی ژاپۆنی و چینی لە مەیدانی رۆژهەلاّتناسیدا دێنە مەیدان.

### ئەو ئامۆژاییانەی کە خۆیان بە شوێنێك گەیاند:

ئەو بۆچوونەی سەعید دروستە کە جولەکەکان وەك بەشێك لە شارستانیەتی رۆژئاوا جێگایەکیان بۆخۆیان کردۆتەوە. گەلی جولەکە توانیان لە دوا ساڵەکانی جەنگی جیهانی دووەمدا وەك بەشێکی جیانەکراوە لە شارستانیەتی رۆژئاوادا بناسرێن. بە کورتی رەخنەکانی سەعید لەوەدا کۆدەبێتەوە کە کلتوری رۆژئاوا لەناخەوە عەرەبەکانی خۆشناوێت، بەلاّم کولتوری رۆژئاوا جولەکەکان قبوڵ دەکات، ئەو پێشوازیەی کە لەوانی دەکات لە عەرەبی ناکات. گلەییەکەی سەعید تەنها ئەوە نییە کە جولەکەکان کە لە بنەڕەتدا گەلێکی ئاسیایین خۆیان وەك رۆژئاواییەکان لێکردوە (سەعید بۆ خۆیشی رێك هەنگاوێکی لەو جۆرەی ناوەو لە سەرەتای لاوێتیدا سەراپا بوو بووە رۆژئاوایی)، بەڵکو رەخنەکەی سەعید بۆ ئەوەیە کە جولەکەکان بەناسنامەیەکی



ساختەوە گەڕاونەتەوە ئاسیا و وەك جەنگاوەرە ڕۆژئاوا ئاساکان داوای شەڕکەردەکەن. بیرۆکەی دروستکردنی دەوڵەتی جولەکە لەسەدەی بیستەمدا بووبەباسێکی دورودرێژلەسەرزەوی وەك کێشەیەکی تایبەت دەکێشرێتە سەدەی بیستو یەك وەك بڵێیت ڕۆژئاوا خودی کۆنی دژایەتیکردنی جولەکەکانی لەگەڵ گیتۆی وارشۆ و دیواری برلیندا ناردۆتە ئاسیاو لە هەمان کاتدا پێشینەی شەڕکردن لەسەر نیشتمانی فەلەستین دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی کۆن، ڕۆمیەکان وڵاتی فەلەستینیان داگیرکرد، موسوڵمانەکان لەدەست مەسیحیەکانیان سەندەوە ئێستاش دیسانەوەجولەکەکان هاتونەتەوە مەیدان.

بەڵام وێنایەك کە ڕۆژئاواییەکان بەرانبەر بە عەرەبەکان هەیانە ئەوەندەش پۆزەتیڤ نییە و مێژوورییەکی زۆر دورو درێژتری هەیە لە مێژوی وڵاتی ئیسرائیل و بە پێچەوانەی بۆ چوونەکانی ئیدوارد سەعید ئەوە تەنها پەیوەندی نە بە ئاوازی ناخۆش و لە قوڵی قوڕگ قسەکردنی عەرەبەکانەوە هەیە و نەبە پڕوپاگەندەی لایەنگرانی دەوڵەتی ئیسرائیلەوە. بە زۆری وێنای نێگەتیڤی عەرەبەکان لەرای گشتی ڕۆژئاوادا لەو ڕووەوەیە کە عەرەبەکان لە کاتێکدا بە دەنگی بەرز هاواری ئەوە دەکەن کە خەونی ئەوەیان بێتە دی کە کافرەکان بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و وڵاتانی مەسیحی بکەنەوە بە ئەندەلوسێکی تر، هەروەها دوژمنایەتی مانەوەی شارستانیەتی خۆرئاوایش دەکەن.

لە ئەستەمبووڵەوە کە کۆتایی ئاسیایە تاکو ڤییەنا و بەرلین کلتورەکان بە هێوری لەناو یەکتردا دەتوێنەوە، لە فەلەستیندا لەم گەڕەکەوە بۆ ئەو گەڕەك، لەم شارەوە بۆ ئەو شارۆچکە پەیوەندیەکی لەناکاو لە نێو ئەوروپا و ئاسیادا ڕوودەدات، کە هاوشێوەکەی لە هیچ شوێن و زەمەنێکدا ئەزموون نەکراوە. بازدانێکی کوتوپڕی لە کولتوری ئەوروپاوە بۆ کولتوری ئاسیا، لە بوداپێستەوە بۆ بەغدا و لە ئەمیستردامەوە بۆ ڕەبات. ئەو گەلانە لە ڕووی کولتوریەوە تێکەڵ بەیەك نین کە ئایینی جۆراوجۆریان بێت و هەندێك جیاوازیان لەگەڵ یەکدیدا هەبێت و بە ساڵان لە پاڵ یەکدا ژیابن، بەڵکو ئەو بیانیە نامۆیانەن کە بە کولتوری بەلژیکاو هۆڵەنداوە لە نێو خەڵکانێکدا ژیان دەکەن کە کولتوریان، کولتوری پاکستان و مەسقەتە. هەواچاکترە کە بۆ هەمیشە لە نێوان ڕۆژئاوای ئاسیا و ئەوروپادا دەریایەك وەك دەریای سپی پشتێنە و جیاکەرەوەمان بێت.

### چەند بابەتێکی هەستیار:

لەکتێبی ڕۆژهەڵاتناسیدا تەنها سێ جار ئاماژە بەجیهاد کراوە. یەکێکیان ئاماژە پێکردنێکی گومان هەڵخرێنە بۆ "ئەو گێرەشێوێنانەی کە جیهادیەکان و ئاژیتاتۆرە کۆمۆنیستەکان وەك هۆکار دراونەتە قەڵەم". ئیدوارد سەعید کە بۆ خۆی عەرەبێکی مەسیحییە ناچاردەبێت بۆبەرگریکردن لە عەرەبەکان بەرگری لەئیسلام بکات، چونکە تاڕادەیەك بەرگری کردنێکی چاك بەواتای هێرشکردنێکی گەرموگوڕە، بۆیە هێرش دەکاتە سەر نوسەرانی ڕۆژئاوا، بەڵام ناتوانێت سەردێڕەکەمان بۆ شیبکاتەوە کە چییە و چۆنە. ئەگەر تۆزێك تەنازول بکات، لەلایەن بەرەکەی خۆیەوە قبوڵناکرێت و دەردەکرێت و بەیەکێکی دیکە لەو ڕۆشنبیرە بێئاگایانە دەژمێردرێت کە سەری لە ئاخوڕی هزری ڕۆژئاوادایە و لەوەش خراپتر بە بەکرێگیراوێکی دەزانن کە بەبێ پارەو پول کاریان بۆ دەکات.

سەرەڕای ئەمانە زۆربەی موسوڵمانەکان لەگەڵ ئێدوارد سەعیددا هاوڕان کە نابێت مەسیحیەکان لە

جیهاد بتۆقن و، جیهاد بەوە دابنێن کە پەیوەندی بە سەردەمی سەرەتای ئیسلام و سەردەمی جەنگە خاچپەرەستیەکانەوە هەیە، بەڵام ڕێژەی ئەو موسڵمانانەی کە لەو بڕوایەدان سەردەمی جیهادی راستەقینەهێشتا دەستی پێنەکردوە لەو ئاستەدایە کە رۆژئاواییەکان بتۆقێنێت. پێویست بەسەد ملیون کەس ناکات تەنانەت چەند سەد شەرانگێز بەسە بۆ ئەو جیهادەی کە مەبەستیانە ترس لەو شەرانگێزانە کە لەنێو پێدەشتە لماوی و زیخەڵانیەکاندا سەرهەڵدەدەن چۆتە نێو زەینی رۆژئاوایەکانەوە و زۆر دژوارە کە بتوانرێت مەسیحیەکان دڵنیا بکرێنەوە کە هێرشێکی لەو جۆرە دووپات نابێتەوە.

**دەوڵەتانی داش:**

ئیدوارد سەعید زۆر ئازاری لەوە دەچەشت کە عەرەب لە روانگەی رۆژئاواییەکانەوە یان نەوت فرۆشە یان تیروریست، نوسینەکانی رۆژهەڵاتناسان وێنەی عەرەبەکانی لە چاوی گەلی ئەمریکادا چەواشە کردووە، بەڵام رێزی گەلان لەلایەن رۆژهەڵاتناسانی مردووە دیاری ناکرێت. رێز لەوەدایە کە میللەتان ئازادبن لە دەربڕینی بیروڕا و مافی دەنگدان، ئازادی میدیا و چاپەمەنی، چالاک بوونی دەزگا جەماوەریەکان (مەدەنیەکان) هەروەها لە یەکرێزی دەوڵەت و گەلدا پێکدێت. دەتوانین بە کورتی مێژووی سیاسی – کۆمەڵایەتی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە نێوبژیوانی دەوڵەتەکان بۆ ململانێ لەگەڵ ئیتنی کولتوریەکاندا باس بکەین. بەرهەڵستکاران لە وڵاتانی عەرەبدا دەڵێن دەوڵەتەکانیان بە تەنها داشێکن و بەس. دەتوانیین بڵێین ئەو داشانەن کە لە توانایاندا نییە لە جێگای خۆیاندا بۆ رووبەرووبوونەوە لەگەڵ ئیتنیە کولتوریەکاندا جوڵەیەک بدەنە خۆیان. بە زۆری پێگەی هەموو دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەمجۆرەیە: ئاگادارکردنەوەی ئیتنی کولتوریەکان بەتایبەتی لەو کاتەدا کە بۆ پەیڕەوکردن لە دیموکراسی جەخت لە شێوازە رۆژئاوایەکەی دەکەنەوە. لە ئەنجامدا (ئەم ڕووبەڕوبوونەوەیە) دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەسانێك جڵەوەکە بگرنە دەست کە نەك تەنها بەزەییان بە نوێخوازاندا نایەتەوە، بەڵکو ئەو هەڵبژاردنەی کە تیایدا سەرکەوتوون دەبێتە دوایین هەڵبژاردن. لەلایەکی دیکەوە ئایینداران ئاگاداردەکەنەوە کە ئەگەر بەهۆی بوونی بەرەکەتی دەوڵەتەوە نەبێت وڵات نوقمی گوناهو تاوان دەبێت. سروشتیە پشت وێنە و سپەرێکی وەك دەوڵەت، گەر تەنانەت بیشیەوێت ناتوانێت هەنگاوێك بەرەو پێش بهاوێت، چونکە بە تێکچوونی هاوسەنگی لە نێوان ئیتنی کولتوریەکاندا دەوڵەتیش بۆ خۆی دەڕوخێت. ئێدوارد سەعید یان بەتەواوەتی شارەزاو ئاگادارنەبووە یان شەرمی کردووە بە خێڵەکەی بڵێت جیهانی عەرەب ناچارە بە وەستاندن لەو شوێنەی خۆیدا کە جێگیربوونی کۆمەڵایەتی و مانەوەی ئەو هەلومەرجەی ئێستا گەرەنتی دەکات. هۆی ئەو راوەستاندنە نە لە ئیمپریالیزمدایە و نە سەهیونیزمدا، بەڵکو دەبێت هۆیەکان لە نێو خودی ئەو کۆمەڵگایەدا ببینین. گەرچی محەمەد حەسەنەین هەیکەل راشکاوانەتر قسە دەکات، بەڵام هەندێك بابەتیش بە کورتی باسدەکات بۆ ئەوەی گەلەکەی خۆی نەڕەنجێنێت. گەلێکی کاڵ و کرچ کە حەزناکەن کەس پێیان بڵێت خۆتان بەشێکن لە کێشەکانتان. سەیرکە تەنانەت کاتێك سانسۆریش لە ئارادا نییە خۆپارێزیەکان زۆرن. وەك بڵێیت ئیدوارد سەعید پێی باشتر بووە سود لەو رێژەکەمەی ئازادی وەرنەگرێت کە لە نێو



مسوڵماناندا بۆ ڕادەربڕین هەیە. ئەوەی لە میسردا بەسەر نەجیب مەحفوزدا هات بوو بە وانەیەکی پەند لێوەرگرتن. شەرمەکەی ئێدوارد سەعید لەو ڕووەوەیە کە نوسینەکانی ڕوو لە ئینلیز زمانە خۆراواییەکانە. چاکیش نییە مرۆڤ ڕێك دەرگای دڵی خۆی بۆ ئەو کەسانە بکاتەوە کە دەیەوێت هانیان بدات بۆ ڕێزگرتن لە عەرەبەکان. پێش ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە عێراقدا وتارێکی ئیدوارد سەعید لە میدیای ئێراندا وەرگێڕدرایە سەر زمانی فارسی و سەردێڕێکی پێکەنیناوی و گاڵتەجاڕانەی بەمجۆرەی بوو: "دیموکراسیەکەی خۆمانمان بۆ بگەڕێننەوە". سەعید لە پێشەکی چاپی نوێی کتێبی ڕۆژهەڵاتناسیدا دەنوسێت: "بەرەبەرە ون بوونی نەریتی نائاسایی ئیجتیهاد لە ئیسلامدا.. یەکێکە لەخەسارەتە کولتوریەکانی سەردەمەکەمان، لە ئەنجامدا بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەو خۆ ئامادەکردنی تاك بۆ ڕووبەڕووبوونەوە بۆ کێشەکانی جیهانی نوێ لەبیر کراوە".

بەڵگەیەکی وا لە ئارادا نیە کە نەریتی ئیجتیهاد بەرەو نەمان بچێت. تێکەڵ کردنی دو چەمکی "بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە" و "خۆ ئامادەکردن بۆ کێشەکانی جیهانی نوێ" لەو واتایەدایە کە ئیدوارد سەعید بە چاوێکی سوك جیهانی موسوڵمانانی لێکداوەتەوە. لە نێوان دوجار بە چاپگەیاندنی کتێبی ڕۆژهەڵاتناسیدا دەیان ئیجتیهاد لە کولتوری ئیسلامدا تۆمار کراوە و بەلانی کەمەوە پێنج فتوایان کە هەراو هوریای زۆری نایەوە بە دژی بەرەو ڕۆشنبیری (وانە بێژ و نوسەر و قەڵەم و کاغەز) و هەڵگرانی "بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە"بووە.

نەریتی ئیجتیهاد نەکەنارخراوە و نە بەرەبەرە دەسڕێتەوە. ئەگەر لە ڕوانگەی "بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە و خۆئامادەکردن بۆ کێشەکانی جیهانی نوێ" کەموکوڕیەك هەبێت ئەوا لە نەبوون و بۆشایی مۆڕاڵی کۆ دەنگیە لە نێوان ئیتنی کولتوریەکاندا. لە کتێبی ڕۆژهەڵاتناسیدا تەنها و دووجار و بەپەلە، ئەویش لە گێڕانەوەی قسەی خەڵکانی دیکەدا ئاماژەی بە شیعە کردووە و باسێکیشی تیادا نییە لەسەر ئیخوان ئەلموسلمین بێت. ڕاستە لە کاتی چاپکردنی ئەم کتێبەدا زۆر بەکەمی باس لە ئاینزای شیعە دەکرا، بەڵام گەر تەنانەت شیعەگەری پەیوەندیدار بە جیهانی عەرەبییەوە نەزانێت بە دڵنیاییەوە گریمانەیەکی لەو جۆرە دەربارەی ئیخوان ئەلموسلمین ڕاست نییە.

کورتە و پوختەی قسەکانی سەعید ئەوەیە کە تاکی عەرەب "لە کۆمەڵگای ئەمریکادا حاڵ و ڕۆژێکی باشی نییە"، هەرچەند لە هەمان پێشەکیدا دان بەوەدا دەنێت کە شێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵ عەرەبەکاندا لە ئەوروپادا زۆر باش بووە، وێڕای ئەمەش دەگمەنن ئەو کەسانەی لە ئەوروپادا بەرگری لە خەباتکارانی جەزایری بکەن و پشتگیرییان لێی بکەن لە بەرانبەر ئەو بێبەشیانەش کە لە هەڵبژاردندا تیایدا سەرکەوتن و بەسەریاندا سەپا. گۆڕانکاریەکانی دەیەی 1990 بە تایبەت ئاژاوەی تاڵیبان ڕەوتی پرۆسەی پێکەوە سازانی کولتورەکانی خاوکردەوە تەنانەت لە ڕوانگەی ڕوناکبیرانی دیموکرات و چەپەوە ئەگەر ئەو شەڕانگێزانە بچنە ناو دەسەڵاتەوە خێرا تۆمەتی "هەڵفریواندنی گەل" دەدەنە پاڵ هەڵبژاردنی گشتی و ئەو پەیڕەیەی کە خۆیان پێی سەرکەوتوون هەڵدەگەڕێننەوە.

شێوازی ژیانی ئیدوارد سەعید هەم وێنەیەك بوو لە بۆچوونەکانی و هەم وێنەیەکیش نەبوو لە بۆچوونەکانی. دەیگوت لە جیهاندا زیاد لە

کولتورێك، واتە کولتوری سپی پێستی پرۆتستانی کە دروستکەری ئیمپریالیستی رۆژئاوایە بوونی هەیە. بەڵام خۆی رێك حەزی بە ئاراستەی هەمان کولتوردا دەرۆیشت. لایەنگرانی بزوتنەوەی ژنان دەڵێن بابەتی تایبەت بە خودی کەسەکانەوە سیاسین، کەواتە هەڵسوکەوتی ئاشکرای سیاسیە چالاکەکان لە هەرێمی تایبەتی تاکەکەسیدا نامێننەوە. بۆ نمونە لیستی سانسۆر لە ئیسرائیلدا نێوی ئاوازدانەری سەدەی نۆزدەیەم واتە ریچارد ڤاگنێری تێدایە. ڤاگنێر مۆسیقا ژەنی خۆشەویستی ئێدوارد سەعید بووە ئاوازەکانی ڤاگنێر لەلایەن زۆربەی بیسەرانەوە پەسەند دەکرێت، بەڵام دنیایەك جیاوازی هەیە لە نێوان ستایشکاری رۆژئاوایی ڤاگنێردا کە دەڵێن بۆچوونە تاکەکسیەکانی رەنگدانەوەی لەسەر مۆسیقاکەی نییە، بەڵام ستایشکارێکی عەرەب لە رووداو حەزکردنەکەی لە ڤاگنێر بۆ پۆرت شکاندنی جولەکەکانە کە لە گەڕەك و کۆڵاندا جاڕی لێ دەدەن. کاتێك کەسێك داوای شەرکەرێك دەکات کە رووبەروی بێتەوە بڕواتە ژێر پلاجکتۆرەوە و ناوبانگێك بۆ خۆی پێکبێنێت، تەنانەت سەریش دەکەن بە کۆمۆدی جلەکانیشیدا.

چاودێرانی رۆژئاوایی کاتێك باس لەسەر دانیشتوانی رۆژهەڵاتی گۆی زەوی دەکەن بەزۆری کاریان بە جلوبەرگەکانی نەداوە سەردەمانێك لە میدیای رۆژئاوادا بۆ ئاماژە کردن بەرۆحی کرێکاریانەی خرۆشۆف دەیاننوسی جلی هەرزان و ئوتونەکراو لەبەردەکات. لەوانەیە تەنها وەسفکردنی جل و بەرگی ئێرانیەك (شاپوری بەختیار) چووبێتە نێو میدیای رۆژئاواوە، چونکە لەو سەردەمەدا دەگمەن بوون ئەو کەسانەی کە لە نێو سیاسەتدا بوون قات و بۆینباخیان لەبەربکردایە و بە گوێرەی ستانداردی ئەورووپی نمرەی مومتازیان پێبدرایە.

ئێدوارد سەعیدیش لەو کەسانەبوو کە کاریان بە جل و بەرگەکانی بوو نوسەری وتارێك لە حەفتەنامەی "ئیندیپیدینت"دا کە لە ساڵی 1932 لە لەندەن چاپکرا پاش چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئیدوارد سەعید لە ژووری کارەکەیدا لە زانکۆی کۆلۆمبیا و لە ماڵە شیکەکەیدا لە لێواری رووباری هادسن لە نێویورکدا ئاماژە دەدات بە قاتی کەشخە و پاڵتۆی هەورێشمین و کلاوەکەی سەعید و دەڵێت: "ئاڵو والأبوونی شانۆیەکی لەمجۆرە کە لە زەینماندایە لەگەڵ وێناکردنی تێکۆشەرێکی فەلەستینی و زانکۆییەکی سۆسیالیستدا یەکناگرێتەوە. ئێدوارد سەعید پیانۆ چاك دەژەنێت، چێژ لە ئاوازەکانی ڤاگنێر وەردەگرێت و چەندەها زمان دەزانێت و ئەو جلانەی کە دورینەکانیان زۆر جوانە دەپۆشێت، جارێکیان بە خوێندکارانی زانکۆی گوتبوو دەساڵێك دەبێت سواری میترۆ نەبووم". بەسەرهاتەکە بەو جۆرە کۆتایی پێدێت کە گەرچی ئێدوارد سەعید بەڵێنی دابوو کە لەگەڵ گێڕەرەوەدا سواری میترۆ ببێت، بەڵام لە دواین ساتدا تاکسی دەگرێت و دەڵێت دەبێت زۆر خێرا خۆی بگەیەنێتە ئۆپێرا، چونکە لەوێ ژنەکەی چاوەڕوانیەتی و "هەرچۆنێك بێت تاقەتی میترۆم نییە".

دیتنی لەم جۆرەی ژورنالیستیانە و سوکایەتیپێکردنێکی لەم چەشنە وەك قسە رۆژنامەوانیەکان کاریگەریەتیەکی ئەوتۆی لەسەر ئەسڵی بابەتەکە نابێت. کاتێك بابەتی تایبەت بە تاکە کەسەکانیش سیاسی بن و کەسێك رابگەیەنێت کە هەر کەسە و دەتوانێت بۆ خۆی کولتوری خۆی هەڵبژێرێت دەبێت ئامادەی زەربەگەلێك بێت کە

بەرانبەرەکانی لەم لایەنەوە لێی دەدەن ئەو کەسەی خۆی لە کولتوری رۆژئاوا زیت دەکاتەوە و لە هەمان کاتدا جل و بەرگەکانی دەباتە لای چاکترین بەرگدروی نیویورك، سوورە لەسەر ئەوەی هەموان بزانن شەیدای ڤاگنێرە، ئەوە خۆی خستۆتە بەر دادوەریەکی گەلێك بێبەزەییانە.

لاسایکردنەوە بە بەرزترین پلەی پەسەندکردن دەزانن، بەڵام کاتێك کەسێکی نیمچە رۆژئاوایی لە لاسایکردنەوەی کولتوری رۆژئاوادا زێدەڕۆیی بکات و لە هەمان کاتدا رەخنەگرێکی کەلەرەقی هەمان کولتور بێت، بەمجۆرە دادوەری لەسەر دەکەن کە لەبەرزەخدا ماوەتەوە، بەرزەخی نێوان تامەزرۆ بوون بۆ وەرگرتن و قوبڵکردنی و ترسی لە دەرەوە مانەوەدا بەرزەخی نەفس بەرزی و سواڵکردن و لە ئەنجامدا وێنایەکی بەمجۆرە لە زەینی چاودێراندا پێکدێنێت: دژایەتیتان دەکەم، بەڵام چونکە یەکێك لە ئێوەم و هاوشێوەی چاکترینتانم کەواتە منیش بە خۆتان بزانن و بە هەندم وەربگرن. هاوبیرانی رێنان و گوبینۆ بەلێو هەڵقرچانەوە دەڵێن: ئەمەش یەکێکە لە نیمچە خۆراوایی کە ئەم حەزەی لە دڵدایە و دروستکراوێکی دەستکردی دیکەیە.

بەناوی خۆرهەڵاتناسیەوە بەرەسمی کۆلێژێك نییە، بەڵام ئێدوارد سەعید لە پێگەیەکی لەم چەشنەدا بەرگریی لە گەلێك دەکرد کە لە نێویاندا هاتبوو دونیا و بە تەنهایی بوونی مایەی شانازی بوو بۆ جیهانی عەرەب. کتێبی رۆژهەڵاتناسی لە ئاست خۆیدا سەرترە لەو دەقانەی کە لە ئێراندا نوسراون و دەتوانین بڵێین شایانی بەراورد کردن نیین لەگەڵ یەکدیکەدا وێڕای ئەمانەش نوسینەکانی چەندە کاریگەریەتیان لەسەر زانکۆیەکان و دەوروبەریان و ئاستی سەرەوەی رۆژئاوادا هەبووبێت و چەندە بۆ راستکردنەوەی روانگەی رۆژئاوا بەرانبەر بە عەرەبەکان کاریگەریەتی هەبوو بێت لە کارەساتی "یازدەی سیپتەمبەردا هەموو رستنەکەی تارادەیەکی زۆر بوەوە بە خوری لە واتایەکدا ئەو بە هیوا بڕاوی ئەم جیهانەی بەجێهێشت. هەر چەند تارادەیەك بەرەی قەڵەم دەتوانن هەندێك لە بیرکردنەوەکانی خەڵك بگۆڕن، بەڵام ناتوانن لەناکاو هەموو جیهان لە بنەوە بگۆڕن، چونکە خۆیان بەشێکن لە راستیەکان.

## سەرچاوە

رۆژنامەی شەرق، ژمارە 44 ی 1382.

# لەگەڵ ئێدوارد سەعید دا

**سەماح ئیدریس**

**لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد**



لەبەردەم نووسینگەکەیدا زۆرم چاوەڕێ کرد، هەرچەندە پێشتر وادەی دیمانەکەم لە ژنە سکرتێرەکەی وەرگرتبوو، جارێکی تریش لە دەرگام دایەوە، دوای تۆزێك شەبەنگێکم بینی لە پشتی دووربینی سەر دەرگاکەوە تێپەڕی، بۆ چەند چرکەیەك شەبەنگەکە ونبوو، دیسان لە دەرگام دایەوە، دووبارە شەبەنگەکە هاتەوە، ئای لەم پیشە بەدە! تۆ بڵێی دەرگاکە بکاتەوە؟ ئەی بۆ وادەی پێداوم؟ ویستم بڕۆم "کابرایەکی ئاڵۆز، لووت بەرز" ئەمەم لە دڵی خۆمداوت *Who is this?* لە پشت دەرگاکەوە گوێم لە دەنگی بوو، "سەماح ئیدریسم، وادەم لەگەڵتا هەیە" بە ئینگلیزیەکی گیرەوە ئەوەم پێوت.

ئەمە لە کۆتایی ساڵی 1985 یان سەرەتای ساڵی 1986دا ڕوویدا، ئەوکاتە تەمەنم بیست و پێنج ساڵ بوو، ئێدوارد سەعید دەرگای کردەوە، داوای چوونە ژوورەوەی لێکردم، کە چوومە ژووریٚ داوای لێبوردنم کرد کە بووم بە هۆی بێزارکردنی، بەڵام لە ناوەوەی خۆمدا پێم خۆشبوو ئەو پۆزشم بۆ بهێنێتەوە، چونکە لە پێشوازی کردندا دواکەوت. بە ئینگلیزی کەوتە قسە، پاشان دیوانێکی بە زمانی عەرەبی بە دەستمەوە بینی (بڵێی یەکێك لە



دیوانەکانی مەحمود دەرویش بوو بێت؟) دەستی بە زەنگەکەدا نا، بە زمانی عەرەبی کەوتە گفتوگۆ "ئا.. کوڕی سوهەیل ئیدریسیت؟ ئایا ڕۆمانێك بەناوی "مانهاتن"ەوە دەنووسێت کە لە ڕۆمانەکەی باوکت "گەڕەکی لاتینی" بچێت؟ رووم کرایەوە، دیارە شتێکم لە بارەوە دەزانێت، کەواتە، هاوڕێکانت؟ هاوڕێکانی بێروتت کێن؟ ئەلیاس خوری هاوڕێتە؟ دەیناسیت؟ کێی تریش؟ گوێ بگرە سەمیح، سەماح، وتم، هەردوو کچەکەی شەفیق ئەلحوت لە نیویورکن، هیچ لە نیویورك نازانن. تۆ شەفیق ئەلحوت دەناسیت؟ ئەگەرچی، جاکێ نایناسێت، ئەو باوکی هەمووماانە، کەواتە گوێ بگرە سەمیح یان سامح یان سەماح، ئەوان ئێستا لەوێ لە ماڵی زوهدی تەرزین، نوێنەرەکەمان، نوێنەری ڕێکخراوی ئازادیی، لە ئەمریکا، بچۆ بۆ لایان، بیانبە، کچی شەفیقن، شەفیق دەناسیت؟ دەیناسم، باوکم دەیناسێت، خەمت نەبێت، شەفیق ئینسانی چاکە، وانییە؟

باسمان لە سیاسەت کرد، ویستی خێرا ڕام بەرانبەر بە ئەبو عەمار بزانێت، پێم وت من خۆشم ناوێت، ئەوییش شتێکی خراپی پێ وت کە ئێستا بە چاکی لە بیرم نەماوە، پاشان کەوتەوە قسە کردن: "بەلاّم ئەبوعەمار ڕەمزی گەلی فەلەستینە" بێدەنگبووم، چونکە نەمدەویست لەم یەکەم دیمانەیدا بەرخوردی لەگەڵدا بکەم، "وا دیارە تۆ لە ڕەتکەرەوەکانیت" زۆری لەسەر ڕۆشت، وتم گەلی فەلەستینی شیاوی ڕەمزێکی لە ئەبوعەمار چاکترە.

لەو کاتەوە ئێدوارد سەعید بوو بە هاوڕێم. بوو بە مامۆستام، لە ژیانمدا ئەوەندەی لەگەڵ ئەودا جیاوازیم هەبوەو دەممان تێکگیراوە لەگەڵ کەسی تردا وانەبووم (بێجگە لە ژنەکەم) هەردوو ساڵی نەدەبرد کە جیاوازیەکی زۆر گەورە دەکەوتە نێوانمانەوە، ئیتر تا دوو ساڵی تر یەکترمان نەدەبینی، خۆشیەکەی لەوەدا بوو کە هەمیشە ئەو دەست پێشکەریی ئاشت بوونەوەی دەکرد، کاتێك لە ڕێگا ئەیدیم یان لەناو زانکۆی کۆلۆمبیادا، (لە یادم چوو بڵێم من لە ساڵی 1985-1986 دا قوتابی دوکتورا بووم لە هەمان زانکۆدا) پێی دەوتم" ها سەماح ئەفەندی؟ ڕقت لێم هەستاوە؟" ئەمانەی بە شۆخی و فیزەوە دەوت، یادی بەخێر، منیش هەروەك ئەوم دەکرد: "ئای! مامۆستایەکی گەورەی وەك تۆ کەس بۆی نیە لێی زویر بێت"

کەمێك پێش یەکەم ڕاپەڕین (9ی کانوونی یەکەمی 1987) دوای ئەوەی بووم بە یەکێك لە "ئەفسەرەکانی پەیوەندی" نێوان یانەی عەرەبی لە زانکۆی کۆلۆمبیا و پرۆفیسور ئێدوارد سەعید، بۆ ئەوەی لەو بڕیار و چالاکیانەدا کە بۆ پاڵپشتی ڕاپەڕین دەکرا هەمیشە هاوئاهەنگی بکەین، چوار لە ئێمە هەر یەکە و بە تەنیا ئێدواردمان دەبینی، هەندێك جارییش لە یەکێك زیاترمان دەڕۆیشت بۆ لای: عومەر بەرغوسی، ناصر بەرغوسی. ئەحمەد دەلال و من، لە دوو ساڵی کۆتایی خوێندنی ئەوێمدا، (1990 و 1991) زیاتر کارەکە کەوتە ئەستۆی من دوای ئەوەی دەلال و هەردوو بەرغوسیەکە خوێندنیان تەواو کرد. بۆیە لە هەندێك لایەنی کەسایەتی ئێدوارد سەعید بە جۆرێك ئاشنابووم کە کەم کەس لە سەری نووسیوە. ئەویش پەیوەندی ئێدوارد سەعید بوو بە هەڵسوڕاوە (ناشط) سیاسیەکانەوە (من یەکێك بووم لەوان و هیواداریشم هەروا بمێنمەوە)

ئێدوارد سەعید حەزی بەوەبوو لەو هەڵسوڕاوانەوە نزیك بێت. بڕوایشم وایە کە خۆشی دەویستن، بەڵکوو دەتوانم لەمە زیاتر پڕکێشی بکەم و بڵێم: ئێدوارد بە چاوی پەرستنەوە و، دوور لە بابەتیانە، تەماشای قوتابیە هەڵسوڕاوەکانی دەکرد (هەروەها نووسەری هەڵسوڕاویش) ئەو قوتابیەی

که چەکی هەڵگرتبوو بۆ بەرگری کردن لە گەلی فەلەستین. من جەنگاوەرنەبووم، بەلاّم زۆر لە نزیکەوە ئاگاداری هەندێك لەو جەنگاوارانە بووم، پێش ئەوەی لە ساڵی 1985دا سەفەر بکەم بۆ نیویورك و، لەو دیدەنیانەیشدا کە لەو ساڵەو ساڵی 1990 بەردەوام بۆ بیرۆتم دەکرد. ئێدوارد سەعید پێی خۆشبوو هەموو مەسەلەکانی ناوخۆ بزانێت: مێژووی ئەمە، مێژووی ئەوە، ئەم لەگەڵ کێدا بەشەڕ هات؟ راستە لە کاتی شەڕدا فلاّن کەس بەرکەوت، یان دەست هەڵبەست بوو، راستە فلاّن "موخابەراتە"؟ هەندێك جار کە زانیاریەکانی من لەگەڵ ئەوانەی ئەودا وەك یەك نەهاتنایەتەوە زویر دەبوو، پێم دەوت ئێدوارد تۆ لێم دەپرسی و وا منیش وەلاّمت دەدەمەوە، بە توندی دەیوت لە کەمال دەپرسم (کەمال ئەبودیب) دەموت چ پەیوەندی بە کەمالەوە هەیە؟ وەلێ ئەو دەیویست وشەی فەلەستین هەمیشە لە نیویۆرك دەنگ بداتەوە، بە تایبەتی لە زانکۆی کۆلۆمبیادا.

بەهاوکاری ئێدوارد و راوێژ پێکردنی، لە یانەی عەرەبی چەند کۆنگرەیەکمان سازدا لە هەموویان گرنگتر کۆنگرەی "شوناسی نیشتمانی فەلەستینی" بوو، کۆنگرەکە هەفتەیەکی تەواوی بۆ فەلەستین تەرخان کرد، ئێدوارد سەعید زانیاری و وتار و ناونیشانی ئەوانەی دەداینێ کە بانگمان دەکردن. ئەو فەلەستینی و ئێمەیش نەوەی بووین. هەندێك جار ڕقمان لێی هەڵدەستا، بەردەوام دەگەڕاینەوە لای، ئەو ڕەمزی سەرکەوتنمان بوو، بوونی لەگەڵماندا دەستەبەری سەرکەوتنمان بوو.

جارێکیان لەگەڵ ڕەشید خالدیی و خوا لێ خۆشبوو ئیبراهیم ئەبوغەد قسەی دەکرد، وابزانم لە کۆڕێکدا بوو کە ئێمە ڕێکمان خستبوو، قسەکان زایونزمەکانی تەنگەتاوکرد. ژنێك کە نوێنەری لیکود بوو کەوتە قاووقیژ و وتی: "ئەمە عەدالەت نییە، ئەمە عەدالەت نییە، هاوسەنگی لەم کۆڕەدا نییە. کوا جوولەکە؟ کوان ئیسرائیلییەکان؟" لێرەدا ئێدوارد سەعید ڕاپەڕی ووتی: "بۆ نابێت فەلەستینیەکان بە دەنگی خۆیان قسە بکەن؟ بۆ دەبێت هەمیشە جوولەکە بێنین بۆ ئەوەی هاوسەنگ بین؟ بۆ بێ ئابڕوییە فەلەستینیەکان باس لە فەلەستین بکەن؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە فەلەستینی لەسەر فەلەستین قسە بکات نەك دوژمنەکانی؟" نوێنەرەکەی لیکود دەستی بە گریان کرد، بەڵێ، گریا، چەپڵەمان بۆ ئێدوارد سەعید لێدا، سەری زایونیزمەکانمان شکاند (ئەوانیش لە فەلەستین ئێسکی ئێمە دەشکێنن) لە هۆڵەکە هاتینە دەرەوە، هەوای بەفر بوو، ملمان بە جامانەی فەلەستینی پێچابوو، هەستمان بە شانازی دەکرد، فەلەستین سەرکەوت، ئێدوارد خودا گەورەیە، قۆڵ بە قۆڵی یەکدا دەکەین، ناسر، ئەحمەد، عومەر... گۆرانیەکانی مارسیل خەلیفە و گۆرانی ڕاپەڕین دەڵێین، ئێمە لە ناو دڵی پایتەختی لوبی زایونیزمدا دەژین، ئاوو هەوایەکی بەفراوی، وەلێ گرنگ نییە، ئێدوارد سەعید و (ڕەشید و ئیبراهیم) پشکۆی ڕاپەڕینیان لە دڵماندا هەڵگیرساند.

* * *

ڕۆژێك کە لەو پەڕی چالاکیماندا بووین، ڕێکخراوی بەرگری لە زایونیزم هەڕەشەی لە ئێدوارد سەعید کرد. پێشتر توندڕەوە زایونەکان نووسینگەکەیان سوتاندبوو، لە ڕەمزەکەمان ترساین، من و دەلال و ئەحمەد پێشنیازمان بۆ کرد کە شەووڕۆژ لەگەڵیدا بین، لە ڕۆژانی داهاتوودا لە نووسینگەکەیەوە تاماڵەوە پارێزگاری لێ بکەین. ئێدوارد پێکەنی، پێی وتم: "نا کوڕینە، گرنگە نەترسین، ئەوان دەیانەوێت بترسین، ئێمەیش لە سەرمانە ژیان بە ئاسایی بەسەربەرین"



ئێدوارد، خۆشترین کاتی ژیانم ئەو چەند سەعاتەبوو کەدوانیوەڕوان دەهاتمە نووسینگەکەت و پێشتر ئاگادارم کردبوویت. پاشان دەڕۆیشتین بۆ ماڵەکەت. پرسیارت زۆر و قسەت کەمتر، قسەت نەدەکرد تا دەموروژاندیت، وروژاندنت ئاسانبوو: لەم هاوسەنگیەی ئێستای هێزەکاندا ئاشتی قسەی پرووپووچە، دەڵێم، ئێدوارد تۆ سازش کاریت، ئەی تۆ ئارادەیەك لەوە بەرپرسیارنیت کە عەرەفات پێی گەیشتووە؟ دانوستان؟ چ قەشمەریەکە! دانوستان لەسەر چی بکەین؟

ئێدوارد سەعید زۆر بە من سەرسام نەبوو، ڕەنگە ئێوە وای بۆ بچن، دواجار پێش دوا کۆچی بەچەند مانگێك کە لە بیروت بۆ ماڵەوە هاتە لام، دیدەنیەکەی جوامێرانە بوو، من تووشی نەخۆشیەکی پشت بووبم، ئاسایی کەوتینەوە چەند و چۆن، پێم وت: پرۆژە موزیکیە هاوبەشەکەی لەگەڵ دانیال بارنباوی موسیکازانی ئیسرائیلیدا، سازشێکە ئاولێڵ ناکات، بە توندی وەڵامی دامەوە: نا، ئەمە موسیکایە و سیاسەت نیە. تۆ کەی باسی جیاوازیی نێوان روناکبیر و سیاسەتت کردوە، ئەی خاوەنی کتێبی "روناکبیری ئیمپریالیەت"؟ من بە توندی ئەمەم پێ وت. وتی: تۆ بێجگە لە کوشتن چارەسەری ترت پێ نیە. ئەمە موسیکایە. وتم: "کۆکردنەوەی گەنجانی سوریا و میسر و لوبنان لەگەڵ ئیسرائیلیەکاندا بۆ ئەوەی لە ئەڵمانیا ئاهەنگی موسیکا ساز بکەن.. ئەمە تەنیا موسیکایە؟ وەڵامی دامەوە: "لەگەڵ تۆدا شکستم هێنا، تۆ ئەو قوتابیەی بەسەرمدا سەرکەوتیت" وتم "من سەرنەکەوتوم ئێدوارد، تۆ گەیشتیتە لوتکە، ئێمە لە کوێو تۆ لە کوێ" بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: "نا من بەرانبەر بە تۆ شکستم خوارد" بەڵام من بڕوای تەواوم بەوە هەیە کە ئێدوارد گوێی لێ دەگرتم، زۆر بە چاکی گوێی لە هەموو ئەوانەدەگرت کە چەند و چۆنیان لەگەڵیا دەکرد.

* * *

لێ پەیوەندی من لەگەڵ ئێدوارد سەعیدی ئازیزمدا تەنیا لەبەر ئەوە نەبوو کە من هەڵسوڕاوێکی سیاسیم لە کۆلۆمبیا، بێجگە لەوە، لە هەندێك قۆناغی جیاجیادا، قوتابیەکی گوێگری هەندێك کۆرسی بووم. هەمیشە کۆرسەکانی پڕ لە قوتابی بوون، ئاسایی کەمێك لە هاتن دوا دەکەوت، قوتابیەکان لەسەر کورسیەکانیان، یان لەسەر زەوی، یان لە نزیك پەنجەرەکانەوە، لەسەرەتای کۆرسەکاندا هەندێك قوتابی ئارادەیەك لەژێر مێزەکەیدا دادەنیشتن، بە فیزە خۆشەویست و (پێکەنین هێنەرەکەیەوە) وتی: *Guys, L need my space* (لاوەکان، پێویستم بە بوارێك بۆ خۆم هەیە) هەردوو باسکی تابڕ بکەن درێژ کرد تا بوارە تایبەتیەکەی بۆ بڕەخسێ و کەس لێی نزیك نەکەوێتەوە، قوتابیەکان پاشەکشەیان کرد، هەموو بەیەکترەوە نووسان بۆ ئەوەی مامۆستا زاناکەیان بە ئازادی و چۆنی دەوێت بجووڵێت. سەد قوتابی لە پۆلێکدا، سەعید قسە لەسەر فۆکۆ و گرامشی و فیکو دەکات. هۆڵەکە وەك نوێژ بۆ خودانی قسە بکەن هەموو بێدەنگن. ئێدوارد لەسەر قسەکانی دەڕوات، وشەکانی شەپۆلانێکن ئێمە لە دەریاکەیدایین، هەموو نوقم دەبین و لەناو دەچین.. بێجگە لە کەشتیەوانەکە، لە پڕێکدا خودان پاڵتاوە سەوز و درێژەکەی هەڵدەگرێت، تەماشای سەعاتەکەی دەکات "دەبێت من بڕۆم" قوتابیەکان دەڕژێنە سەر مێزەکەی "دەبێت بڕۆم، داوای لێبوردن دەکەم، سەماح هیوادارم بت بینمەوە". ئەمانە بە عەرەبی دەڵێت. هەست بە شانازی دەکەم، زمانی عەرەبی نهێنی ئێمەیە، قوتابیەکان تەماشام دەکەن و لێم دەپرسن "فەلەستینیە؟"

زەردەخەنەیەکی شانازیم دێتێ، من و ئێدوارد دەڕۆین، لە ڕێگادا بە دەیان کەس سلاوی لێ دەکەن، چاکترین کات بۆ ئەوەی بەڵێنێك لە ئێدوارد وەربگریت بۆ وتاربێژییەك و شتێکی تری ئەو بابەتە دەزانن چ کاتێکە؟ ئەو کاتەی لەگەڵیدا بەرەو ماڵەکەی شەقامەکە دەبڕیت.

جارێکیان داوام لێکرد گوێ لە وتاربێژیەکی بگرم کە دەربارەی "تاراوگە و روناکبیری"یە، وتی: ئەو وتارەبێژیەم تەنیا تایبەتە بەوانەی لە بازنەی ئینگلیزیدان، تۆ لەوان نیت. وتم، قەیدی چییە، بۆ دۆزەکەم کە لە بارەی "روناکبیری عەرەب و دەسەلات"ە کەڵکی لێ دەبینم، زۆر بە ناچاری پرۆفیسور قایل بوو. سێ دانیشتن ئامادە بووم. پرۆفیسور ڕادەوەستێت و کتێبێك بە دەستەوە دەگرێت (ناشێ کتێبی باوکان و مندالان بوو بێت؟" چاویلکەی زیاتر چاك دەکات، دەخوێنێتەوە و بە دەست ئاماژە دەکات، ئێمە فریای نووسین ناکەوین و دەستمان ئارەقە دەکات، سەرمان پڕ دەبێت لە ئەفسوون. واز لەو سەرنجانە دێنین کە تۆمارمان کردووە، مەحاڵە لەسەر ئێدوارد سەرنج تۆمار بکرێت. دەڵێین: دەمانەوێت پرسیار بکەین، هیچ نەبێت بەزەییەك بەدەست و سەرماندا، لێ ئێمە چاو دەنووقێنین وواز لەتاڤگەکە دێنین بەسەرماندا هەڵڕژێ.

لە دانیشتنی چوارەمدا لەوێ نەبووم، سەرقاڵی ئامادەکردنی کۆنگرەیەك یان خۆپیشاندانێك بووم بۆ پاڵپشتکردنی ڕاپەڕین، بۆ دانیشتنی پێنجەم ئامادە بوومەوە، لە دەرەوەی پۆل چاوەڕێم کرد، پێی وتم: "من وام بەلاوە باشە کە لە پۆلەکەدا ئامادە نەبیت" من پاکانەی ئەوەم کرد کە بۆچی جاری پێشوو ئامادەنەبووم، ئەو وتی: "من لەبەرئەوەم نییە، لەبەر ئەوەمە چ پاساوێك بۆ بوونی تۆ لەگەڵ ئێمەدا بهێنمەوە لە کاتێکدا تۆ لە دەرەوەی بازنە ئینگلیزیەکەیت؟" وتم بەلام پێشتر ئەو چاوی لەوە پۆشیوە و قایل بووە، لێ هەر لەبەرخاتری ئەو ناچمە پۆلەوە. بە جنێودان چوومەدەرێ و وام دەزانی لە بەهەشت دەرکراوم، زۆرم ڕق لێ هەستابوو: ئەو مامۆستا ناودارەی کە پێویستیی بە هیچ پاکانەیەك نیە بۆ کەسی بهێنێتەوە، بۆ دەبێت ڕژدی بۆ سەعاتێك لە زانستەکەی لە هەفتەیەکدا بەرێت بەرانبەر بە قوتابیەکی عەرەب کە دەمێکە دەیناسێت؟ دوو ساڵ دەنگم لەگەڵیادابڕی. تا ڕۆژێك لە برودوای بینیمی و وتی: "سەماحە فەندی؟ بۆ خۆت لێ تۆراندوم؟" منیش دیسان پێم وتەوە: "خودایە! جا کێ دەتوانێت خۆی لە ئێدوارد سەعید بتۆرێنێت؟"

★ ★ ★

بەراستییش وایە، هەرگیز ناتوانیت خۆت لە ئێدوارد سەعید دابڕیت، لێی زویر دەبین. جوێنی پێ دەدەین. پێی دەڵێین. ئەم پیاوە چەندە لووت بەرزە. پاشان گوێ لە ڕەخنەکانی دەگرین کە لە ئۆسلۆ و دەسەلاتی فەلەستینی و ئەوانەی ئەو تەونەیان دەڕێسا دەگرێت و، دەڵێین ئای کە مرۆڤێکی مەزنە! پاشان دیسانەوە یادی رابوردوو دەکەینەوە و دەڵێین: "ئەی هەر ئێدوارد نەبوو ڕێگای بۆ سازش خۆشکرد"؟ تۆ بڵێی کێشەکە لەوەدا بێت کە دان و ستانکەرە فەلەستینیەکان شیاو نەبن، یان لەوەدا بێت کە لەم قۆناغی نا هاوسەنگی دوولایەنەدا چارەسەرکردنی راستەقینە شتێکی مەحاڵ بێ؟ وەلێ دیسانەوە دەست بە خوێندنەوەی ئێدوارد دەکەین یان گوێی لێ دەگرین. شەپۆلەکان بەرز دەبنەوەو دامان دەپۆشن، دیسانەوە دەڵێین گەورەترین تاوان ئەوەیە کە ئێدوارد سەعید لە سیاسەت دوور بخەینەوە، وانەکانی لەسەر خۆرهەلاتناسی لە یاد بکەین، یان پەیوەندیی گوتاری روناکبیریی بە کۆلۆنیالیزمەوە،



یان پێویست بوونی رۆشنبیری ئۆرگانی، هەروەها دەربارەی ئەوەی کە لەسەر روناکبیر پێویستە تەنانەت لەوپەڕی ئیلتیزامی سیاسیدا لە دەرەوەی جێگادا بێت. ئێمە بە وشەو بیر و ئاوازە ئەفسوناویەکانی ئێدوارد دەگەشێینەوە، دەڵێین ئەو بیروباوەڕە لە لووتکەدا، نەنیشتمان و نەبواری لێکۆڵینەوە ناتوانن سنووورداری بکەن، کەچی لە پڕێکدا ئێدوارد دەتگێڕێتەوە بۆ فەلەستین، دەڵێین "بیرۆکەی فەلەستین" و هیچی دی، تاقە شتێکە کە لە شەپۆلی وشە و بیر و ئاوازیدا دەدرەوشێتەوە، هەر ئەویشە دەبێتە ئەو سروشتی دادپەروەریەی کە بە درێژایی ژیانی بۆی نووسی.

تەرمەکەی تا بەرماڵەکەم بەڕێ دەکەم، ئەرێ لە تشریندا دەتبینمەوە؟ وەك باوکم لە ئامێزم دەگرێت، کەمێك لە باوەشیا مت دەبم، وەك منداڵێکی بچووك لە نێوانیاندا دەمرم.

## سەرچاوە

رۆژنامەی "النهار" پاشکۆی روناکبیری، تشرینی یەکەمی 2003.

# سەزەنشتکردنی خۆرئاوا :
## "ئێدوارد سەعید و عەلی شەریعەتی"

ئەمیر تاهری

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد



توێژەری ئەمریکی "ئێدوارد سەعید" کە هەفتەی ڕابردوو کۆچی دوایکرد[1]، زۆر جار بەو کەسە دادەنرێت تیۆریای (سەرزەنشتکردنی خۆرئاوای) هێناوەتە ئارا.. "سەعید" لە کتێبی (خۆرهەڵاتناسی)دا، کە بڵاوکراوەیەکی ناڕەزایی ئامێزو ڕوخساری لێکۆڵینەوەی مێژوویی پۆشیوە، هەوڵیداوە ئەو لێکۆڵینەوانەی توێژەرە خۆرئاواییەکان دەربارەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کردویانە وەهانیشانبدات کە (پلانێکی کۆلۆنیالیانە) بووە. وتەزایەکی سەرەکیش ئەم کتێبە پشتی پێبەستبێت لەوپەڕی سادەیدایە و بەمجۆرەیە: خۆرئاوا دڕندەیەکی ئیمپریالیە و بەو مەبەستەش لە جوگرافیای خۆی چۆتە دەر، تا دەستبەسەر جیهاندا بگرێت و کەرەستە و سەرچاوەکانی بە تاڵان ببات، هەروەها نەتەوەکانی تر نابوت بکات و جیهان لە شەڕێکی نەبڕاوە بگلێنێت.

دەرەنجامی کۆتایش کە پێیدەگات، لە تێزەی سەرەکی کتێبەکەی سادەتر و دەڵێت: (تەنها پەیوەندیەك لە نێوان خۆرئاواو سەرجەم وڵاتانی دیکەی جیهاندا شیاو بێت، ئەو ناکۆکی و ململانێیانەیە کە هەرگیز دوایی نایەت و



نابڕێتەوە). بیست ساڵێك بەر لەم بەرهەمەی "ئێدوارد سەعید"، لە ڕێی بڵاوکردنەوەی چەند کتێبێکەوە زانای ئایینی ئێرانی "عەلی شەریعەتی"، خوێندنەوەیەکی هاوشێوەی بۆ مێژوو کردبوو. هەندێك لەو کتێبانەی لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا بە زنجیرە لە ڕۆژنامەی (کەیهان)دا بڵاو کردبووەوە.

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە هەریەك لە "ئێدوارد سەعید" و " عەلی شەریعەتی"، پشتیان بە چەند گریمانەیەك بەستووە:

**گریمانەی یەکەم/** هەردووکیان وەها سەیری خۆرئاوا دەکەن کە ماشێنێکی زەبەلاحە و بەپێی پێودانگە مەکیاڤیلیەکان –هێز و قازانج– دەجوڵێت. "شەریعەتی" چەند ساڵێك لە پاریس مایەوە، بەڵام "سەعید" لانی کەم تەواوی تەمەنی خۆی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەسەر برد. هەردوونوسەر نەیانتوانی یاخود نەیانویست ئەو جیاوازیە زۆرانە ببینن کە لە جیهانبینی سیاسی و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی و بۆچونی ڕۆشنبیری و ململانێی چینایەتی، لەناو تێکڕای کۆمەڵگە دیموکراسیەکانی خۆرئاوادا هەیە.

**گریمانەی دووەم/** هەردووکیان لە گۆشەنیگایەکی ئەخلاقی ڕوتەوە سەیری پەیوەندییەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوایان کردووە و لە پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکاندا، چاوپۆشیان لە لایەنە (سارد و سڕەکانی) وەك بواری سیاسی و سەربازی و ئابووری کردووە. هیچ یەك لە "سەعید" و "شەریعەتی" پرسیاریان لەو هۆکارانە نەکردووە وای لە "ناپلیۆن" کرد، بە ئاسانی بتوانێت بە ژمارەیەك سەربازی کەمەوە پەلاماری میسر بدات. هاوکات بە خەیاڵی هیچ یەکێکیاندا نەهاتووە، بیر لەو هۆکارانە بکەنەوە کە وایکرد بەریتانیەکان بە چەند هەزار کەسێك لە ئەفسەر و بیرۆکراسیەکانی ئەوروپا، دەست بەسەر هندستاندا بگرن[2]. هەروەها نەیانپرسی بۆچی موسڵمانان سەرکەوتوو نەبوون لەوەدا پەرە بە ئەقڵانیەت بدەن، ئەقلانیەتێك کە بەبێ ئەو ئەڕینیسانسێکی پیشەسازی نوێ سەرهەڵدەدا و نەدەتوانرێت هێزێکی سەربازی مۆدێرن دروست بکرێت، لە کاتێکدا باس لەوە دەکرێت موسوڵمانان بەر لە ئەوروپییەکان پەییان بە بەحیکمەت و فەلسەفەی گریکەکان بردووە.

**گریمانەی سێیەم/** هەر یەك لە "ئێدوارد سەعید" و "عەلی شەریعەتی" پێیان وابوو هەرچی شتێك لە خۆرئاواوە بێت شەڕو بەڵایە.. واتە کاریگەریە ئیجابیەکانی ئەو بیروبۆچونانەیان فەرامۆشکرد کە میللەتەکانی دیکە لە خۆرئاوایان خواست و توانیان کۆمەڵێك چاکسازی پێبکەن کە دەمێك بوو وەختی ئەنجامدانی هاتبوو. ئەگەر "سەعید" و "شەریعەتی" ئێستێکیان بکردایە و کەمەکێك بە وردی سەرنجیان لە چواردەوری خۆیان بدایە، دەیانتوانی سەرجەم ئەو ڕێنیسانسە کلتوری و ئەدەبیە ببینن کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا ئەمڕۆ لە جیهانی ئیسلامیدا ڕوویانداوە و لانی کەم هەمووی دەرەنجامی ڕاستەوخۆی خۆرئاوا خوازییە.

**گریمانەی کۆتایی/** هەردووکیان دەیانویست (خەڵکانی دیکەی جیهان) کە بەلای ئەوانەوە مەبەست لێی جیهانی ئیسلامی بوو، بە هەموو شێوازێك و بەهەر نرخێك بووە بەرخوردی پرۆسەی



خۆرئاواخوازی بکەن و ڕووبەڕوی ببنەوە. سەبارەت بە "عەلی شەریعەتی"، خۆرئاواخوازی وەکی دوچاربوون بە نەخۆشی (سفلس) وەهابوو. هەرچی "ئێدوارد سەعید"یشە وەکی (خزمەتکاری ماڵان) کە چۆن لەسەر پاشماوەی خوانەڕازاوەکانی خۆرئاوا دەژین، ئاوا سەیری ئەو موسڵمانانەی دەکرد کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری خۆرئاواوە.

"شەریعەتی" سوربوو لەسەر ئەوەی دەبێت جارێکی تر ببینەوە بە خۆمان، بەڵام ئەویش وەکی "سەعید" بەوردی ڕونی نەکردەوە مەبەست لە وشەی (خۆمان) چییە؟ ئایا مەبەست لێی ئەو کۆمەڵگە دواکەوتوانەیە تیایدا ستەمکاران بە یارمەتی دەستەبژێرێك لەگەندەڵەکان، جوتیارە نەخوێندەوار و ترساوەکان دەچەوسێننەوە؟ یاخود ئەو ژیانە دەگەیەنێت کە مەحکومە بە هەژاری و نەخۆشی و نەبوونی ئارامی و دڵنیایی؟ یان بریتییە لەو کلتورەی خاوەنی شیعرێکی سادەگۆ و پەخشانێکی مردوو پڕ لە وشەسازییە؟

بەڵام "سەعید" و "شەریعەتی" خاوەنی بڕێکی باش لە ژیری و دانایی بوون، چونکە هیچیان جارێکی تر نەبوونەوە بە خۆیان، بە چاوپۆشی لەوەی وشەی (خۆمان) چی دەگەیەنێت. ئەوان نە لە خوێندنگاکانی قومدا خوێندنیان تەواوکرد نە لە حوجرەکانی کویتا، بەڵکو یەکێکیان خوێندنی لە زانکۆی سۆربۆن لە پاریس تەواوکرد و ئەوی کەشیان لە چەندین زانکۆی ئەمریکی خوێندی و وانەی وتەوە. هەرچیش پەیوەندی بە ستایل و لۆژیك و شێوازی لێکدانەوە و فۆرمەلە کردنی ڕۆشنبیرییەوە هەیە، سەبارەت بە پشت بەستن بە سەرچاوەکان، ئەوا دەتوانین بڵێین هەردووکیان دوونووسەری خۆرئاوایین، ئەگەرچی "عەلی شەریعەتی" چەند بەرهەمێکی بە زمانی فارسی نوسی. "شەریعەتی" لەژێر کاریگەری زۆری "فرانز فانۆن" و "گرۆڤیتش"دا بوو، بەڵام "ئێدوارد سەعید" کاریگەری "ئەندرسۆن" و "میلباند"ی لەسەر بوو. "عەلی شەریعەتی" "بەلزاك"ی خۆش دەویست و لە کاتی نوسینی کتێبەکانیدا گوێی بۆ مۆسیقای "بیزیێ" دەگرت، لە بەرامبەردا "ئێدوارد سەعید" سەرسام بوو بە "جۆزیف کۆنراد" و حەزیدەکرد گویێ لە مۆسیقای "باخ" بگرێت.

ئەم دووپیاوە تەنها سازشێك کردبێتیان بۆ ئەوەی خۆیان بنیات بنێنەوە و جارێکی دی ببنەوە بە خۆیان، ئەوەیە هەردووکیان لە دوا ساڵەکانی تەمەنیاندا وازیان لە بەستنی بۆینباخ هێناو ڕیشیان لێبەردایەوە. لەلایەکی ترەوە "شەریعەتی" و"سەعید" کلتوری ناسیونالیزمی خۆرئاوایان پەیڕەوکرد، وەك بنەمایەك بۆ تێڕوانینی مانەویەتیان بەرامبەر بە جیهان. ئەوان لەبەرئەوەی لە ئەوروپا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ژیان، نەیانتوانی لەگەڵ هیچ نیشتمانێکی دیاریکراودا خۆیان بگونجێنن. بۆ ئەوان ڕاناوی (ئێمە) مانای جیهانی ئیسلامی دەگەیاند، کە هیچ یەکێکیان ئەزمونی ڕاستەوخۆی لەگەڵیدانەبوو. بەنیسبەت ئەوانەوە ئیسلام ئایین نەبوو، بەڵکو ئایدیۆلۆژیا و شوناسێکی کلتوری بوو.

دوو مەسەلە هەن "شەریعەتی" و "سەعید" یان بەخۆیانەوە سەرقاڵکردبوو. یەکەمیان بە جەنگی ڕزگاریخوازی جەزائیرەوە خەریك بوو، دووەمیشیان بە تەواوەتی خۆی بۆ مەسەلەی فەلەستین تەرخانکرد. هەریەکەشیان ئەو مەسەلەیەی خۆی لە چوار چێوەیەکدا داڕشتبوو کە بریتی بوو لە: (زاڵم بەرامبەر دادپەروەر) و (ئیسلام بەرامبەر خۆرئاوا). ئەمەش بەرەو مەتاهەیەکی ئەخلاقی بردن کە ڕێگربوو لەوەی لێکدانەوەیەکی




گونجاو بۆ مەسەلەیەك بكەن نە ئایینیە و نە كلتوری، بەڵكو لە بنەڕەتدا كێشەیەكی سیاسییە.

بۆ نمونە لە جەزائیردا ئەوە خۆرئاوای خاچ پەرست نەبوو شەڕی دژی ئیسلام دەكرد، بەڵكو ئەوەی هەبوو وڵاتێكی كۆلۆنیالی بوو كە بە قەیرانی شوناسدا تێدەپەڕی و نەیدەتوانی غەریزەكانی خۆی كۆنترۆڵ بكات، لەلایەكی دیكەشەوە جەزائیرییەكان هەبوون كە بۆ یەكەمین جار لە مێژوودا بەخۆیان ئاشنا دەبوون. جەزائیرییەكانیش سەروەختێك بوونە غەربزەدە، ئەو كات دەستیان دایە شۆڕش و لە دژی فەرەنسیەكان ڕاپەڕین. سەبارەت بە كێشەی فەلەستینیش، ئەوا ئەویش ناچێتە چوارچێوەی ململانێی (ئێمە لە بەرامبەر ئەواندا)، لەبەرئەوەی ئەوە كێشەیەكە لەسەر زەوی و سنور و سەروەری و دواجاریش كێشەیەكە لەسەر دەسەڵاتی سیاسی.

به واتایەكی تر كێشەكە كێشەیەكی عەلمانییە نەك ئایینی. هەرچەندە كێشەی فەلەستین بەلای هەندێك عەرەبەوە مەڵبەندی ڕۆحی نەتەوەیی بریندارە، بەڵام مەیدانی شەڕی نێوان ئیسلام و خۆرئاوای (یەهودی – مەسیحی) نییە.

جیاوازی نێوان "ئێدوارد سەعید" و "عەلی شەریعەتی" لە یەك خاڵی گرنگدایە.. "سەعید" لە هەموو شتێكدا سەرزەنشتی ئیمپریالیزمی خۆرئاوا دەكات و پرسیارە مێژووییەكەشی ئەوەیە كە (ئەوانی دی چییان بۆ كردوین؟)، بەڵام "عەلی شەریعەتی" سەرزەنشتی خۆرئاوا و دەستەبژێری جیهانی ئیسلامی دەكات، ئیتر ئەوانەیان بێت كە دەسەڵاتدارن یاخود نوخبەی ئایینی بێت. "شەریعەتی" لەبەرئەوەی هەمان ئەو پرسیارەی كردبوو كە "سەعید" دەیكات، ئەوا پڕكێشی دەكات بۆ ئەوەی پرسیارێكی دیكە بكات و دەڵێت: (حوكمڕان و سەركردە ئاینییەكانمان چییان پێكردین؟). بەڵام تەنانەت "شەریعەتی"ش كە لە "سەعید" دورتر دەڕوات، ناوێرێت خودی ئەزمونی ئیسلامی بخاتە ژێر باری توێكاری جدی و ڕەخنەیەكی بابەتی.

هێندە بەس نییە بڵێین ئێمە بۆیە دوچاری ئەم دۆخە نالەبارە بووین، لەبەرئەوەی هێزە ئیمپریالیستەكان دەسەڵاتی خۆیان بەسەردا سەپاندین یاخود بڵێین سەركردەكانمان و پیاوانی ئایینیمان، گەندەڵ و نەفام بوون. گەمەیەكی لەمجۆرە كەبریتییە لە سەرزەنشتكردنی كەسانی دی و خەتا خستنە ئەستۆی ئەوانیتر، ڕەنگە بۆ گفتوگۆ و قسەی سەر مێزگردەكان بە كەڵك بێت، بەڵام ناتوانێت وەڵامی پرسیارە سەرەكیەكە بداتەوە، ئەویش ئەوەیە: (ئایا كەلێنێكی جەوهەری لە كلتوری خۆماندا نییە كەوا دەكات لە بەرامبەر دوژمنكاری ئیمپریالیستیدا ڕوت و ڕەجاڵ بین، یاخود نەتوانین بە گژ دەسەڵاتی ناقۆڵای فەرمانڕەوا گەندەڵەكان و پیاوە ئایینیە جاهیل و نەزانەكاندا بچینەوە؟).

ڕەنگە هەست بە ئاسودەییەك بكەین و سەرشانمان كەمێك سوك بێت، كاتێك ئەو پشێوی و ماڵوێرانیەی چەندین سەدەیە بەسەرماندا هاتووە، بدەینە پاڵ ئەوان و ئەوان بە خەتابار بزانین. تەنانەت ڕەنگە خۆمان بە حەقیقی لێ ببێتە قارەمانێكی دەگمەن و كەم وێنە، بەڵام ئەمە لە هەمان كاتدا ئینسانیەتمان لێدادەماڵێت و دەمانكاتە شت گەلێك كە مێژوو جڵەوگیری دەكات و هێزە زەبەلاحەكان ئاڕاستەی دەكەن، ئەو هێزانەی كە ناسینی سروشتی خۆیان بەسەرماندا دادەخەن.

بەم پێیە دەكرێت ئەو شێوازەی "ئێدوارد سەعید" و "عەلی شەریعەتی" دەست

نیشانیانکردووە بۆ خوێندنەوەی مێژوو، وەها وەسف بکەین کە شێوازێکی میتافیزیکیانەیە، لەبەرئەوە دەبێت بەرهەمەکانیان وەها بخوێنینەوە کە ئەدەبە نەك سیاسەت.

## پەراوێزەکان

1–خوێنەری بەڕێز دەبێت لەوە ئاگاداربێت ئەم وتارە هەفتەیەك پاش مەرگی "ئێدوارد سەعید نوسراوە، (وەرگێڕی کوردی).

2–سەروەختێك بەریتانیا وەك هێزێکی کۆلۆنیالستی هندستان داگیر دەکات، ئەو کات هندستان بریتیی بووە لە وڵاتی هندستانی ئێستا و پاکستان و بەنگەلادیش. واتە هێشتا پاکستان و بەنگەلادیش جیانەبوو بوونەوە و بەریتانیا توانیویەتی بەهێزێکی کەم، ئەو ڕووبەرە جوگرافیە بەرفراوان و ئەو ژمارە زۆرەی دانیشتوان کۆنترۆڵ بکات و پایەکانی حوکمڕانی خۆی لەو ناوچەیەدا بسەپێنێت، (وەرگێڕی کوردی).

## سەرچاوە

الشرق الاوسط

3ی تشرینی یەکەمی 2003.

# پێكدادانی جەهل

**ئیدوارد سەعید**

**لە ئینگلیزییەوە: هادی محەمەد**



مەقالەكەی ساموێل هنتگتۆن بە ناوی "بەیەكدادانی شارستانیەتەكان" لە ژمارەی هاوینی 1993 "كاروبارەكانی دەرەوە"دا بۆ یەكەم جار بەرچاوكەوت، دەست بەجێ ڕادەیەكی سەرسوڕهێنەری لە سەرنج و كاردانەوەی بەدوای خۆیدا هێنا. لەبەرئەوەی مەقالەكە بەو نیازە نوسرابوو كە تێزێكی بنەڕەتی بە ئەمریكییەكان ببەخشێت بۆ فەراهەم كردنی "قۆناغێكی نوێ" لە سیاسەتی دنیادا لە دوای كۆتایی هاتنی جەنگی ساردەوە، بۆیە زاراوەكانی ئارگیومێنتەكەی هنتنگتۆن زۆر سەرنج ڕاكێش و قەبە و زەق و تەنانەت خەیاڵیش دەردەكەون. زۆر بە ئاشكرا چاوی بڕیوەتە نەیارەكانی لە پۆستە سیاسەت – بەرهەمهێنەرەكاندا، نەیارەكانیشی بریتین لە تیۆریستەكانی وەكو فرانسس فۆكۆیاما و ئایدیاكانی "كۆتایی مێژوویی"یەكەی و هەروەهاش ئەو كەسانەی ڕابەرایەتی سەرهەڵدانی جیهانگیری *globalism* و تایفەگەری *Tribalism* و نەهێشتنی دەوڵەتیان كردووە. هنتنگتون پێیوایە كە ئەم جۆرە كەسانە تەنها چەند دیوێكی ئەم قۆناغە نوێیەیان دەركردووە. هنتنگتۆن خۆی وا دەردەخات كە سەرقاڵی دەرخستنی "دیوە چارەنوسسازەكەی یان

له راستیدا دیوه مەرکەزییەکەی ئەو سیاسەتی جیهانییەیە کە ئەگەری زۆری هەیە لە ساڵانی داهاتوودا دەرکەوێت". بە بێ هیچ دوو دڵییەك پێدادەگرێت و دەڵێت: "دانراوەکەی من *Hypothesis* ئەوەیە کە سەرچاوەی بنەڕەتی پێکدادان لەم جیهانە نوێیەدا لە سەرەتاوە نە ئایدۆلۆژییەو نە ئابوری. بەڵکو لێکترازانە مەزنەکانی ناو مرۆڤایەتی و سەرچاوەی زاڵی پێکدادان کلتوری دەبێت. دەوڵەتەکانی نەتەوە بە بەهێزترین ئەکتەرەکانی ناو کاروباری جیهان دەمێننەوە، بەڵام پێکدادانە سەرەکییەکانی سیاسەتی جیهانی لە نێوان نەتەوەکان و گروپە جیاوازەکانی سەر بە شارستانیەتە جیاوازەکاندا ڕوودەدات. پێکدادانی شارستانیەتەکان *clash of civilizations* لە سیاسەتی جیهانیدا زاڵ دەبێت. ئەو هێڵە هەڵانەی کە لە نێوان شارستانیەکاندا دەبنە هێڵەکانی جەنگی داهاتوو".

زۆربەی ئارگیومێنتەکە کە لەلاپەڕەکانی دواتردا دێت پشتی بەستووە لەسەر ئەو بۆچوونە لێڵ و تەماوییەی شتانێك کە هنتنگتۆن پێیان دەڵێت "شوناسی شارستانیەت" و "ئەو کارلێکانەی کە لە نێوان حەوت یان هەشت شارستانیەتە مەزنەکەدا هەن"، وە زۆرترین سەرنجەکانی هنتنگتۆن لەسەر پێکدادانی دووان لەو شارستانیەتانەیە ئەوانیش "ئیسلام و ڕۆژئاوا"یە. لەم جۆرە فکرە شەڕخوازەدا، هنتنگتۆن پشت دەبەستێت بە مەقالەیەکی ساڵی 1990ی خۆرهەڵاتناسێکی پسپۆڕ بە ناوی بێرناردلویس کە جێدەستە ئایدۆلۆژییەکانی بەناونیشانی مەقالەکەوە دیارە بە ناوی "ڕیشەکانی توندوتیژی مووسڵمانان".لە هەردوو مەقالەکەدا، بە شەخسی کردنی قەوارە زەبەلاحەکانی کە پێیان دەوترێت "ڕۆژئاواو ئیسلام" بێباکانە جەختی لەسەر دەکرێتەوە، هەروەکو ئەوەی مەسەلە زۆر ئاڵۆزەکانی وەکو شوناس و کلتور لە جیهانێکی شێوە کارتۆنیدا بوونیان هەبووە و لەو جیهانەشدا پۆپی و بلۆتۆ زۆر بێ بەزەییانەبە یەکیاندا کێشاوە و پاڵەوانێکی جوامێرتر هەمیشە بەسەر نەیارەکانیدا زاڵ بووە. بە دڵنیاییەوە، نەهنتنگتۆن و نە لویس ئەوەندە کاتیان نەبووە کە حەقی تەواو بە جوڵێنەرە ناوەکییەکان و فرەیی هیچ شارستانیەتێك بدەن، یان لەبەرئەو ڕاستییەی کە ناکۆکی سەرەکی لە ناو زۆرترین کلتورەکانی مۆدێرنەدا پەیوەندی بە پێناسەکردن یان تەفسیرکردنی هەر کلتورێکەوە هەیە، یان پەیوەندی بەو ئەگەرە پشت گوێ خراوەوە هەیە کە فەزایەکی گەورەی هەڵخەڵەتاندن و جەهلێکی *Ignorance* تەواوەتی بەشدارە لەوەی کە ڕێگا بە خۆی بدات کە وەك نوێنەری سەرتاپای ئاینێك یان شارستانیەتێك قسە بکات. لەبەرئەوە، نەخێر، ڕۆژئاوا ڕۆژئاوایە و ئیسلامیش ئیسلام.

هنتنگتۆن دەڵێت ڕووبەڕووبونەوە لە بەرامبەر بنیاتنەرانی سیاسەتی ڕۆژئاوا پێویستە دڵنیامان بکات کە ڕۆژئاوا بەهێزدەبێت و خۆپارێزیش لەبەرامبەر ئەوانی دیکەدا دەکات بە تایبەتی ئیسلام. کێشەکە لێرەدا زیاتر بریتییە لەو گریمانەیەی هنتنگتۆن کە پێیوایە دیدگاکەی، ئەو دیدگایەی کە بەکاریدەهێنێت بۆ لێکۆڵینەوەی هەموو جیهان لە پێگەیەکەوە کە لە دەرەوەی هەموو پەیوەست بوون و سۆزدارییەکی ئاسایی و دڵسۆزییەکی شاراوەدایە، بریتییە لە دیدگا ڕاستەکە، هەروەکو ئەوەی هەموو کەسێکی دیکە بێن و بچین و بەدوای ئەو وەڵامانەدا وێڵ بن کە ئەو پێشتر پێیان گەیشتووە. لە ڕاستیدا، هنتنگتۆن ئایدۆلۆژستێکە، کەسێکە دەیهەوێت کە

"شارستانیەتەکان" و "شوناسەکان *Identity*" بکاتە شتانێك کە نین: بیانڕوخێنێت، دەیهەوێت بیانکاتە ئەو قەوارە داخراوانەی کە لە ئەو بێ پایان تەوژم و دژە تەوژمانە داماڵراون کە مێژووی مرۆڤ دەژێننەوە، وە بە درێژایی سەدەکان وایان لەو مێژووە کرد کە نەك تەنها جەنگەکانی ئایین و داگیرکردنی ئیمپریالی بگرێتەخۆ، بەڵکو هەروەها ببێتە مێژووی ئاڵوگۆڕکردن و بیروڕا گۆڕینەوە و پێشکەوتن و هاوبەشی کردن. ئەم مێژووە زیاتر پەراوێزخراوە پشتگوێ دەخرێت لە پێناو زەقکردنەوەیەکی بێ مانایانەی ئەو پێکدادانە پەستێوراو تەسکەی کە "پێکدادانی شارستانیەتەکان" قسەی لێدەکات، ئەمەش ڕاستییەکەیە. کاتێك کتێبەکەی بە هەمان ناونیشان لە ساڵی 1996 بەچاپگەیاند، هنتنگتۆن هەوڵی دابوو کە کەمێك ئاڵۆزی زیاتر و پەراوێزی زۆر زیاتر بە ئارگیومێنتەکەی ببەخشێت: بەڵام هەموو ئەوەی ئەو کردی سەرلێشێوانێکی خۆی بوو و ئەوەشی دەرخست کە چ نوسەرێکی ترسنۆك و بیریارێکی شێواوە. پارادایمی بنەڕەتی ڕۆژئاوا لە بەرامبەر باقیاتی تری جیهاندا (ئۆپۆزسیۆنی جەنگی سارد دیسانەوە فۆرمەلە دەبێتەوە) وەکو خۆی ماوەتەوە و ئەمە ئەو شتەیە کە زۆر جار ژێر بە ژێر و ناڕاستەوخۆ لە گفتوگۆدا هەر لە ڕووداوە دڵتەزێنەکانی یانزدەی سێپتەمبەرەوە بەردەوام بووە و درێژەی پێدراوە. هێرشی خۆکوژی ووردەکار و پلان بۆ دانراو و جەرگبڕی هاندراوی ناتەندروستانە و قەسابخانەی بە کۆمەڵ کە لەلایەن گروپێکی بچوکی چەکدارە دەروون نەخۆشەکانەوە ئەنجام دەدرێت سەلماندنی تێزەکەی هنتنگتۆنیان گونجاوکردووە. لە جیاتی تێگەیشتنی مەسەلەکە بەو شێوەیە.. گرتنی ئایدیا قەبەکان (وشەکە بە شێواوی بەکاردێنم) بە باندێکی بچوکی دەمارگیرە شێتەکان لە پێناو مەبەستەکانی تاوانباردا.. کەڵە پیاوە نێودەوڵەتییەکان هەر لە سەرۆك وەزیرانی پێشووی پاکستانەوە بێنازیربوتۆ بۆ سەرۆك وەزیرانی ئیتالیا سلڤیۆ برسکۆنی لە بارەی گرفتەکانی ئیسلامەوە فەلسەفەیان لێداوە، وە لەم بارەدا، ئایدیاکانی هنتنگتۆنیان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی بەشان و باڵی باڵایی *Superiority* ڕۆژئاوادا هەڵبدەن، چۆن "ئێمە" مۆزارت و مایکڵ ئەنجلۆمان هەیە و ئەوان نییانە. (برلسکۆنی لەو کاتەوە پۆزشێکی دڵساردانەی بۆ سوکایەتییەکەی هێنایەوە کە بەرامبەر ئیسلام کردی).

بەڵام بۆچی لە جیاتی ئەوە سیفاتە هاوبەشەکانی، ئاشکرایە کەمتر لە وێرانکارییاندا سەرنج ڕاکێشترن، ئوسامە بن لادن و شوێنکەوتەکانی لە گروپە دینییەکەیاندا وەکو لقی داودییەکان یان شوێنکەوتەکانی جەنابی جیم جۆنس لە گویانا یان ئۆم شیرینکۆی یابانی نابینێت؟ تەنانەت هەفتەنامەی بەریتانی کە لە باری ئاسایی دا زۆر هەستیارە بە ناوی "ئیکۆنۆمیست" لە ژمارەی 22–28 سێپتەمبەر ناتوانێت ئەو گشتگیرکردنە مەزنە بشارێتەوە کە پێی دەگات، لە ڕادەبەدەر بەشان و باڵی هنتنگتۆندا هەڵدەدات بۆ ئەو سەرنجە "دڕندە و گشتگیر و بەڵام کتوپڕانە" کە لە بارەی ئیسلامەوە پێیگەیشتووە. گۆڤاری "تودەی *Today*" زۆر بە دڵسۆزییەکی نەشیاوەوە دەڵێت، هنتنگتۆن دەنوسێت.. بلیۆنی جیهان واتە موسڵمانەکان باڵایی کلتوری خۆیانیان قبوڵە، وە هەمیشە بیر لە نزمێتی *Inferiority* دەسەڵاتیان دەکەنەوە. ئایا هنتنگتۆن دەنگی 100 ئەندۆنیسی و 200 مەراکیشی و 500 میسری و 50 بۆسنەیی وەرگرتووە؟ تەنانەت ئەگەر کارێکی لەم شێوەیەشی

کردبێت، ئەوە چ جۆرێکی نمونە (سامپڵ *Sample*)یە؟

ژمارەیەکی بێ شوماری سەرووتار لە هەر ڕۆژنامەو گۆڤارێکی ئەمریکی و ئەوروپیدا هەڵدەستا بە زیادکردنی تێبینی بۆ ئەم واژە زەبەلاح و ئیلهام بەخشانە، هەر بە کارهێنانێکی ئەم تێبینیانەش زۆر ئاشکرایە بۆ ئەوە نییە کە چاکسازی بکەن بەڵکو بۆ گڕدانی سۆزی تووڕەیی خوێنەرە وەکو تاکێکی خۆرئاوا و ئێمەی خۆرئاوایی پێویستە چی بکەین. زمانە لوسەکەی چێرچل زۆر نەشیاوانە بەکاردەهێنرێت لەلایەن جەنگاوەرە خۆ دامەزرێنەرەکانەوە لە جەنگی ڕۆژئاوا و بە تایبەتی جەنگی ئەمریکا لەدژی نەیارەکانی و تالآن چییەکان و وێرانکەرەکان لەگەڵ سەرنجێکی زۆر کەمی ئەو مێژووە ئاڵۆزانەی کە ئاوەها بە بچوک تەماشاکردنی ئەوان دەشکێنێت و ڕێی لێدەگرێت و لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە تێپەڕیون، لەو پرۆسەیەدا، ئەو سنورانە دەشکێن کە ئێمەیان دابڕیوە و دابەشیان کردووین بۆ کامپە چەکدارەکان.

ئەمە بریتییە لەو کێشەیەی کە هەڵگری ناونیشانە فیڵآوییەکانی وەکو ئیسلام و خۆرئاوایە: ئەم ناونیشانانە زهنی مرۆڤ وێڵ دەکەن و دەیشوێنن، ئەو زهنەی کە هەوڵدەدات دەرکی ئەو ڕاستییە شێواوە بکات کە ناکرێت پەراوێز بخرێت و پشتگوێ بخرێت هەروا بە ئاسانی وەکو هەموو شتەکانی دیکە. لەبیرمە جارێکیان لە زانکۆی بانکی ڕۆژئاوا لە ساڵی 1994، دوای ئەوەی وتارێکم پێشکەش کرد، پیاوێك قسەکانی پێ بڕیم و لەناو گوێگرەکاندا هەستاو هێرشی کردە سەر ئایدیاکانم وەکو ئایدیای "ڕۆژئاوایی *western*" لە بەرامبەر ئەو ئایدیا ئیسلامییە توندانەی کە ئەو پەنای بۆ برد..

بۆچی تۆ چاکەت و بۆینباغت لە بەردانییە؟ ئەمە یەکەم بەرەنگاربونەوە بوو کە هات بە زهنیدا، هەروەها ئایدیای "هەروەها ئەوانیش ڕۆژئاواییین" پاشان بە زەردەخەنەیەکی شەرمەزارییەوە بەسەر ڕوویەوە دانیشت، بەڵآم من ئەو ڕووداوەم وەبیر هێنایەوە کاتێك زانیاری لەسەر تیرۆریستەکانی یانزەی سێپتەمبەر بەردەست کەوتبوو: چۆن ئەم هەموو ووردەکارییە تەکنیکییانە فێربوون و کۆنترۆڵیان کرد کە پێویست بوو ئەو پەلامارە بەدە مرۆکوژییەیان بکەنە سەر سەنتەری بازرگانی جیهانی و پنتاگۆن و ئەو فرۆکەیەی دەستیان بەسەردا گرتبوو. کەسێك لە کوێوە هێڵێك دەکێشێت لەنێوان تەکنەلۆژیای ڕۆژئاوایی و ئەوەی برلسکۆنی بانگەشەی بۆ دەکات "ئیسلام" ناتوانێت ببێتە بەشێك لە مۆدێرنیتە؟

بە دڵنیـــاییەوە، کەســێك هـــەروا بە ئاسانی ناتوانێت کارێکی لەو شێوەیە بکات. لە دەرەنجامدا، ناونیشان و گشتگیردن و پێداگرتنە کلتورییەکان چەندە ناتەواون. بۆ نمونە، لە هەندێك ئاستدا، حەزە سەرەتاییەکانی و مەعریفەی کرداری ئەزمونکراو لەو شێواز و ڕێچکانەدا بەیەکدەگەن کە درۆیەك دەدەنە پاڵ سنورێکی بەهێزکراو نەك تەنها لە نێوان "ڕۆژئاوا" و "ئیسلام"دا، بەڵکو هەروەها لە نێوان ڕابردوو و ئێستادا، ئێمە و ئەواندا، نەووتنی هیچ شتێك لە بارەی خودی چەمکەکانی شوناس و نەتەوایەتی *nationality* لەبەرئەوەیە کە مشتومڕێك و ناکۆکییەکی ناکۆتا لە بارەیانەوە هەیە. بڕیارێکی یەکلایەنە دراوە بۆ کێشانی هێڵ و سنورەکان لە خاکی لمیندا و بۆ گرتنە ئەستۆی جەنگە پیرۆزەکان و بۆ ڕووبەڕووبونەوەی خراپەکەیان بە چاکەکەمان، بۆ لەناوبردنی تیرۆریزم و بە گوتە هیچ گەراییەکەی پاوڵ وۆڵفز بۆ کۆتایی هێنان بە نەتەوەکان بە

تەواوی، ئەم بڕیارە وا لە قەوارە پێشنیار کراوەکان ناکات ئاسانتر لێیان بڕوانین، بەڵکو بەو شێوەیە دەدوێت کە چەندە ئاسانترە بۆ ئەوەی بتوانیت گوتە شەڕانییەکان بەرهەم بهێنیت لە پێناو مەبەستەکانی جولاّندنی حەزە کوێییەکانی خەڵکی وەك لەوەی هەستێت بە کارکردن و پشکنینی و پۆلێنکردنی ئەو شتەی کە ئێمە لە واقیعدا مامەڵەی لەتەکدا دەکەین، ئەویش پێکبەستە ناوخۆییەکانی ژیانە بیّ شومارەکانە، "هی ئێمە"و هەروەها"هی ئەوانیش".

لە زنجیرەیەکی بەرچاودا، سیّ مەقالە لە نێوان – کانونی دووەم و ئازاری 1999 بلاّوکرانەوە لە هەفتەنامەی "*Dawn*"دا، کە ڕێزدارترین هەفتەنامەی پاکستانە، خوالیخۆشبوو ئیقبال ئەحمەد کە بۆ خوێنەرانی موسوڵمان دەنوسێت، ئەوەی شیکارکردبوو کە ئەو پێی دەڵێت ڕیشەکانی ماف ئایینی، زۆر بە سەختی بەو شێواندنانەدا دێتە خوارەوە کەلەلایەن ئەو ڕەهاگەرو ستەمکارە دەمارگیرانەوە بەرامبەر ئیسلام ئەنجام دراون کە هەمیشە سەرقاڵی ڕێك و پێکردنی ڕەفتاری کەسی خۆیانن و ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی "کە دەسەلاّتێکی ئیسلامی کورت بێتەوە بۆ سیستەمێکی سزایی و لە هەموو مرۆڤگەری و جوانیناسی و بەدواداچونە ڕۆشنبیرییەکان و دڵسۆزی و خۆتەرخانکردنێکی ڕۆحی داماڵراوە". وە ئەمەش "پێویستی بە پێداگرتنی ڕەهای یەك دیوی گشتییانەی بیّ سیاق کراوی ئایینی و ڕەتکردنەوەی تەواوی ئەوی دیکە هەیە. دیاردەکە ئایین دەشێوێنێت و ترادسیۆن ڕیسوا دەکات و پرۆسەی سیاسی دەشێوێنێت لە هەر جێگایەك خۆی دەرخات". وەکو نمونەیەکی کاتیانەی ئەم ڕیسواکردنە، ئیقبال ئەحمەد یەکەم جار هەڵدەستێت بە پێشکەشکردنی مانا دەوڵەمەندە

ئاڵۆزە فرەگەرییەکەی ووشەی "جیهاد" و پاشانیش بەردەوام دەبێت بۆ نیشاندانی ئەوە لە چوارچێوەی هەنووکەیی ووشەکەدا بۆ جەنگێکی هەڕەمەکی لە دژی دوژمنە گریمانکراوەکان، زۆر مەحاڵە " بۆ دانپیانانی دین و کۆمەڵگاو مێژوو سیاسەتێکی ئیسلامی وەك ئەوەی ژیاوە و ئەزمونکراوە لەلایەن موسڵمانەکانەوە بە درێژایی سەدەکان". ئیقبال ئەحمەد دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە "ئیسلامییە مۆدێرنەکان سەرقاڵن بە دەسەلاّتەوە نەك ڕوح، سەرقاڵن بە جولاّندنی خەڵکی بۆ مەبەستە سیاسییەکان وەك لە هاوبەشیکردن و هێور کردنەوەی ئازارەکانیان و ئاهو ناڵەکانیان. ئەجێندایەکی سیاسی زۆر سنوردار و پەیوەست بەکاتەوە بریتییە لە ئەجێندای ئیسلامییە مۆدێرنەکان". ئەوەی زیاتر مەسەلەکان نالەبارتر دەکات ئەوەیە کە هەمان شێواندنەکان و دەمارگیری لە گوڕەپانەکانی گوتار "جولەکە و مەسیحیەت" یشدا ڕوودەدەن.

ئەوە کۆنراد *Conrad* بوو، زۆر زیاتر لە هەر خوێنەرێکی خۆی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم توانیویەتی وێنای ئەوە بکات ئەو تێگەیشتووە کە جیاوازییەکانی نێوان لەندەنی بەر شارستانی کراوو "دڵی تاریکی" زۆر بەخێرایی لە بارودۆخە ناهەموارەکاندا پوکاوەتەوە، وە لوتکەکانی شارستانیەتی ئەوروپی هاوکات لە داڕمان دایە بەرەو بەربەریترین پراکتیزەکان بەبیّ هیچ ئامادەکارییەك یان قۆناغێکی گواستنەوە (انتقالی *Transition*). هەروەها ئەوە کۆنراد بوو لە "سیکرت ئەجێنتدا" (1907) وەسفی هۆگری تیرۆریزمی کردووە بۆ ئایدیا ڕووتەکانی وەکو "زانستی پوخت" (وەبە خۆکێشانە ناو "ئیسلام" یان "خۆرئاوا")، هەروەها وەسفی

تێکشکاندنی ئەخلاقیانەی کۆتایی تیرۆریستیشی کردووە.

سەرەڕای ئەوەی پەیوەندی نزیکتر لە نێوان شارستانیەتە بەشەڕدا هاتووە ئاشکراکان هەیە وەك لەوەی زۆربەمان حەزدەکەین باوەڕی پێ بهێنین: فرۆید و نیتشە دەریانخست کە چۆن هاتووچۆ و تێپەڕینی مرۆڤ و شت و مەکەکان بە وورياييەوە درێژەی هەبووە، تەنانەت جوڵەکانی سەر سنورە بە پۆلیسکراوەکانیش بە تێپەڕینی ترسناکەوە هەر درێژەی هەبووە بەردەوام بووە. بەڵام دواجاریش ئەو ئایدیا گۆڕاوانەی کە پڕن لە ئاڵۆزی و گومان لە بارەی ئەو بۆچوونانەوە کە ئێمە دەستیان پێوە دەگرین، تەنها و بەس ڕێنموێنیکارە گونجاوە پراکتیکییەکان بۆ ئێمە دابین دەکەن بۆ بارودۆخەکانی هەروەکو ئەو دۆخەی ئێستا ئێمە ڕوبەڕووی بونیەتەوە. لێرەوە، تەواوی فرمانەکانی جەنگ کە زیاتر جێی دڵنیاین (جەنگی پیرۆز، چاکە لە بەرامبەر خراپە، ئازادی دژی ترس.. هتد) لە دووبەرەکییە بێ بەڵگەکەی هنتنگتۆنەوە لە نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوا درێژبوونەتەوەو هەر لەمیشەوە گوتاری ڕەسمی لە ڕۆژەیەکەمینەکانی دوای پەلامارە تیرۆریستییەکەی 11ی سێپتەمبەرەوە مانای خۆی وەرگرت. هەرچەندە لەو کاتەوە لاوازبونێکی بەرچاو لە گوتارەکەدا دەبینرێت، بەڵام برێکی بەردەوام لە قسەوکرداری ڕق ئامێز و ڕاپۆرتەکانی هەوڵەکانی ناچارکردنی یاسا ئاراستەی عەرەبەکانو موسڵمانەکانو هیندییەکانی سەرتاسەری وڵات کراوە، لەبەرئەوە پارادایمەکە هەر بەردەوامە.

هۆکارێکی دیکەی بەردەوامبوونی ئەو پارادایمە بریتییە لە بوونی زۆری موسڵمانان لەسەرتاسەری ئەورووپا و وڵاتەیەکگرتووەکان. بڕوانە دانیشتوانەکانی ئەمڕۆی فرانسا و ئیتالیا و ئەڵمانیا و ئیسپانیا و بەریتانیا و ئەمریکا و تەنانەت سویدیش، وە پێویستە دانبنێیت بەوەدا کە چیتر ئیسلام لەسەر لێواری ڕۆژئاوا نییە بەڵکو لەسەنتەری ڕۆژئاوادایە. بەڵام ئەوە چییە کە هەڕەشە لەو بوونەی موسڵمانان دەکات؟ یادەوەرییەکانی داگیرکارییە عەرەبییە ئیسلامییە گەورە یەکەمینەکان کە لە سەدەی حەوتەوە دەستی پێکرد و لە کلتوری زۆرینەدا توانەوە و سەرەتا لە ناوچوون هەر وەکو مێژوو نووسی بەناوبانگی بەلجیکی هێنری پیرینی لە کتێبە گرنگەکەیدا نوسیویەتی بەناوی "موحەمەد و چارلی ماگنی 1939" و سەرەڕای یەکیەتییە دێرینەکەی دەسەلآتی ڕۆمان مەسیحی وێران بووی دەریای سپی ناوەڕاست شارستانیەتێکی نوێی هێنایە کایەوە کە هێزەکانی باکور (ئەڵمانیا و فرانسای کارۆلینجی" بەسەریدا زاڵ بوون و پەیامی سەرەکیشی وەکو هنتنگتۆن دەڵێت بریتییە لەسەرهەڵدانی بەرگریکردنی "خۆرئاوا" لە دژی دوژمنە مێژووییە کلتورییەکانی. بەداخەوە، ئەوەی هێنری پیرینی گوێی پێنەداوە ئەوەیە کە لە دروستبوونی ئەم هێڵە نوێیەی بەرگریدا، ڕۆژئاوا پشتی بە مرۆگەری و زانست و فەلسەفە و کۆمەڵناسی و هێڵکاری مێژوویی ئیسلام بەستووە کە پێشتر خۆی خزاندۆتە نێوان جیهانی چارلی ماگز و سەردەمی کلاسیکییەوە. ئیسلام لە سەرەتادا بابەتێکی ناوەکییە، تەنانەت دانتی *Dante*، دوژمنەگەورەی موحەمەد، پێویست بوو دانی پیابنێت کاتێك پێغەمبەری لە دڵی "ئنغزۆ"کەیدا دانا.

دواجار، میراتی بەردەوامی خودی یەکتاپەرستی *Monotheism* بوونی هەیە و ئەوەی

لویس ماسیگنۆن پڕ بە پێستی خۆی پێیاندەڵێت "ئایینە ئیبراهیمییەکان". لە سەرەتادا، یەهودیەت و مەسیحیەت، هەریەکەیان جێنشینێك بوو شوێنی ئەوەی پێش خۆی دەگرتەوە، بەنیسبەت موسڵمانەکانیشەوە، ئیسلام هێڵی پێغەمبەرایەتی درێژە پێدەدات و تەواوی دەکات. هێشتاش مێژوویەکی شکۆدار نییە یان خستنەڕووی ناکۆکی فرە ڕووی نێوان ئەم سێ شوێنکەوتەیە هێشتا بوونی نییە.. هیچ کام لەم سیانە بە هیچ شێوەیەك کامپێکی یەکگرتووی تاك ڕەهەند نین، هیچ کامیان ئیرەییترینی هەموو خوداکان نییە، هەرچەندە یەکبونێکی مۆدێرنی خوێناوی لەسەر فەلەستین نمونەیەکی سێکولاری دەوڵەمەندمان پێدەبەخشێت کە کەللەڕەقی ئەوانی دەرخستووە و توانای ئاشتبوونەوەیان نییە و ئەمەش کارەساتی دڵتەزێنی دروست کردووە. سەیر نییە کاتێك موسڵمانەکان و مەسیحییەکان قسە لە ئامادەباشی بۆ جەنگی پیرۆز *Crusade* و جیهاد دەکەن، هەردوکیان بوونە یەهودییەکە بە زۆرترین بێ باکییەوە پشت گوێ دەخەن. کارنامەیەکی لەو شێوەیە وەکو ئیقبال ئەحمەد دەڵێت "زۆر جێگای دڵنیاییە بۆ ئەو پیاوو ئافرەتانەی کە لە ناوەڕاستی تەنکاوەکەدا لە نێوان ئاوە قوڵەکانی تەقلید و مۆدێرنیتەدا بەجێ ماون".

بەڵام هەر هەموومان لەو ئاوانەدا مەلە دەکەین، ڕۆژئاواییەکان و موسڵمانەکان و هەروەها ئەوانی دیکەش. وە لەبەرئەوەی ئاوەکان بەشێکن لە زەریای مێژوو، هەموو هەوڵدانێك بۆ شەقکردنی یان بەشبەش کردنی ئاوەکان بە بەکارهێنانی بەربەستەکان کارێکی بێ بەرهەم و نەزۆکە. ئەمانە بریتین لە کاتە شڵەقاوو و ناجێگیرەکان، بەڵکو باشتروایە بە زاراوەکانی کۆمەڵە *Community* بەهێز و لاوازەکان و سیاسەتی سێکۆلاری عەقڵ و جەهل و پرنسیپە گەردونییەکانی عەدالەت و ناعەدالەت بیر بکەینەوە وەك لەوەی سەرقاڵ بین بە دوای ئایدیا ڕووتە زەبەلاحەکان کە لەوانەیە تێربوون و ڕازی بونێکی ساتی بەڵام مەعریفەیەکی خۆیی کەم یان شیکارییەکی کەم زانیاریمان پێشکەش بکات.

تێزی "بەیەکدادانی شارستانیەتەیەکان" فێڵ و هەڵخەڵەتاندنێکە وەکو "شەڕی جیهانەکان"، بەهێزکردنی شانازی زاتی بەرگریکار باشترە لە تێگەیشتنێکی ڕەخنەیی پشت بەیەك بەستنی سەرلێتێکدەرانەی سەردەمی ئێمە.

**سەرچاوە**

www.thenation.com

# نمایشکردنەکانی ڕۆشنبیر

**ئیدوارد سەعید**

**لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا**



ئایا ڕۆشنبیران گروپێکی گەورەی خەڵکە یاخود گروپێکی بچووکی تا ئەوپەڕی سنوور هەڵبژاردەو پالاوتەیە؟ بەناوبانگترین دوو نموونەی سەدەی بیستەم کە باسی ڕۆشنبیران دەکەن، بنەڕەتیانە پێك ناکۆکن. (ئەنتۆنیۆ گرامشی)ی ڕۆژنامەنووسی بە ڕەگەز ئیتالّی و ئاکتیڤیست و فەیلەسووفی سیاسیی دەرکەوتوو، کە (مۆسۆلینی) لە سالانی (1926-1937)دا زیندانیکربوو، لە (دەفتەرەکانی زیندان)دا دەڵێت: "خەڵك بە گشتی ڕۆشنبیرن، بەلام هەر مرۆڤێك ئەرکی ڕۆشنبیر لە کۆمەڵگەدا ڕانا پەڕێنێ"[1]. ڕەوتی ژیانی (گرامشی) نموونەیەکی بەرجەستەیە بۆ ئەو ڕۆڵەی دەیبەخشێتە ڕۆشنبیر، چونکە ئەو لە بواری فیقهی زماندا بەتایبەتی ڕاهێنرابوو، هاوکاتیش بەرپرسێکی بزووتنەوەی کۆمەڵگەی ئیتالی بوو و لە بواری ڕۆژنامەگەریشدا نموونەی هۆشمەندترین شیکەرەوەی کۆمەلایەتی بوو، ئامانجی تەنیا بنیاتنانی بزووتنەوەیەکی کۆمەلایەتی نەبوو، بەڵکو دامەزراندنی پێکهاتەیەکی ڕۆشنبیریی کاملی گرێدراوی ئەو بزووتنەوەیەش بوو.

وەك (گرامشی) هەوڵدەدات بۆمانی ڕوونبکاتەوە، ئەوانەی لە کۆمەڵگەدا ڕۆڵی ڕۆشنبیر دەگێڕن دوو

جۆرن: یەکەمیان ڕۆشنبیرە تەقلیدییەکانە، وەك مامۆستاکان و ڕەبەندەکان و فەرمانبەرە جێبەجێکارەکان کە لە نەوەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە هەمان کار ئەنجامدەدەن. دووەمیان ڕۆشنبیرە ئۆرگانیکەکان کە (گرامشی) پێیوایە ڕاستەوخۆ گرێدراوی چینەکانن یان گرێدراوی ئەو پرۆژانەن کە تیایاندا ڕۆشنبیران بەکاردەبەن بۆ ڕێکخستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان یان بەدەستهێنانی دەسەڵات و کۆنترۆڵکاری زیاتر. بەو جۆرە (گرامشی) سەبارەت بە ڕۆشنبیری ئۆرگانیکی دەڵێت: "ڕێکخەری سەرمایەدار، هاوشانی خۆی، تەکنیککاری شارەزای پیشەسازی و پسپۆڕی ئابووریی سیاسی و ڕێکخەرانی کولتووریکی نوێ و داهێنەرانی سیستەمێکی یاسایی نوێ دادەمەزرێنێت. بەوجۆرە لە ڕۆژگاری ئیمرۆدا، بەپێی پێناسەکەی (گرامشی)، پسپۆڕی ریکلام یان پەیوەندییە گشتییەکان- مەبەست ئەو کەسەیە کە شێوازی هەمەجۆر دەنەخشێنێ بۆ ئەوەی کۆمپانیایەکی پاکژکردنەوە یان کۆمپانیایەکی هێڵەکانی فرۆکەوانیی دیاریکراو قازانجێکی زۆر لە بازاڕدا بەدەستبێنن- بە ڕۆشنبیری ئۆرگانیکی دەژمێدرێت. بەوپێیەی ئەو ڕۆشنبیرە کەسێکە هەوڵدەدات ڕەزامەندیی مەعمیلە چاوەڕوانکراوەکان بەدەستبهێنێت یاخود بەرخورێك یان هەڵبژێرێك ئاڕاستەبکات. (گرامشی) بڕوای وابوو ڕۆشنبیرە ئۆرگانیکەکان چالاکانە لە کۆمەڵگەوە گلاون، واتە کۆڵنەدەرانە کۆششدەکەن بۆ گۆڕینی ئەقڵ و بیروڕاکان و فراوانکردنی سنووری بازاڕ. ڕۆشنبیرە ئۆرگانیکەکان، بەپێچەوانەی مامۆستاکان و ڕەبەندەکانەوە کە زیاتر مەیلی ئەوەیان هەیە لە جێگەی خۆیاندا بمێننەوەو جێی نەهێڵن و ساڵ لەدوای ساڵ هەمان کار ئەنجامبدەن، بەردەوام لە دۆخی هەڵچوون و جووڵەو پێکهاتندان.

لەوبەرەوە پێناسەکەی (ژولیان بندا) سەبارەت بە ڕۆشنبیران بەدیدەکەین کە بەم شێوەیە باسیاندەکات: "گرووپێکی زۆر بچووکی پادشا- فەیلەسووفە بەهرەمەندە سەرکەوتووەکانە کە خاوەنی ئەخلاقی بەرزن، بەوپێیەش نوێنەرایەتی ویژدانی مرۆڤایەتی دەکەن". ئەگەرچی پەیامی (بندا): "خیانەتکردنی ڕۆشنبیران" لەلایەن نەوەکانی پاشترەوە زیاتر وەك هێرشێکی سەرسەخت بۆ سەر ئەو ڕۆشنبیرانە مامەڵەی لەگەڵ کرا کە بانگەوازی ناوخۆیی خۆیان فەرامۆشکردبوو و سازشیان لەسەر پرنسیپەکان دەکرد، نەك وەك شیکردنەوەیەکی ڕێکوپێکی ژیانی ڕۆشنبیر. لەڕاستیدا (بندا) پەنا بۆ ژمارەیەکی کەمی کەسەکان دەبات و باسی خەسڵەتە بنچینەییەکانی ئەو کەسانە دەکات کە بە ڕۆشنبیری ڕاستەقینەیان دادەنێت. بۆ نموونە، چەندین جار ناوی (سوکرات) و (مەسیح) دێنێت. هەروەها نموونەی نوێ دێنێتەوە، وەك (سپینۆزا، ڤۆڵتێر، ئارنیست رینان). لە ڕاستیدا ڕۆشنبیرە ڕاستەقینەکان دەستەبژێرن و بوونەوەرگەلێکی دەگمەن پێکدێنن، چونکە ئەوانەی داکۆکی لە پێوانەکانی ڕاستی (حەقیقەت) و دادپەروەریی هەمیشەیی دەکەن سەر بەم جیهانە نین. دەربڕینە ئایینییەکەی (بندا)ش بەخشییە ڕۆشنبیران (ئیکلیرۆس) هەر لێرەوە سەرچاوەدەگرێت، بۆ ئەوەی لە پێگەو کارکردندا لە خەڵکەکانی دیکەیان جیابکاتەوە. مەبەست ئەو مرۆڤە سادانەیە کە سەرقاڵی بەرژەوەندییە ماددییەکان و هۆکانی پێشکەوتن و گەشەکردنی تاکەکەسین. واتە ئەو مرۆڤانەی پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ دەسەڵاتە دنیاییەکاندا هەیە.

(بنــدا) دەڵێــت: "ڕۆشــنبیرە ڕاســتەقینەکان ئــەو کەسانەن کە چالاکییەکانیان بەپێویست ئاڕاستەی خواستە زانستییەکان ناکرێت و بەختەوەریی خۆیان لــە پراکتیزەکردنـــی هونـــەرێك، زانســـتێك یـــان تێڕوانینێکی میتافیزیکیانـەدا دەبیننـەوە. کـورت و پوخـــت، کۆششـــدەکەن بـــۆ بەدەســـتهێنانی دەستکەوتی نامـاددی". بەوپێیـەش هەریـەکێکیان بـەخۆی دەڵێـت: "شانشـینی مـن لـەم جیهانـەدا نییە"[2].

بەهــەرحاڵ، ئـەو نموونانـەی (بنـدا) بـەڕوونی و ئاشکرا دەیانخاتەڕوو، تەبانییە لەگەڵ نموونەی ئەو بیریارانەی لە هـەمووجورە پەیوەندییـەك دامـاڵراون و تـەواو ئــەم جیهانــەیان جێهێشـتوەو لــە کۆشـکی گۆشــەگیریدا نیشــتەجێن و دابــڕاون و خۆیــان بــۆ بابەتگەلی ئاڵۆزو سەخت و لوغزئامێز تـەرخانکردوە. ڕۆشنبیرە ڕاستەقینەکان ئەوانەن کە هەستوسـۆزی میتـــافیزیکی و پرنســـیپەکانی دادپـــەروەری و حەقیقـەتی سەرڕاست هانیانـدەدات بـۆ ڕاپەڕانـدنی ئەرکــە سروشــتییەکانی خۆیــان و تاوانبــارکردنی گەنــــدەڵی و داکـــۆکیکردن لـــــە لاوازەکـــــان و بەرەنگاربوونــەوەی دەســەڵاتە سـتەمکارەکان یــان ناڕەواکـان. (بنـدا) دەڵێـت: "پێویسـت ناکـات بڵـێم، چۆن (فینیلۆن) و (ماسیلۆن) دژی ئەو جەنگانە بوون کە (لویسی چواردەهەم) بەرپایکردن، چۆن (ڤۆڵتێر) دژی وێرانکردنـی پلاتینـەکان* بـوو، چـۆن (رینـان) ئــەو توندوتیژیانــەی تاوانبــارکرد کــە (نــاپلیۆن) پێڕەویدەکردن، چۆن (بەکل) دژی ئەو دەمارگیرییە بـــوو کـــە ئینگلســـتان دژی شۆڕشـــی فەڕەنســـی بەکاریـــدەهێنا و چـــۆن لـــە ڕۆژگـــاری ئیمڕۆمانـــدا (نێتشە) ناڕەزایی بەرامبەر بە دڕندەبوونی ئـەڵمانیا لەهەمبــەر فەڕەنســا دەربڕیــوە"[3]. لــە ڕوانگـــەی (بندا)وە، گرفتی نـەوەکانی ئەم ڕۆژگارە ئەوەیە کە دەســـەڵاتی ئـــەخلاقیی خۆیـــان داوەتـــە دەســـت "ڕێکخراوی سۆزە بەکۆمەڵەکان"ی وەك تافەگـەری و ویــژدانی جــەماوەرو خولیــای ناسیونالیســتانە بــۆ شەڕو بەرژەوەندییەکانی چین (طبقة). (بندا) ساڵی 1927 ئـــەم وشـــانەی نووســـیوە، واتـــە پـــێش دەستپێکردنی سـەردەمی ئامرازەکـانی ڕاگەیانـدنی جەماوەری، بەڵام هەستی بەوە کردبوو چەند بەلای حکومەتەکانـــەوە گرنگبـــوە ڕۆشـــنبیران بـــۆ خزمەتکردنی خۆیان بخەنەگەڕ، بەبێ ئەوەی داوای ئـــەوەیان لێ بکـــەن پێگەیـــەکی ســـەرکردایەتی بەدەســـتبێنن، بـــەڵکو پشـــتگیریی سیاســـەتەکانی حکومـــەت بکـــەن و پڕوپاگەنــــدە دژی دوژمنـــە ڕەسمییـــەکانی بکـەن و دەسـتەواژەی جـوان بکـەن بەبەری شتە قێزەوەنەکانیداو بەرفراوان هەڵسن بە دامەزرانـدنی ڕێکخراوگـەلی کـامڵ لـە ڕێگـەی زمـانی ئۆرویڵییـــەوە**، ئــەوەی ڕاســتیی ڕووداوەکــان بـــەناوی پاراســـتنی "بەرژەوەنـــدی" یـــان "شـــــکۆمەندی"ی ناسیۆنالیســــــتانەوە پەردەپۆشدەکات. هێزی ناڕەزایی (بندا) بەرامبەر بە خیانـەتی ڕۆشـنبیران لـە کارامـەیی بەڵگەکـەی یـان پێڕەویکردنـی تیۆرێکـدا نییـە کـە مەحاڵـە بێتـەدی، بەڵکو لەو گۆشەنیگایەدایە کە چارەسەری نیوەناچڵ ســەبارەت بــە ڕۆڵــی ڕۆشـنبیران قبـوڵ ناکـات. لــە ڕوانگـــەی (بنـــدا)وە، پێویســـتە ڕۆشـــنبیرە ڕاسـتەقینەکان دان بـەخۆداگرتووبن بەرامبــەر بــە سـووتاندنیان لــە سـەر خـازوق (هـۆرە سـینگێکی درێــژە کــە لــە قــوونی تاوانبــاران دەکــوترێ– و) و دوورخســـتنەوەو ڕەتکردنــــەوەیان لەلایـــەن کۆمەڵگـەوەو لەخاچـدان. ڕۆشـنبیران کەسـایەتیی سمبـولیی دەرکـەوتوون و بـەوە جیادەکرێنـەوە کـە سەرســـەختانە خــۆ لـــە بایەخدانـــە دنیاییـــە زانسـتییەکان بـەدووردەگرن، بەوپێیـەش ناکرێـت

ژمارەیان زۆربێت یان کەسێکیان بە شێوەیەکی ڕۆتینی گەشەبکات، بەڵکو پێویستە تاکگەلی کاملی خاوەن کەسایەتی بەهێز بن. لەبەر تێکڕای ئەو هۆیانە، ڕۆشنبیران (بەواتای بندا) بەپێویست گرووپێك پیاوی کەم ژمارەی لەلایەن هەموانەوە ناسراون (هەرگیز بندا ژنانی لەناو گرووپی ڕۆشنبیراندا دانەناوە)و بەدەنگی دلێری خۆیان دەکەونە ئاخاوتن لەگەڵ مرۆڤایەتیداو لە بەرزییەوە لەعنەتیە گرژەکانی خۆیان بەسەریاندا دەبارێنن. هەرگیز (بندا) پێشنیاری ئەوە ناکات چۆن ئەو پیاوانە دەگەنە حەقیقەت یاخود داخۆ تێڕامانە نابیناکانیان دەربارەی پرنسیپە هەتاهەتاییو نەمرەکان (وەك تێڕامانەکانی دۆن کیشۆت) تەنیا خەیاڵەکانی کەسایەتیەکی بچووك بوون.

وێڕای ئەوانە، گومانی تێدانییە دیمەنی ڕۆشنبیری ڕاستەقینە لای (بندا) بەگشتی دیمەنێکی سەرنجڕاکێشەو بەتوندی خۆی دەسەپێنێت، چونکە نموونە پۆزەتیڤو نێگەتیڤەکانی دەیانهێنێتەوە، بەڕاستی بڕواهێنن. یەکێك لەو نموونانە داکۆکیکردنی (ڤۆڵتێر)ە لە خێزانی (کالَاس)، بەپێچەوانەی ئەوەشەوە ئەو نموونەیەی دەربارەی نیشتیمانپەروەریی ترسناك لای نووسەرانی فەرەنسی وەك (مۆریس بارییە) دەیهێنێتەوەو لە ڕوانگەی (بندا)وە جۆرێك لە ڕۆمانتیکیبوون نەمردەکات کە "هەندێك" ڕەقیو قیزبوونەوە بەناوی شەرەفی نیشتیمانی فەرەنسییەوە لەخۆدەگرێت[4]. مەسەلەی (درایڤۆس)و یەکەمین جەنگی جیهانی (ژولیان بندا)یان لە ڕووی ڕۆحییەوە پێکهێنا. ئەو دوو ڕووداوە تاقیکردنەوەیەکی سەرسەختی ئەو ڕۆشنبیرانە بوو کە پێویست بوو یان بوێرانە دژی یەکێك لە کارە چەوسێنەرە سەربازییەکانی دژی سامییەکانو خرۆشانی نیشتیمانپەروەریتی کڵپەسەندوو ڕاوەستن یاخود خۆبەدووربگرنو ڕێگەی ڕانەمەڕ بگرنەبەرو دژی داکۆکیکردن بن لە ئەفسەرێکی جولەکەی بەناهەق تومەتبارکراو (ئەلفرید درایڤۆس)و پەنا بۆ دروشمگەلی شۆڤێنیستانەی توندڕەوانە بەرن بۆ خۆشکردنی ئاگری جەنگ– دوای دوەمین جەنگی جیهانی– دژی هەرشتێك ئەڵمانی بێت. دواتر (بندا) سەرلەنوێ کتێبەکەی خۆی بڵاوکردەوەو ئەمجارە هێرشێکی بەردەوامی کردە سەر ئەو ڕۆشنبیرانەی هاوکاری نازییەکان بوونو ئەوانەش کە بەردەوام خرۆشابوونو دوای کۆمۆنیستەکان کەوتبوون[5].. بەڵام دەتوانین لەژێر ڕووی وتاربێژیی جەنگاوەرانەی زۆر موحافەزەکاردا کەسی ڕۆشنبیری ڕەتکەرەوە بەدیبکەین، ئەو ڕۆشنبیرەی توانای هەیە حەقیقەت بۆ دەسەڵات دەربڕێو تاکێکی قسەڕەقی ڕەوانبێژی ئازای سەرسوڕهێنەرە، تاکێکی تورە کە هیچ دەسەڵاتێکی دنیایی گەورەو ترسناکی وەها بەدیناکات کە شایانی ڕەخنەلێگرتنو لۆمەکردنو سەرزەنشتکردن نەبێت.

شیکردنەوە کۆمەڵایەتیەکەی (گرامشی) دەربارەی ڕۆشنبیر، وەك کەسێك کە لە کۆمەڵگەدا کۆمەڵێك کاری دیاریکراوی لەئەستۆدایە، لەوەی (بندا) زیاتر لە واقیعەوە نزیکە، بەتایبەتی لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا کە چەندین کاری نوێ جێگیربوون، وەك بێژەرەکان، پسپۆڕە ئەکادیمیستەکان، شیکەرانی کۆمپیوتەر، پارێزەرە شارەزاکانی بواری وەرزشو ڕاگەیاندن، ڕاوێژکارەکانی بواری کارگێڕی، شارەزایانی سیاسەتەکانو ڕاوێژکارە حکومییەکان، نووسەرانی ڕاپۆرتەکانی تایبەت بە بازاڕ. لەڕاستیدا گشت کارە تایبەتیەکانی بواری ڕاگەیاندنی

جەماوەری ڕاستیی تێڕوانینەکانی (گرامشی) دەسەلمێنن.

ئیمڕۆ هەرکەسێك کارەکەی گرێدراوی یەکێك لە بوارەکانی بەرهەمهێنان یان بڵاوکردنەوەی مەعریفە بێت، بەواتا (گرامشی)یەکەی ڕۆشنبیرە. لە زۆربەی کۆمەڵگە پیشەسازییەکانی خۆرئاوادا، ڕێژەی ئەوەی پێیدەوترێ پیشەسازیی مەعریفە زیاترە لەو کارانەی پەیوەندیدارن لەگەڵ بەرهەمهێنانی جەستەیی. کۆمەڵناسی ئەمریکی (ئەلڤین گۆڵدنەر) چەندساڵێك لەمەوبەر وتویەتی ڕۆشنبیران چینێکی نوێ پێکدێنن و بەرێوەبەرە ڕۆشنبیرەکان جێی ئەو چینە بەسەرچوانەیان گرتۆتەوە کە پارەدارو موڵکداری زەوی و خانوبەرە بوون. هەروەها وتویەتی، "ڕۆشنبیران بەپێی یەکێك لە خواستەکانی دەسەڵاتخوازی "کە بەدەستیانهێناوە" ئاخاوتن لەگەڵ جەماورێکی بەرفراواندا ناکەن، لەبری ئەوە بوونەتە ئەندامی ئەوەی پێیدەڵێن ڕۆشنبیریی گوتاری ڕەخنەگرانە"(6). هەر ڕۆشنبیرێك، سەرنووسەرەکانی کتێبەکان، نووسەرەکان، ستراتیژیستە سەربازییەکان و پارێزەرە نێودەوڵەتیەکان زمانێکی تایبەتیی ئاخاوتنیان هەیە کە لەلایەن تاکەکانی هەمان بوارەوە بەکاردەبرێت. واتە پسپۆڕە تایبەتمەندەکان بە زمانێکی هاوبەشی وەها لەگەڵ شارەزا تایبەتکارەکاندا ئاخاوتن دەکەن کە خەڵکی ئاسایی تێیناگات.

بەهەمان شێوە، فەیلەسووفی فەڕەنسی (میشێل فۆکۆ) دەڵێت: "ڕۆشنبیری تایبەتی جێی ڕۆشنبیری گەردوونی گرتۆتەوە(لەوانەیە لێرەدا ژان پۆل سارتەری لەیاددابووبێت)"(7). ڕۆشنبیری تایبەتی ئەو کەسەیە کە لەناو سیستەمێکی دیاریکراودا کاردەکات، بەڵام بەهەرحاڵ توانای بەکاربردنی شارەزایی خۆی هەیە. لێرەدا (فۆکۆ) مەبەستی فیزیازانی ئەمریکی (ڕۆبێرت ئۆبینهایمەر)ە کە بواری پسپۆڕیی خۆی جێهێشت- واتە بەرێوەبەرێتی پرۆژەی بۆمبی ئەتۆمی لە لۆس ئالامۆس کە سالانی (1942-1945) کاری تێدا دەکرد- و بوو بە بایەخدەرێك بەمەسەلەو کێشە زانستییەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

زۆربوونی ڕۆشنبیران تەشەنەیکردوە بۆ ژمارەیەکی زۆری بوارەکان و ڕۆشنبیران بوونەتە بابەتی لێکۆڵینەوە(دەشێت ئەمە پاش پێشنیارە پێشرەوەکەی گرامشی لە "دەفتەرەکانی زیندان"دا هاتبێت کە بۆ یەکەمین جار ئەوەی بەدیکردوە ڕۆشنبیران نەك چینە کۆمەڵایەتیەکان بڕبڕەی پشتی کارو خولیاکانی کۆمەڵگەی نوێن). ئەگەر "و"و "ێ" بخرێنە پاش وشەی "ڕۆشنبیر"ەوە، ئەوا یەکسەر کتێبخانەیەکی تەواوی توێژینەوە سەبارەت بە ڕۆشنبیران دەکەوێتە بەرچاوەمان، کتێبخانەیەك کە خوێنەر لەبەردەمیدا واقی دەوڕمێ، ئەوەش لەبەر فراوانیی بابەتەکانی و جەغتکردنەوەی وردکارانەی لەسەر وردەکارییەکان. هەزاران ناونیشان و لێکۆڵینەوەی هەمەجۆر بەرچاودەکەون کە لە ڕۆشنبیر وردەبنەوە، چەندین توێژینەوەش دەبینرێن کە ناونیشانی: ڕۆشنبیرو ناسیونالیزم، ڕۆشنبیرو دەسەلات، ڕۆشنبیرو کەلەپوور، ڕۆشنبیرو شۆڕش لەخۆدەگرن.. هەتا دوایی ئەو بابەتانەی بە مێشکدا دێن. هەربەشێکی ئەم جیهانە ڕۆشنبیری خۆی بەرهەمهێناوە و هەریەکێك لە پێکهاتەکانیش بەخرۆشەوە گفتوگۆی لەبارەی ڕۆشنبیرەوە کردوە، هیچ شۆڕشێکی گەورەی مێژووی نوێش بەدیناکەین ڕۆشنبیران لە ڕیزەکانیدا نەبووبن، هەروەها هیچ شۆڕشێکی چەواشەش بەبێ بوونی ڕۆشنبیران لە ڕیزەکانیدا



ڕووی‌نه‌داوه‌. ڕۆشنبیران دایك‌و باوك، كچ‌و كوڕو كچه‌زاو كوڕه‌زای بزووتنه‌وه‌كانن.

لێره‌دا مه‌ترسیی ونبوونی كه‌س‌و دیمه‌نی ڕۆشنبیر له‌ناو ورده‌كارییه‌كاندا "به‌دیده‌كرێت". هه‌روه‌ها مه‌ترسیی ئه‌وه‌ سه‌رهه‌ڵده‌دات كه‌ ڕۆشنبیر ببێته‌ تاقه‌كه‌سێك‌و بخرێته‌ سه‌ر كۆی كه‌سه‌ تایبه‌تمه‌نده‌كان یان كه‌سایه‌تیه‌ك له‌ناو ئاقاری كۆمه‌ڵایه‌تیدا. ئه‌وه‌ی له‌م سیاقه‌دا گفتوگۆی له‌سه‌ر ده‌كه‌م، ئه‌و ڕاستیانه‌ له‌خۆده‌گرێت كه‌ تایبه‌تن به‌ كۆتایی سه‌ده‌ی بیسته‌م، ئه‌و ڕاستیانه‌ی پێشتر (گرامشی) هێمای بۆ كردون‌و جه‌غت له‌سه‌ر ئه‌وه‌ ده‌كه‌نه‌وه‌، ڕۆشنبیر تاكێكه‌ ڕۆڵی گشتیی دیاریكراوی خۆی له‌ كۆمه‌ڵگه‌دا هه‌یه‌و ناكرێت ساكارانه‌ له‌ كارێكدا قه‌تیسبكرێت كه‌ بێئاڕاسته‌یه‌و ته‌نیا بكرێته‌ تایبه‌تكارێكی سه‌رقاڵ به‌ كاره‌كه‌ی خۆیه‌وه‌. چه‌قه‌حه‌قیقه‌ت به‌لای منه‌وه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ڕۆشنبیر تاكێكه‌ توانای نمایشكردنی په‌یامێك، جیهانبینیه‌ك، هه‌ڵوێستێك، فه‌لسه‌فه‌یه‌ك یاخود بیروڕایه‌كی هه‌یه‌و ده‌كارێت له‌به‌رده‌م جه‌ماوه‌رێكی دیاریكراوو له‌پێناویاندا به‌رجه‌سته‌ی بكات‌و ده‌ریبڕێت.. به‌ڵام ئه‌م ڕۆڵه‌ سنووردارەو مرۆڤ ناتۆنێت بیگێڕێت، ئه‌گه‌ر هه‌ست نه‌كات ئه‌ركی سه‌رشانیه‌تی پرسیارگه‌لی ئاڵۆزی شڵه‌ژێنه‌ر بۆ خه‌ڵكی بخاته‌ڕوو و به‌ره‌نگاری بیروڕا ته‌قلیدییه‌كان‌و بڕوا ڕه‌قهه‌ڵاتوه‌كان ببێته‌وه‌- نه‌ك ئه‌و بیروڕایانه‌ به‌رهه‌مبهێنێ‌و پراكتیزه‌یان بكات-و ببێته‌ ئه‌و كه‌سه‌ی حكومه‌ته‌كان یاخود كۆمپانیاكان نه‌توانن به‌ ئاسانی هه‌ڵیبژێرن‌و هاوكاریی له‌گه‌ڵدا بكه‌ن، ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ هۆكاری بوونی له‌ نمایشكردنی خه‌ڵكه‌ فه‌رامۆشكراوه‌كان‌و ئه‌و مه‌سه‌لانه‌دایه‌ كه‌ هه‌میشه‌ پشتگوێخراون یاخود گسكدراون‌و له‌ ژێر فه‌رشدا شارراونه‌ته‌وه‌.

ڕۆشنبیر، پشتئه‌ستوور به‌ پرنسیپی گشتیی هه‌مه‌لایه‌ن ئه‌و ڕۆڵه‌ ده‌گێڕێت كه‌ ده‌ڵێت: پێویسته‌ مرۆڤه‌كان سه‌باره‌ت به‌ ئازادی‌و دادپه‌روه‌ری به‌پێی پێوانه‌گه‌لی ئاكاریی شیاو له‌لایه‌ن هێزه‌ جیهانی یان ناسیونالیسته‌كانه‌وه‌ مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵ بكرێت‌و ده‌بێت ده‌ستدرێژیكردنی ئه‌نقه‌ست‌و نائه‌نقه‌ست بۆ سه‌ر ئه‌و پێوانانه‌ ڕیسوابكرێت‌و بوێرانه‌ دژایه‌تی بكرێت.

ڕێگه‌م بده‌ن ئه‌و ئاخاوتنه‌ به‌م ده‌سته‌واژه‌ تاكه‌كه‌سیانه‌ ده‌ربڕم: من وه‌ك ڕۆشنبیرێك خولیاو خه‌مه‌كانی خۆم له‌به‌رده‌م جه‌ماوه‌رێكی دیاریكراودا ده‌خه‌مه‌ڕوو. لێره‌دا مه‌سه‌له‌كه‌ په‌یوه‌ندیی به‌ جۆری ده‌ربڕینی ئه‌و خولیاو خه‌مانه‌وه‌ نییه‌، به‌ڵكو په‌یوه‌ندیی به‌وه‌وه‌ هه‌یه‌ كه‌ من نمایشیده‌كه‌م، وه‌ك كه‌سێك كه‌ ده‌یه‌وێت مه‌سه‌له‌ی ئازادی‌و دادپه‌روه‌ری به‌رزڕابگرێت. من بۆیه‌ ئه‌و شتانه‌ ده‌نووسم‌و ده‌رده‌بڕم، چونكه‌ پاش بیركردنه‌وه‌یه‌كی قوڵ بۆم ساخبۆته‌وه‌ ئه‌وانه‌ن كه‌ بڕوام پێیانه‌و حه‌زده‌كه‌م ئه‌وانی دیكه‌ش بهێنمه‌ سه‌ر هه‌مان بیروڕا. كه‌واته‌ ئاوێته‌یه‌كی ته‌واو ئاڵۆزی تایبه‌تی‌و گشتی له‌ جیهانه‌كه‌م، مێژووه‌كه‌م، به‌هاكانم، نووسینه‌كانم‌و هه‌ڵوێسته‌كانمدا هه‌یه‌ كه‌ هه‌ڵقوڵاوی ئه‌زموونی خۆمن. ئه‌مه‌ له‌لایه‌ك، له‌لایه‌كی دیكه‌وه‌ چۆن ده‌كرێت ئه‌و مه‌سه‌لانه‌ ببنه‌ به‌شێك له‌ جیهانی كۆمه‌ڵایه‌تی كه‌ تیایدا خه‌ڵكی گفتوگۆ ده‌رباره‌ی جه‌نگ، ئازادی، دادپه‌روه‌ری ده‌كه‌ن‌و ده‌رباره‌یان بڕیارده‌ده‌ن. كه‌واته‌ شتێك نییه‌ به‌ناوی ڕۆشنبیری تایبه‌ته‌وه‌، چونكه‌ ته‌نیا به‌ تۆماركردنی وشه‌كان‌و چاپكردنیان ئیتر ده‌بنه‌ به‌شێك له‌ جیهانی كۆمه‌ڵایه‌تی. له‌هه‌مان كاتدا ڕۆشنبیرێكی گشتیش به‌ته‌نیا بوونی نییه‌، مه‌به‌ست ئه‌و ڕۆشنبیریه‌ كه‌ ڕۆڵی كه‌سایه‌تی گشتی ده‌گێڕێ یاخود وتبێژه‌



بەناوی مەسەلەیەك، بزووتنەوەیەك و هەڵوێستێكەوەو سمبولە بۆ ئەو شتانە، چونكە هەمیشە ڕەهەندو هەستیاریی تاكەكەسی لەئارادایەو ئەو دوانە مانایەك دەبەخشنە ئەوەی دەوترێ یان دەنووسرێت و كەم بایەخترین شتیش ئەوەیە كە ڕۆشنبیر وا لە جەماوەرەكەی بكات هەست بەئارامیی دەروونی بكەن، چونكە مەسەلەكە بەگشتی دژی ئەوەیەو ئارامهەڵگرەو تەنانەت دڵ ناخۆشكەریشە.

لە كۆتاییدا، ئەوەی سەبارەت بە ڕۆشنبیر بەلامانەوە گرنگە ئەوەیە، ڕۆشنبیر كەسێكی نمایشكارە- واتە كەسێكە بەڕوونی نوێنەری تێڕوانینێكی دیاریكراوەو نمایشگەی ڕوونی ئاشكرا پێشكەش بە جەماوەر دەكات، جا ئاستەنگ و بەربەستییەكان هەرچییەك بن. ئەو بەڵگەیەی لێرەدا داكۆكی لێ دەكەم ئەوەیە، ڕۆشنبیران ئەو تاكانەن كە لە هونەری نمایشكردندا بەهرەدارن، جا ئەوە بە قسەبێت یان نووسین و فێركردن و دەركەوتن لە تەلەفزیۆندا. ئەو بەهرەیە ئەوەندە گرنگە كە خەڵكی جیایدەكەنەوە، هاوكاتیش چەندین بەرپرسیارێتی، مەترسی، ڕاشكاوبوون و ئەگەری ڕووبەڕووبوونەوەی هێرش و ڕەخنەلێگرتن لەخۆدەگرێت. ئەوەی كاتی خوێندنەوەی (ژان پۆل سارتەر) و (بیرتراند راسل) جێپەنجە یان ئیمپرێشنم لا جێدەهێڵێ، دەنگی تاكەكەسیی هەریەكێكیانە كە زۆر ئامادەیەو تایبەتمەندە نەك ئەو بەڵگانەی دەیهێننەوە، چونكە ئەوان لە بڕوای تاكەكەسیی خۆیانەوە دێنەئاخاوتن. لێرەشدا نابێت دەنگیان لەگەڵ دەنگی فەرمانبەرێكی بیروكراتیی نادیاردا تێكەڵ بكەین كە زۆر وریایە لەئاخاوتندا.

لە گەرمەی بڵاوبوونەوەی بەربڵاوی لێكۆڵینەوەكاندا سەبارەت بە ڕۆشنبیران، "توێژەران" بایەخێكی زۆریان بە پێناسەكردنی ڕۆشنبیر دەدا، كەچی شتی زۆر دەربارەی دیمەنی ڕۆشنبیرو چاوەڕوانیكردنی جیاكارەی و خۆهەڵقورتاندن و تاوانباركردنی بكەرەكانی "ژیان" دەرنەبڕرا، ئەو شتانەی پێكەوە بناغەی ژیان بۆ هەر ڕۆشنبیرێكی ڕاستەقینە پێكدێنن. (ئەشعیا بیرلین) سەبارەت بە نووسەرانی ڕووسی سەدەی نۆزدەیەم دەڵێت: جەماوەری ئەوانە تاڕادەیەك لەژێر كاریگەریی ڕۆمانسیەتی ئەڵمانیدا بوون و ئەوانیش لەسەر شانۆ ڕادەوەستان بۆ ئەوەی لەبەردەمی خەڵكدا (حەقیقەت) بخەنەڕوو[8]. بەبڕوای من، هێشتا شتێكی لەو جۆرە پەیوەندیی بە ڕۆڵی جەماوەریی ڕۆشنبیرەوە هەیە. لەبەر ئەم هۆیەش كاتێك باسی ڕۆشنبیرێكی وەك (سارتەر) دەكەین، شێوازی تاكەكەسیی جیاكارەی لە ئاخاوتن و ئاكاردا، هەستكردنی بە گرەوكردنی تاكەكەسیی گرنگی خۆی، كۆششی ڕەهای، سەرچڵیبوونی و خواستی وتنی گەلێك شت دەربارەی كۆلۆنیالیزم، دەروەستبوون و ململانێی كۆمەڵایەتی دێتەوە یادمان، ئەوەی بوە هۆی توڕەبوونی نەیارەكانی و خرۆشانی هاوڕێكانی و دواتریش بوە هۆكاری شڵەژانی خودی خۆیشی.

كاتێك ئێمە دەربارەی پەیوەندیی (سارتەر) لەگەڵ (سیمۆن دوبۆڤار) و گفتوگۆ فیكرییەكانی لەگەڵ (كامۆ) و هاوڕێیەتی ڕیزپەڕی لەتەك (جان جینیە) دەخوێنینەوە، یەكسەر پێگەی (سارتەر) لەناو هەلومەرجی خۆیدا دیاریدەكەین. (سارتەر) وتەنی لەناو ئەو هەلومەرجەو تاڕادەیەك بەهۆی ئەو هەلومەرجەوە (سارتەر) بۆتە (سارتەر)، ئەو كەسەی دژی بوونی فەڕەنسا بوو لە جەزائیر و ڤێتنام. بەبێ




ئەوەی مەبەستمان بێت بە پەککەوتەیی ڕۆشنبیری تاوانباری بکەین یاخود لە بایەخی وەك ڕۆشنبیرێك کەم بکەینەوە، هەموو ئەو توخمە ئاڵۆزانە جۆرێك شڵەژانیان بەخشییە (سارتەر)و چەنراوێکی جیاکارەیان داوەتە وتەکانیو دەریانخستوە مرۆڤێکە بەدوورنییە لە هەڵە، نەك ئامۆڤگارێکی ئەخلاقی وروژێنەری دڕندەییو خەمۆکی.

لە ژیانی گشتیی نوێدا، کە دەشێت وەك ڕۆمانێك یان شانۆیەك تێی بڕوانین، نەك کارێك ئەنجامبدرێت یاخود کەرەستەیەکی خاو بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسی، دەتوانین یەکسەر ئەوە ببینینو دەرك بەوە بکەین کە ڕۆشنبیران تەنیا نمایشکاری بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی نهێنی یان ئاشکرای فراوان نین، بەڵکو وێڕای ئەوە نمایشکاری شێوازێکی ژیانن کە دڵەڕاوکێ بەخشەو کارڕاییکردنێکی کۆمەڵایەتی دانسقەی تایبەت بەخۆیانن، هەر پێگەیەکیش بۆ یەکەمین جار ئەو ڕۆڵەی تێدا بەدیبکرێت، چاکترە لەو ڕۆمانە نائاساییانەی لە سەدەی نۆزدەیەمو سەرەتای سەدەی بیستەمدا نووسراون: "باوکەکانو کوڕەکان"ی (تۆرژنیڤ)، "پەروەردەی سۆزداری"ی (فلوپیر)، "وێنەی هونەرمەند لەتافی لاویدا"ی (جریس)، کاتێك نمایشکردنی واقیعی کۆمەڵایەتی دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوەو لەوانەیە بەهۆی دەرکەوتنی کتوپڕی یاریکەری نوێوە (ڕۆشنبیری نوێی گەنج) بڕیاردەرانە گۆڕانی بەسەردا بێت.

باسکردنی (تۆرژنیڤ) دەربارەی ڕووسیای خاوەن خەسڵەتی ناوچەیی لە شەستەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، باسکردنێکی شوانکارانەی هەژارە لە ڕووی ڕووداوەوە، پیاوگەلی گەنجی موڵکدار نەریتی ژیان لە باوکەکانەوە وەردەگرن، خێزان پێکدێننو منداڵ دەخەنەوە.. ژیان بەو شێوەیە بەردەوام دەبێت هەتاکو کەسێکی ئاژەوەگێڕو ئێسك قورسی وەك (بازارۆف) لە ژیانیاندا دەردەکەوێت. یەکەمین خەسڵەت کە بەهۆیەوە دەرك بە ئاژاوەگێڕیی (بازارۆف) دەکرێت ئەوەیە کە پەیوەندیی لەگەڵ دایكو باوکی خۆی پچڕاندوە، لەبری ئەوەی کوڕێك بێت، خۆی خۆی دروستکردوەو دژی ڕۆتینەو بەتوندی هێرشدەکاتە سەر ئاساییو بیروڕاو فۆڕمە بێزراوەکانو جەغت لەسەر بەها زانستییە نوێیە ناسۆزکارەکان دەکاتەوە کە ئەقڵانیو پێشکەوتوو خۆدەنوێنن. (تۆرژنیڤ) دەڵێت ئەوەی ڕەتکردۆتەوە کەسێتی (بازارۆف) لە شۆربادا نقومبکاتو مەبەستی بوە کەسێتییەکی "بێشەرم، دڵڕەق، وشك، بەزەبروزەنگو بێبەزەیی" بێت. (بازارۆف) گاڵتە بە خێزانی (گیرسانۆڤ) دەکات، کاتێك پیرەباب ئاوازێکی (سوبیر) دەژەنێت. (بازارۆف) بەدەنگی بەرز دەداتە قاقای پێکەنینو بیروڕاکانی زانستی مەتریالیستانەی ئەڵمانی دووبارەدەکاتەوە: سروشت بەلای ئەوەوە پەرستگەیەك نییە، بەڵکو تاقیگەیەکی کارکردنە. کاتێکیش دەکەوێتە داوی خۆشەویستیی (ئانا سیرجییڤنا)وە، وزەی ڕۆشنبیریی ئاژاوەگێڕانەی (بازارۆف) کە هیچ بەربەستێکی نییە، دەبێتە مایەی تێکەڵیو شڵەژان. جارێك (ئانا) ئەوە دەردەبڕێت کە بوونی لەگەڵ (بازارۆف)دا وەك جۆلانەکردنە لەسەر کەناری هەڵدێر.

جوانیو سۆزی بەهێزی ڕۆمانەکە لەوەدایە (تۆرژنیڤ) ئەو ناکۆکییەمان بۆ پێشنیاردەکاتو نیشانمانیدەدات کە لەنێوان ڕووسیای فەرمانڕەواییکراو لەلایەن بنەماڵەکانەوەو پێکگەیشتنی خۆشەویستیو سۆزە بنەماییەکانو بەردەوامیی شێوازە سروشتییە کۆنەکانی کارئەنجامدانو نێوان هێزی نەهلستیی خاوەن

سروشــتی زەوتکارانــەی (بـازاروف) کــە مەحاڵــە مێژووی بگێڕدرێتـەوە. ئەوەتا کەسایەتیەکی دیکە بەناوی (بلاقا لایە) لە ڕۆمانەکەدا دەردەکەوێت کە بەرەنگاردەبێتەوە، کەچی کتوپڕ ئەنجامی پەتاگرتن بەهۆی نەخۆشێکەوە، کە چارەسەریدەکات، کۆچی دوایـــی دەکـــات. ئـــەوەی لـــە (بـــازاروف)ەوە وەبیرماندێتەوە، ئەو هێزە ڕووتەیە کە لەلایەن ئەقڵی پرســـیارکارو گومانکـــاری خـــاوەن سروشـــتی بەرەنگاربوونــەوەی قوڵــەوە هێورنابێتــەوە. وێــڕای ئــەوە، (تــۆرژنیڤ) پێیوایــە کەسـێتی (بـازاروف) گونجـاوترین و هاوسـەنگترین کەسـایەتیە، لەگـەڵ میزاجــی خۆیــدا، ئەمــەش تاڕادەیــەك کــە ئــەو کەسایەتیە بەهۆی هێزی ئەقڵیخەمساردی خۆیەوە دەیشـڵەژاندو سەرسـامی دەکـرد، هـەروەك چـۆن کاردانـــەوەی ســـەرنجڕاکێش و توندوتیـــژی خوێندکارەکانی سەرسامی دەکرد.

هەندێك خوێنـەر پێیانوابوو کەسێتی (بازاروف) هێرشکردنە بۆ سەر گەنجان، ئەوانی دیکە ستایشی ئـــەو کەســـایەتیەیان دەکـــردو بەپاڵـــەوانێکی بەکردەوەیان دادەنا، لەکاتێکدا هەندێکی دیکە لەو بڕوایەدابوون (بازاروف) کەسێتییەکی مەترسیدارە. هەســت و ســۆزمان هەرچــۆنێك بێــت بەرامبــەر بــە (بازاروف) وەك کەسێك، ئەوا "باوکەکان و کوڕەکان" ناتوانێــت (بـــازاروف) وەك کەســـایەتیەك لەگـــەڵ گێڕانەوەدا بگونجێنێ، چونکە لەکاتێکدا هاوڕێکانی لە خێزانی (کیرسانۆف)و دایك و باوکی شایستەی بـەزەیی دەتـوانن درێژەبدەنـە ژیـانی خۆیـان، ئـەوا لەخۆباییبوون و بەرەنگاربوونەوەی وەك ڕۆشنبیرێك لەو چیرۆکەی وەدەردەنێن کە پێدەچێت تەبانـەبێت لەگەڵیداو نەکرێت لەناویدا ئارام بگرێت.

ئــەوەو بەشــێوەیەکی ڕوونــتر دۆخــی (ســتیڤن دیـدالۆس)ی گەنجە لـە ڕۆمانەکـەی (جـریس)دا کـە تێکـڕای ڕەوتـی سـەرەتای ژیـانی هەڵبەزودابـەزبوو لـەنێوان مـەراییکردنی دامـەزراوەکانی وەك کڵێسـا و پیشـەی مامۆسـتایی و ناسـیونالیزمی ئێرلەنـدی و خودێکی کەللەڕەق کە بەشێنەیی گەشەدەکات و وەك ڕۆشـنبیرێك دروشمەکـەی بریتییـە لـە وشـەکانی (لوسیڤەر): "بێسوودە".(شیمومی دین) تێبینیەکی زۆرچـاك دەربـارەی "وێنـەی هونەرمەنـد لـە تـافی لاویـدا"ی (جـریس) دەخاتـەڕوو: "یەکـەمین ڕۆمانـە بـەزمانی ئینگلیـزی کـە بەشـێوەیەکی پڕاوپڕ باسـی سۆزی بیرکردنەوە دەکات"[9]. پاڵەوانەکانی (شـارلز دیگنـز، ولیـام سـاکیری، جـین ئۆسـتین، تۆمـاس هاردی و تەنانـەت جۆرج ئیلیۆت)، بە ژن و پیاوەوە لە تافی لاویـدا، بایـەخی سـەرەکیان داوە بە ژیانی ئـــەقڵ لـــە کۆمەڵگـــەدا، کەچـــی بیرکردنـــەوەی (دیـــدالۆس)ی گـــەنج شـــێوازێکی تاقیکردنـــەوەو دۆزینـەوەی ئـەم جیهانـە بـوو. (دیـن) لەسـەر هەقـە، کاتێك دەڵێت: پێش (دیدالۆس) پـەیامی ڕۆشـنبیری لـە ڕۆمـانی ئینگلیزیـدا تـەنیا "خواسـتنی نـامۆی قێزەوەن" بوو، بەڵام (ستیڤن) لەبەرئەوەی تاڕادەیەك گـــەنجێکی گونـــدی و بەرهـــەمی ژینگەیـــەکی کۆڵۆنیالیستانە بـوو، ناچاربوو پێش ئـەوەی ببێتـە هونەرمەنـــد، هۆشمەندییـــەکی ڕۆشـــنبیرانەی بەرگریکارانە بهێنێتەئاراوە.

لـــە کۆتـــایی ڕۆمانەکـــەدا، (جـــریس) ڕەخنـــە ئاڕاستەی خێزان و ئەندامەکانی کۆمەڵەی ئایرلەندی (*Fenians*) دەکـــات و لێیـــان دووردەکەوێتـــەوەو پشتیان تێدەکات، بەهەمان شێوەش ڕەخنـە لـە هـەر پرۆژەیەکی ئایدۆلۆژیانە دەگرێت کە لەدوائەنجامدا دەبێتـــە هـــۆی بەرتەســـککردنەوەی تاکگـــەرایی و کەســـێتی.. وەك (تـــۆرژنیڤ)، (جـــریس) بـــەڕوونی نـاکۆکیی نێـوان ڕۆشـنبیری گـەنج و ڕەوتـی ژیـانی مرۆڤایـەتی پێکـەوە گرێـدراو دیاریـدەکات. ئـەوەی

سەرەتا باسیدەکات، چیرۆکێکی ئاسایی پیاوێکی گەنجە کە لەناو خێزانەکەیدا دەگاتە تەمەنی پێگەیشتن و دەچێتە قوتابخانەو زانکۆ. (ستیڤن) لەرێگەی زنجیرە تێبینییەکی کورتی ناو دەفتەری بیرەوەرییەکانەوە دەگاتە ئەو سەرەنجامەی کە رۆشنبیر رام ناکرێ و لەگەڵ رۆتینی بێزاکەردا ناسازێت. لە بەناوبانگترین برگەی رۆمانەکەدا (ستیڤن)– وەك ئەوەی لەواقیعدا هەیە– بیروباوەڕی رۆشنبیری و بڕوابوونی بەئازادی رادەگەیەنێ، ئەگەرچی زیادەڕۆیی میلۆدرامیانە لە راگەیاندنەکەی (ستیڤن)دا شێوازی (جریس)ە بۆ دابڕینی ئەو بەشەی تایبەتە بە خۆهەڵکێشانی پیاوە گەنجەکەو هەستکردنی بە گرنگیی خۆی: "پێتان دەڵێم چی دەکەم و چی ناکەم، بەردەوام نابم لەسەر خزمەتکردنی ئەوەی بڕوام پێی نەماوە، جا ئەوە ماڵەکەم بێت، زەوییەکەی باووباپیرانم بێت یاخود کڵێساکەم بێت. هەوڵدەدەم بەیەکێك لە شێوازەکانی ژیان یاخود بە هونەرو بەو ئازادییەی دەرەقەتی دێم تەعبیر لەخۆم بکەم، بۆ بەرگریکردن لەخۆیشم تەنیا دەستەکانم بەکاردێنم، هەروەها بێدەنگی، تاراوگە، داهێنان و مەکربازی".

تەنانەت لە "یولسیز"دا دەبینین (ستیڤن) تەنیا پیاوێکی گەنجی کەللەڕەقی شەیدای ئۆپۆزسیۆنبوون نییە، ئەوەی لە بڕوای "ئەم پیاوە گەنجە"دا سەرنجراکێشە، جەختکردنەوەیەتی لەسەر ئازادیی رۆشنبیر، ئەمەش مەسەلەیەکی بنچینەییە بۆ کارکردنی رۆشنبیر.. مەبەست لە چالاکیی رۆشنبیر، چاککردنی هەلومەرجی ئازادی و مەعریفەی مرۆڤانەیە. لەو بڕوایەشدام ئەو مەسەلەیە هەتاکو ئێستاش هەر راستە، وێڕای دووبارەبوونەوەی هێرشکردنە سەر "دەقەکانی ئازادی و رۆشنگەریی پایەبەرز"، وەك ئەوەی فەیلەسووفی هاوچەرخی فەڕەنسی (ژان فرانسوا لیوتار) بانگەشەی بۆ دەکات و دەڵێت ئەو خواستە باڵەوانخوازییانە پەیوەندییان بەسەردەمی پێشووەوە هەیەو لەسەردەمی ئەودیو نوێگەرییەوە هیچ برەوێکیان نەماوە.

بەپێی ئەم رۆمانە، هەڵوێستە خۆماڵییەکان و گەمەکانی زمان جێگەی دەقە پایەدارەکانیان گرتۆتەوە، رۆشنبیری پاش نوێکاری توانا بەهێندەگرێت نەك بەها گەردوونییە هەمەلایەنەکانی وەك حەقیقەت و ئازادی. هەمیشە لەو بڕوایەدابووم کە (لیوتار) و لایەنگرانی دان بە پەککەوتەیی و تەمبەڵی و خەمساردی خۆیاندا دەنێن، زیاتر لەوەی بتوانن هەڵسەنگاندنێکی راست و دروست بخەنەڕوو. بەپێچەوانەی خواستی ئەودیو نوێگەرییەوە، هێشتا رۆشنبیران ژمارەیەکی فراوانی دەرفەتی راستەقینەیان لەبەردەمدایە، چونکە لەڕاستیدا حکومەتەکان هێشتا خەڵکی سەرکوتدەکەن و بەشێوەیەکی ئاشکراو بەرچاو دەیانچەوسێننەوە، بەکردەوەش لەباربردنی مەترسیداری دادپەروەری لەگۆڕێیە، خستنەگەڕی رۆشنبیران و دەمکوتکردنیان هێشتا بەردەوامەو دوورخستنەوەی رۆشنبیران لە گەیاندنی پەیامی خۆیان هێشتا بالادەستە.

لە "پەروەردەی سۆزداری"دا (فلوبێر) دڵشکاوی خۆی بەرامبەر بە رۆشنبیران دەردەبڕێ، ئینجا رەخنەیەکی بێبەزەییانەیان ئاراستەدەکات. رۆمانەکەی (فلوبێر) کە رووداوەکانی لە پاریسی کاتی پشێوییەکانی سالانی (1848–1851)دایەو مێژووناسی بەریتانی بەناوبانگ (لویس نامییر) بەشۆڕشی رۆشنبیران ناویدەبات، پانۆرامایەکی فراوان دەربارەی ژیانی سیاسی و بۆهیمی "پایتەختی سەدەی نۆزدەیەم" دەخاتەڕوو. لە



چەقی ئەم ڕۆمانەدا، دوو گەنجی ناوچەکە (فراریك مور)و (تشارلز دیزلوریێر) ڕاوەستاون کە (فلوپێر) بەهرەکانیان وەك دوو نەوەی شاریی خاوەن ڕۆشنبیرییەکی پایەبەرز بەکاردەبات بۆ تەعبیرکردن لە تووڕەبوونی لە دەستەوستانیان وەك ڕۆشنبیر لەئاست پاراستنی ڕەوتێکی نەگۆڕدا. دەشێت نارەزایی (فلوپێر) بەرامبەریان لەبەر ئەو چاوەڕوانیە زیادەڕۆیانە بووبێت سەبارەت بەوەی دەبێت ببنە چی. سەرەنجام نمایشکردنێکی سەرنجڕاکێشی ئەو ڕۆشنبیرەیە کە بێ قیبلەنما ڕێدەکات. ئەو دوو پیاوە گەنجە وەك دووکەس ژیانیان دەستپێکرد کە دەیانویست ببنە توێژەر لە یاسادا، ڕەخنەگر، مێژووناس، وتارنووس، فەیلەسووف و تیۆریست لە کۆمەڵناسیداو ئامانجیان هێنانەدیی خۆشگوزەرانیی کۆمەڵایەتی بوو بۆ خەڵکی. ڕۆژگار هات و خواستە ڕۆشنبیرییەکانی (مور) چوونەوە خۆیان و لەسەر تەمبەڵیی زەین و پەککەوتەیی دڵی خۆی ڕاهات، کەچی (دیزلوریێر) بوە یەکێك لە بەڕێوەبەرەکانی کۆڵۆنیالیزم لە جەزائیرو سکرتێری یەکێك لە بەگزادەکان و بەڕێوەبەری ڕۆژنامەیەك و وەکیلی ڕێکلامەکان، ئێستاش پارێزەری یەکێکە لە کۆمپانیا پیشەسازییەکان".

تێکشکاندنەکانی ساڵی 1848 بەلای (فلوپێر)ەوە تێکشانی بەرچاوبوون. (فلوپێر) بە دەنگێکی پێغەمبەرانە چارەنووسی (مور)و (دیزلوریێر) بەشڵەژان و سەرسامبوون دەخاتەڕوو کە ئەنجامی لەدەستدانی ویستی چڕو ئەو باجە هاتوونەتە ئاراوە کە کۆمەڵگەی نوێ دەیسەپێنێ بەسەر ڕۆڵەکانیدا. وێڕای ئەوە، ئەنجامی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەکان و ڕیکلام، ناودەرکردنی بەپەلەو جیهانی ئاڵوگۆڕکردن و بڵاوبوونەوەی نەگۆڕ کە تیایدا هەموو بیروڕاکان شیاوی ساختەکردن و گشت بەهاکان شیاوی گۆڕان و هەموو پلەکارەکان تەنیا کۆششکردنن بۆ بەدەستخستنی ئاسانی پارەو هێنانەدیی سەرکەوتنی خێرا. دیمەنە بنچینەییەکانی ڕۆمانەکە، بەشێوەیەکی سمبولی، لەسەر بناغەی پێشبڕکێی ئەسپەکان، سەمای گازینۆکان، ماڵی سۆزانیەکان، شڵەژانەکان، کەرنەڤاڵەکان، فێستیڤاڵەکان و کۆبوونەوە گشتییەکان داڕێژراون و (مور) تیایدا لە هەوڵی ئەوەدایە خۆشەویستی و تێربوونی ڕۆشنبیری دەستەبەربکات، کەچی بەردەوام لە کارەکەدا بەلاڕێدا دەچێت.

(بازارۆف، دیدالۆس و مور) نموونەی کەسانی توندڕەون، بەڵام بەکردەوە خزمەتی ئامانجەکە دەکەن، ئەمەش ئەو مەسەلەیەیە کە ڕۆمانە پانۆرامییە واقعیەکانی سەدەی نۆزدەیەم توانیان بەشێوەیەکی بێوێنە جێبەجێی بکەن، ئەوەش لە ڕێگەی خستنەڕووی ڕۆشنبیران لە دۆخی کارکردنێکدا کە گەمارۆدراوبوو بە گەلێك گرفت و هەڵخڕاندن، جا یان بانگەوازی ناوەکیان دەپاراست، یاخود خیانەتیان لەو بانگەوازە دەکرد، نەك وەك ئەرکێکی نەگۆڕ کە دەبێت یەکسەرو هەتاهەتایە فێری ببن، بەڵکو وەك ئەزموونێکی هەستپێکراو کە خودی ژیانی نوێ هەڕەشەیەکی نەگۆڕە بۆی.

مەبەست لەو نمایشکردنانەی تایبەتن بە ڕۆشنبیر، واتە ڕوونکردنەوەی مەسەلەیەك یان بیرۆکەیەکی دیاریکراوو پێشکەشکردنی بە کۆمەڵگە، قایمکردنی من یان ئاهەنگگێڕان نییە بەبۆنەی هەڵخڕاندنە کۆمەڵایەتیەکانیەوەو بەشێوەیەکی بنچینەییش مەبەستی خزمەتکردنی دامودەزگاکانی دەسەڵاتی بیروکراتیانەو فەرمانبەرە بەخشندەکان نییە. نمایشکردنەکانی ڕۆشنبیر خودی ئەو چالاکیەیە کە پشت بەیەکێك لە

شێوازەکانی هۆشمەندی دەبەستێت کە خاوەن سروشتێکی گومانکارانەی خۆهەڵقورتێنەو بێ دابڕان دەروەستە بە توێژینەوەی ئەقڵانیو داوەریکردنی ئەخلاقییەوە. ئەمەش مەسەلەیەکە دەبێتە هۆی تۆمارکردنی ناوی کەسەکە. لێرەشدا سنووری جیاکەرەوە، زانینی چۆنیەتی بەکارهێنانی زمانە بەشێوەیەکی چاكو چۆنیەتی دەستوەردانە لە زمان، کە دوو ڕواڵەتی جەوهەریی کاری ڕۆشنبیرین.

ئەی لە ڕۆژگاری ئیمڕۆماندا ڕۆشنبیر نمایشی چی دەکات؟ یەکێك لە باشترینو سەرڕاستترین وەڵامەکان بۆ ئەم پرسیارە ئەوەیە کە کۆمەڵناسی ئەمریکی (سی رایت میلز) دەیداتەوە کە ڕۆشنبیرێکی تەواو سەربەخۆیەو نمایشی تێڕوانینێکی کۆمەڵایەتی پڕ هەستو سۆز دەکاتو توانایەکی سەرنجڕاکێشی هەیە بۆ گەیاندنی بیروڕاکانی خۆی لەڕێگەی پەخشانێکی ڕاستەوخۆی ڕاشکاوەوە کە دەتوانێت بەهێزەوە خۆی بسەپێنێ. (میلز) ساڵی 1944 نووسیویەتی: "ڕۆشنبیرە سەربەخۆکان یان ئەنجامی پەراوێزبوون ڕووبەڕووی جۆرێك لە هەستکردن بە نائومێدیو پەککەوتەیی دەبنەوە، یان دەچنە ناو دامەزراوو کۆمپانیاو حکومەتەکانەوەو وەك ئەندامی گرووپگەلی ڕێژەیی بچووك لە ڕووی ئینتیماوە بێ هەستکردن بە بەرپرسیارێتی بڕیارگەلی گرنگ دەردەکەن. لێرەدا بوونی کەسێك بە بەکرێگیراوێکی "هەقدەست وەرگرتوو" لە پیشەسازیی زانیارییەکانیشدا چارەسەرنییە، چونکە بەدەستهێنانی پێکگەیشتن لەگەڵ جەماوەر، وەك ئەوەی (تۆم) لەناو جەماوردا کردی، لەم دۆخەدا مەحاڵە، بەکورتی "ئامرازەکانی بەدەستهێنانی پێکگەیشتنی کاریگەر"، ئەو دراوەی ڕۆشنبیر مامەڵەی پێدەکات، دووچاری زەوتکردن دەبێتو بیریاری سەربەخۆ ڕووبەڕووی تاکە ئەرکێکی مەزن دەکاتەوە کە (میلز) بەم وشانە دەریدەبڕێت:

هونەرمەندو ڕۆشنبیری سەربەخۆ دوانن لەو کەسایەتیە کەمانەی ماونو توانای بەرگریکردنو کۆششکردنیان هەیە دژی پڕۆسەی ڕۆتینکردنی شتە ڕەسەنەکانو دواتریش مردنیان. ئێستا دەرککردنی نوێی زیندوو بریتیە لە توانای دەمامك هەڵدانەوە لە ڕووی شێوازە ڕۆتینیە لە قاڵبدراوەکانی تێڕوانینو ئەقڵو وردوخاشکردنی ئەو شێوازانەی ئامڕازە نوێکانی پێکگەیشتن "واتە سیستەمە نوێکانی نمایشکردن" بەهۆیانەوە بڵاوەمان پێ دەکەن. ئەم پێگانەی هونەری جەماوەریو بیرکردنەوەی جەماوەریش هەمیشە بۆ خزمەتکردنی پێداویستیەکانی سیاسەت دەگونجێنرێن. بۆیە پێویستە هاوکاریو کۆششی ڕۆشنبیر لە چوارچێوەی سیاسەتدا چڕبکرێتەوە، چونکە ئەگەر بیریار خۆی نەبەستێتەوە بە بەهای حەقیقەت لە ململانێی سیاسیدا، ئەوا ناتوانێت لەئاست تێکڕای ئەزموونی زیندوودا بێت".

ئەم پەرەگرافە پێویستی بە خوێندنەوەو سەرلەنوێ خوێندنەوە هەیەو پڕیەتی لە چەندین پێگەو دیمەنو جەغتکردنەوە ڕێنمایکارە پڕ بایەخەکان. سیاسەت لە هەموو جێگەیەك هەیەو دەرفەتی هەڵهاتن بۆ جیهانەکانی هونەرو فیکری ڕووت لەئارادانییەو لەبەرهەمان هۆش هەڵهاتن بۆ جیهانی بابەتیبوونی خەمسارد یان جیهانی تیۆریی لوتبەرزانە مەحاڵە. ڕۆشنبیرەکان کوڕی ڕۆژگاری خۆیانو سیاسەتی گشتی ڕێکیان دەخات بۆ ئەو نمایشکردنانەی پیشەسازی یان ڕاگەیاندنی جەماوەری لەخۆیان دەگرێتو دەتوانن خۆڕاگرن بەرامبەر بە هەموو ئەوانە، ئەوەش لە ڕێگەی

بەدرۆخستنەوەی وێنەو گێڕانەوە ڕەسمییەکانو بەهانەکانی دەسەڵاتەوە کە بەشێوەیەکی برەوسەندوو بەهۆی ئامڕازەکانی ڕاگەیاندنی جەماوەرییەوە دابەشدەکرێن– نەك هەر تەنیا بەهۆی ئامڕازەکانی ڕاگەیاندنەوە، بەڵکو لەڕێگەی چەندین ئاقاری هەمەلایەنی فیکرەوە کە کاردەکات بۆ پاراستنی دۆخی دامەزراوو بوونی شتەکان لە ڕوانگەیەکەوە بۆ واقیع دەپارێزرێت کە قبوڵکراوو مۆرکراوە– ئەمەش بەدەستەبەرکردنی ئەوەی (میلز) ناویدەنێت پڕۆسەی دەمامك لە ڕوو هەڵماڵین یاخود دابینکردنی کۆپیی ئەڵتەرناتیڤ کە ڕۆشنبیران دەتوانن بەپێی توانا حەقیقەت دەربڕن.

چەند سەخت بوو کاتی دوایین جەنگی کەنداو دژی عیراق وەبیر هاوڵاتیانی بهێنینەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکان هێزێکی بێتاوان یان تاوانبارنەکراو نییە– "خێرا داگیرکردنی ڤێتنامو پەنەما لەلایەن بڕیارسازەکانەوە لەبیرکرا"–و جگە لەخۆی هیچ کەسێك بەپۆلیسی جیهانی هەڵنەبژاردوە. پێموایە ئەوە ئەرکی ڕۆشنبیرەکان بوو لەو کاتەدا، واتە دەبوایە تەپوتۆزیان لە گەردەنی ئەو شتانە بکردایەتەوە کە لەبیرکرابوونو پەیوەندیی نێوان ئەو شتانەیان بدۆزیبایەتەوە کە بوونی پەیوەندیی لەنێوانیاندا ڕەتکراوەبوو، ئەوەشیان دەربریبایە کە ئاڕاستەی ئەڵتەرناتیڤی کارکردن لەئارادابوو و دەکرا ڕێگە لە جەنگو مەبەستەکانی (وێرانکردنی مرۆڤ) بگیرێت.

خاڵی سەرەکی لە دەقەکەی (سی رایت میلز)دا، ناکۆکییە لەنێوان جەماوەریو تاکەکەسیدا. ناکۆکیی ڕەگداکوتاو هەیە لەنێوان دەسەڵاتەکانی ڕێکخراوە قەبەکان– لە حکومەتەکانەوە بیگرە تا دەگاتە کۆمپانیاکان–و ئەو لاوازییە ڕێژەییەی تەنیا تاکەکان ناگرێتەوە، بەڵکو ئەو مرۆڤانەش دەگرێتەوە کە پایەیەکی لاوەکی پاشکۆیانەیان هەیە لەگەڵ کەمایەتیەکان، مرۆڤە بچووکەکان، دەوڵەتە بچووکەکانو ڕۆشنبیریو ڕەگەزە ژێردەستەکانو پلە نزمەکان. گومانم نییە ڕۆشنبیر سەر بەهەمان ئەو پۆلەیە کە لاوازەکانو نوێنەرایەتی نەکراوەکانی تێدایە.

"ڕۆشنبیر"–وەك هەندێك دەریدەبڕن– کەسێکە بە (ڕۆبن هود) دەچێت، بەڵام خۆ ئەو ڕۆڵە ئاسان نییە، هەروەها ئاسانیش نییە ڕەتکرێتەوەو پشتی تێ بکرێت، بەوپێیەی بڕوایەکی ڕۆمانسیانەی ئایدیالیستانەیە. لەواقیعداو بەپێی تێگەیشتنی خۆم بۆ وشەکە، ڕۆشنبیر کەسێك نییە خواستی ئارامکردنەوەی دۆخەکانی هەبێتو جێگیرکەری کۆدەنگیش نییە، بەڵکو کەسێکە هەموو بوونی خۆی دەخاتە خزمەتی هەستی ڕەخنەگرانەوە، ئەو هەستەی هانیدەدات قاڵبە ئاسانەکان، بیروڕا ئامادەکراوەکانو ئەو بەڵگە نەرمە گونجاوانە قبوڵ نەکات کە لایەنە بەهێز یان تەقلیدییەکان دەریدەبڕن. ئەوەی ئەو دەیکات ناڕەزایی دەربڕینی نێگەتیڤانە نییە، بەڵکو ئامادەکاریی چالاکانەیە بۆ وتنی هەموو ئەوانە بەبەرچاوی هەموانەوە.

مەسەلەکە هەمیشە دەربارەی ڕەخنەگرتن نییە لە سیاسەتەکانی حکومەت، بەڵکو بیرکردنەوەیە لە پەیامی ڕۆشنبیر وەك پارێزەری دۆخێکی وریایی بەردەوامو ئامادەباشی نەگۆڕ بۆ ڕێگەنەدان بەوەی نیمچە حەقیقەت یاخود ئەو بیروڕایانەی دان بە ڕاستیاندا نراوە ئاڕاستەی هیچ کەسێك بکات "لە ژیانیدا".

ئەوەی لەم پەیامەدا هەیە، واقعیەتێکی ڕەگداکوتاو و وزەیەکی ئەقڵانی.. و ململانێیەکی ئاڵۆزە بۆ خولقاندنی هاوسەنگییەك لە نێوان کێشەکانی مرۆڤدا کە بریتیە لە پێداویستیەکانی

بڵاوکردنـــەوەو باســـکردن دەربـــارەی لـــە کایـــەی کۆمەڵایەتیـــدا. ئەمـــەش وادەکـــات کۆششـــێکی هەتاهـەتایی لەپچڕان نـەهاتوو بێت، کۆششـێك کـە بەپێویســت کـامڵ نابێـتو ناگاتــە پلــەی کــەماڵ، ســـەرەڕای ئـــەوە ئـــەو چـــالاکیو ئالۆزییانـــەی لەخۆیـدەگرێت، بـەلای منـەوە دەوڵەمەنـدترین شـتی ناو پەیامەکەیە، ئەگەرچی نابێتە هۆی ناودەرکردنی کەسەکە بەشێوەیەکی تایبەتی.

**هێمایەك:**

ئەمە یەکـەمین وانـەی شـەش وانەیە کـە (ئیدوارد سـەعید) لـە دەزگـای ڕادیـۆی بەریتانیـەوە بـەناوی "وانـــەکانی ریـــس" پێشکەشـــیکردوە. ئەوانـــەش کۆمەڵە وانەیەکن ساڵانە یەکێك لە ناودارانی فیکرو ڕۆشــنبیری بەگشــتی پێشکەشــیدەکەن. ئیــدوارد ســـەعید ئـــەو وانانـــەی لـــەژێر ناونیشـــانی "نمایشکردنەکانی ڕۆشنبیر"دا بڵاوکردۆتەوە:

***Edward Said: representations of Intellectual, London- Vintage 1994.***

## پەراوێزەکان

1-ئـــەنتۆنیۆ گرامشـــی، دەفتـــەرەکانی زینـــدان، هەڵبژاردەکان:

***Antonio Gramsci the prison notebooks selections, trans. Quintin Ilioarc and gcoffrey nowell-smith(lod – on lawrence and wishart1973)***

2-لیان بندا، خیانەتکردنی ڕۆشنبیران:

***Lien Bemda, the Itreason of Intellectuals, trans Richard Aldingon (London nortin 1973.***

*پلاتینەکان: دوو هەرێمی ئەڵمانین کە هەریەکێکیان لە ســەردەمی ئیمپراتۆریــەتی پــیرۆزدا میرێکــی پلاتــینی فەرمانڕەواییدەکرد.(وەرگێڕ)

***Newspeak** شێوازێکی زمانی ئینگلیزییە کـە جـۆرج ئۆرویـل لـە کتێبـی "1984"دا باسـیکردوەو ئـەنجامی کورتکردنـەوەی پێکهاتـەکانی بـۆ لانی کـەمی گونجـاوو پێکهێنانی وشەگەلی زۆر ناشرینی خاڵی لە سۆز گەشەی بـەو زمانـە داوە، بـەجۆرێك کـە لەگەڵیـدا ئـەدەبو فیکـر مەحاڵــە هــەبن. ئــەم واتایــە دادەبڕێــت بەســەر هــەر شێوازێکی هاوشێوەدا. (و. عەرەبی)

3-هەمان سەرچاوەی پێشوو ل.52

4-ســـاڵی 1762 بازرگـــانێکی پرۆتســـتانتی (جـــان کالائـاس) لـە تۆلـۆن دادگـاییکراو بـەتاوانی کوشـتنی کوڕەکەی کە ویستویەتی ببێتە کاتۆلیك لەسێدارەدراوە. بەڵگەکـەی لـە دژی بـوو بێبناغـە بـوو، بـەڵام بـەخێرایی دادگـــاییکردنی دەگەڕێتـــەوەی بـــۆ ئـــەو بـــڕوا بـــاوەی پرۆتســـتانتییەت دەمـــارگیرەو زوو و بەئاســـانی بڕیـــاری کوشـــتنی ئـــەو پرۆنســـتانتانە دەدات کـــە پشـــتدەکاتە ئاینەکـــەی خـــۆی. ڤـــۆلتێر هەڵمـــەتێکی میللـــی سەرکەوتووی بۆ چاککردنی ناوبانگی بنەماڵەی کالائاس بەرپاکرد (ئەگەرچی ئێستا دەزانین ڤۆلتێر خۆی بەڵگەی بۆ بێتاوان دەرکردنی جان کالائاس داهێناوە).

مۆریس باریـیە نـەیارێکی دژی ئەلفرید درایفۆس بـوو. باریـیە ڕۆماننوسـێکی فەڕەنسـی بـوو یـەکێك بـوو لـە یەکـــەمین بانگەشـــەکارانی بیروبـــاوەڕی فاشـــیزمو دژی ڕۆشنبیران بوو. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمو سەرەتای سەدەی بیستەمدا ژیاوەو داکۆکی لە بیرۆکەی نائاگایی سیاسی کردوە بەو مانایەی کە چەندین ڕەگەزو میللەت بەگشتی هەڵگری بیروڕاو مەیلی بەکۆمەڵ دەبن.

5-ساڵی 1946 جـارێکی دیکـە برنـارد گراسیە کتێبـی "خیانەتکردنی ڕۆشنبیران"ی چاپکردۆتەوە.

6-ئـالڤین گۆڵدنـەر، داهـاتووی ڕۆشـنبیرانو ڕابـوونی چینێکی نوێ:

***Alvin W Gouldner, the Future of intellectuals and the rise of new class (New York Scabury press 1979).***

**7–میشـیڵ فۆكـۆ، هێز/مەعریفـە. گفتوگـۆی هەڵبـژاردەو نووســینی دیكــە 1972–1977 ئامــادەكردنی كــۆلین گۆردون:**

***Michel Foucault, Power/Knowledge, selected in tericws and other, writing 1972-1977 ed. Colivn.***

**8–ئەشعیا بیرلین، بیریارانی ڕووس:**

***Isaiah Berlin, Russian Thinkers, ed Ilienry Liardy and Ailleen Kell (London Penguin 1980).***

**9–شـیموس دیـن، بوژانـەوەی سـیلتك، چـەند وتارێـك لەبارەی ئەدەبی ئێرلەندییەوە:**

***Seamus Dwane, Celtic Revivals, Lssats in Modern Irish Literature 1880 (London Faber 1985) pp75-76.***

## سەرچاوە

**گۆڤاری "نزوی"، ژمارە 3 حوزەیرانی 1995.**

**لە سایدی گۆڤارەكە وەرگیراوە.**

# ئەدۆنیس دامەزرێنەری هونەری شیعری عەرەبی

**ئیدوارد سەعید**

**لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد**




**کاتێك قسە لە بارەی ئەدۆنیس دەکەین، قسە لە بارەی شاعیرێکی گەورە و ناوازە دەکەین، زۆربەی رەخنەگران ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەم شاعیرە رێبەری شیعری هاوچەرخە و توانیویەتی رێبەرایەتیی بزوتنەوە پێشڕەوییەکەی بکات. ئەوەیشی کە ئەمەی بۆ فەراهەم هێناوە تواناییەکی زمانەوانیی دەگمەن و ویژدانە رەسەنەکەیەتی. بەو جۆرە ئەدۆنیس بوو بە دامەزرێنەری هونەری شیعری عەرەبی بە ستایلێك کە ماوەیەکی درێژە لەو چەشنە ستایلە سەری هەڵنەداوە.**

**ئەوەی دەمەوێ ئاماژەی پێ بکەم بریتییە لە ئەدۆنیس بە سیفەتی ئەوەی بە پلەی یەکەم دیاردەیەکی رۆشنبیرییە، بە هیچ جۆرێکیش نامەوێ بەرهەمە شیعرییەکانی فەرامۆش بکەم، بەڵکو دەمەوێ ئەزموونەکەی بخەمە سیاقی زەمەنەکەی خۆی و هەروەها سیاقی ئەو کۆمەڵگایەی کە تیایدا کەسایەتییەکی کەم وێنە و جیاواز بوو. هیوادارم لێرەدا تەنها وەکو پرۆفیسۆرێك بیرم لێنەکەنەوە کە دەرفەتی رێنوێنیکردنی جەماوەرێکی گوێڕایەڵ بۆ قسەکردن فەرامۆش ناکات، بەڵکو وەکو خوێنەرێکی ئەدۆنیس**

بیرم لێبکرێتەوە کە هیواخوازە دان بەو قەرزە گەورەیەدا بنێت کە عەرەب و خوێنەرانی شیعر و رەخنەیش قەرزار بین.

لەو کتێبەدا کە وەکو تێزی دکتۆرا پێشکەشی کردووە "ستاتیك و دینامیك" (الثابت و المتحول)، ئەدۆنیس لە دوو تەوژمی گەورەی کولتوری ئیسلامی دەدوێت و بەدیاریکراویش لە رۆشنبیریی عەرەبیدا. تەوژمی یەکەم ناو دەنێت کولتوری خەلیفە: ئەمە رۆشنبیریی رەسمییە کە تەنها بەهێز رێك ناخرێت بەڵکو دەسەڵاتیش رۆڵی لەبەرەسمیکردنی ئەو رۆشنبیرییەدا دەبێت، هەروەها بە خوێندنەوەیەکەوە کە بە تەواوی خۆی بەرابردوو و کەلەپوورەوە بەستبێتەوە، لێرەدا دامەزراوە ئابووری و سیاسی و ئاینییەکان پشتگیریی ئەو رۆشنبیرییە رەسمییە دەکەن، ئەم رۆشنبیرییە بەر لە هەر شتێکی تر پابەندە بە کۆمەڵێ مانای جێگیر و ستاتیك کە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە و ئەدۆنیس ئەمە ناو دەنێت "ستاتیك" واتە (الثابت) هەروەك لە ناونیشانی کتێبەکەیدا بەکاری هێناوە.

ئەوەی لە رووی دیالێکتیکییەوە پێچەوانەی یان دژی ئەم تەوژمەیە، بریتییە لە رۆشنبیریی داهێنان و یاخیبوون و سەرلەنوێ تەئویلکردنەوە و بنیاتنان و بەرگری و هەمەرەنگی. لێرەوە کولتوری چینە نارەسمییەکانی خوارەوە داهات، کولتوری خەواریج و سوفییەکان، ئەمە لە راستیدا زیندەگیی کولتوری عەرەبی ئیسلامیی بەرجەستە دەکرد، ئەگەرچی ئەمە، وەك ئەدۆنیس دەریدەخات، بریتی بوو لە چەشنێك لە بێباوەری و ئانارشیزم و رووخێنەر بەشێوەیەکی قووڵ و بە هەستێکی گەورەوە بەرامبەر بە سروشت. ناتەبایی نێوان ئەو دوو تەوژمە، بەشێوەیەکی تراژیدی (و لەوانەیە بەشێوەیەك کە ناشێت فەرامۆش بکرێت)، لە جەنگی نێوان ئێران و عێراقدا دەرکەوت.

لێکۆڵینەوەی ئەدۆنیس بۆ ئەو دوو تەوژمە، زۆر گرنگە بە تایبەتی سەبارەت بە خۆی وەکو خوێنەرێکی کەلەپوری ئیسلامی و وەکو سەرلەنوێ تەئویلکردنەوەی ئەو کەلەپورە و هەروەها وەکو کەسێك کە بەشێوەیەکی داهێنەرانە تیایدا دەژی. سەرەتا تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەدۆنیس هاوپەیمانی تەوژمی دووەمە، واتە تەوژمی رۆشنبیریی روخێنەری نارەسمی و داهێنان و تەئویلی خەیاڵامێز. بەڵام ئەگەر تەنها لەم ئاستەدا بوەستین ئەوا خاڵێکی سەرەکیمان لە دەست دەچێت، ئەویش: ئەدۆنیس لە هەموو شوێنێکدا ئەو بابەتە یەکالا دەکاتەوە کە چۆن بەهۆی رۆشنبیرییەکەی ترەوە (واتە رۆشنبیریی خولەفاکان)، رۆشنبیریی داهێنان و گۆرانکاریی شۆرشگێرانە دێتە ئاراوە. ئەوەی لێرەدا گرنگە بریتییە لە دیالێکتیکی نێوان دژەکان، نەك تەنها پێداگرتن لەسەر گۆران و لە پێناوی شۆرشدا.

مومکین نییە، کاتێك بیر لە ئەدۆنیس دەکەینەوە، بەشێوەیەکی پێویست جەخت لەمە بکرێت. پێمان دەڵێت بۆچی، بۆ نموونە ئەو هەستی بەوە کردووە کە زۆر گرنگە وەکو شاعیرێك سەرانسەری کەلەپوری عەرەبی ئیسلامی بخوێنێتەوە، بە رێگەی تایبەتیی خۆی خوێندنەوەی بۆ ئەنجام بدات و بەشە جیاوازەکانی ببینێت و ئەزموونیان بکات سا لێکدی دوور بن یان هاوشێوە و هاورەگەز بن. ئەمە کۆششی قەبە و قارەمانانەی ئەو شاعیرە شیدەکاتەوە کە هەوڵی داوە ژمارەیەکی گەورەی تێکستی ئیسلامی لە ئەرشیف و قوتابخانەکاندا رزگار بکات، پاشان سەر

لەنوێ هەموو ئەو تێکستانەی خوێندۆتەوە بەڵام بە شێوازێکی زیندوو و کراوە. ئەم جۆرە خوێندنەوەیەی شاعیر پێمان دەڵێت تا چ پلەیەك ئەدۆنیسی پێشڕەو شارەزا بووە تیایدا بە چەشنێك کە ئەگەر شاعیرێکی کەمدەست و کاڵفام بوایە ئەوا بەنەزانی و بەناچیزەیی تووڕی دەدا.

کەواتە ئەدۆنیس شاعیرێکە رۆشنبیرییەکی قووڵی هەیە، شیعرەکانی ئیمرولقەیس و ئەبوعەلای مەعەری و موتەنەبی و شیعری ژمارەیەك لە شاعیرە نوێخوازەکانی بەچاکی خوێندۆتەوە. لێرەدا لە نێو شاعیرانی عەرەبدا چەند شاعیرێکی کەم هەن کە فۆرمی قەسیدەیان بەشێوەیەکی کاملْ وەرگرتووە و شارەزای بوون، یەکێ لەوانە ئەدۆنیسی شاعیرە. بەڵام لە هەموو ئەو شتانەی دەیاننوسێت شڵەژانێك لە نێوان ئەو شتەدا هەیە کە بە میرات ماوەتەوە و نێوان ئەوەی بە نوێ دادەنرێت، واتە شڵەژانێك لە نێوان بە میرات بۆماوەو داهێناندا، ئەم شڵەژانە یاخود ئەم شیپرزەییە بەشێوەیەکی داهێنەرانە بەردەوام تازە دەکرێتەوە و بەرهەم دەهێنرێتەوە، وەك چۆن هێرمینوتیکە ئەندێشەییەکان لەکاری تەئویلدا ئەو کارە دەکەن. کەواتە لە ئەدۆنیسدا رابردوو و ئێستا بە نێویەکدا دەچن، ئەم بەنێو یەکداچوون و تێکچڕژانەی نێوان رابردوو ئێستا لە پرۆسەیەکدا دەردەکەوێت کە ئەدۆنیس بە بایەخێکی گەورەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە بە جۆرێك هیچ کەسێك پێش ئەو بەو ئەندازەیە بایەخی بەم مەسەلەیە نەداوە. کەواتە ئەمە ئەدۆنیس دەکات بە پەروەردەکاری شیعریی سەردەمەکەی خۆی. بەڵام ئەدۆنیس، جگە لەمانە، دۆزەرەوەی تازەگەریی عەرەبییە و قسەکەرێکی زۆر زمان پاراو و پەتیی مۆدێرنەیە. هیچ کەسێك ئەوەندەی ئەو پێشوازیی لە شاعیرە نوێیەکان و بیرە تازە و وروژێنەرەکان نەکردووە. لەبەرامبەر کۆمەڵێك نووسەری هاوچەرخی خۆیدا -لەوانە منیش- دەرگاکانی گۆڤاری "مواقف"ی بۆکردنەوە. ئەدۆنیس بایەخی بەدەوروبەری خۆی دەدا و کەسێکی لاپرەسەن و فزولیبوو، کەسێکی رۆحسوك و هاندەرو لایەنگربوو، هەمیشە کەسێکی پڕ لە زیندەگی بوو. لە ئەدۆنیسی رەخنەگردا، ئەدۆنیسی هاوڕێ و ئەدۆنیسی سەرنووسەری گۆڤاری "مواقف" دەبینین، ئەو گۆڤارەی هەر بەتەنها خۆی دایمەزراند و بەڕێوەی دەبرد، ئەو گۆڤارە وەك پەنجەرەیەك وابوو خزمەتی نووسەری عەرەبی دەکرد بەرەو جیهان، هەروەکو پەنجەرەیەکیش بوو بۆ جیهان تا لەوێوە باشترین بەرهەمەکانی دونیای عەرەبی ببینرێت.

ئەوەی کە درێژەی بەم رۆڵە دەدا شوێنگەی ئەدۆنیس بوو وەك شاعیرێك یان وەك نووسەرێك. ئەدۆنیس کەسایەتی و ژیانی خۆی بە ژیانی رۆشنبیریی نوێ گرێدا کە لە ململانێیەکی بەردەوامدایە بۆ جێهێشتنی رابردوو و خەڵقکردنی ئایندە. دەنگی شیعریی ئەدۆنیس و کەسایەتییە شیعرییەکەی و ملکەچبونی بۆ رەگەزی روخێنەر، ئەمانە کۆمەڵە شتێکن زۆر بە روونی بەوەوە لکاون، ئەمانە بەهۆی وردبینی و لێزانی، لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا گەواهیی گەورەن بۆ ئەدۆنیس، ئەم گەواهییانە باسی ئازاری کەلەپورێکی دێرین و بنجداکوتاو دەکەن و باسی گەندەڵیی نوێ و کۆت و بەندی کۆن و ئازادیی نوێ و داپڵۆسین و بەرەنگاری دەکەن. ئەمانە ئەو رواڵەتە بەرجەستە کراوانەن کە دەبێ بەر لەوەی برمێنرێن بەتەواوی تێیان بگەین، ئەمانە شتگەلێکن دەبێ بەرلەوەی ببن بە شتی تاڵ و خراپ گوێیان لێبگرین، مرۆ سەرکێشییان بۆ نەکات بەر

لەوەی سەقامگیربێن. ئەدۆنیس هەر خۆی بینەرو دیمەنەکەیە.

دواجار دەبێ باسی ئەدۆنیسی شاعیر بکەین کە کارەکەی بە داهێنانەوە بەستراوەتەوە. دەشێت نەوەکانی داهاتوو بە متمانەیەکی گەورەتر لەنەوەی ئێمە بتوانن پێشڕەوی بکەن، ئەمە ئەگەر ئەدۆنیسی شاعیر لە نێو شاعیرانی عەرەبدا لە سەدەی بیستەمدا رەسەنترینیان بێت. بەڵام گومان لەوەش ناکرێت ئەدۆنیس لە هەمووان ئازاتر و بوێرترە. مرۆڤ لە بەرهەمە نووسراوەکانیدا و تەنانەت لە قسە رۆژانەییەکانیشیدا هەست بە چێژێکی گەورە دەکات، سەرچاوەی ئەو چێژە زمانی عەرەبییە – ئامرازی دەوڵەمەند و لە فۆرمێکی ئیعجازیدا– کە ئەدۆنیس بە رێگەیەکی جیاواز بەکاریدەهێنێت بە جۆرێك کەسێکی تر بیری لێنەکردۆتەوە، ئەو بە چەشنە ریتمێك ئەو زمانە بەکار دەهێنێت کە بەر لە ئەدۆنیس کەس نەیبیستووە، لێکچواندنێك بەکاردەهێنێت کەس خەویشی پێوە نەبینیوە.

هەمیشە بابەتەکانی ئەدۆنیس، هەروەك ناوەکەی پێماندەڵێت، بابەتی نوێکردنەوەن، لەم پرۆژەیەشدا چووەتە قوڵایی شتەکان و زۆر لەوە دوورتر رۆیشتووە کە هەر کەسێك ئەمڕۆ دەنووسێت، کردبێتی. سا وەکو وەرگێڕێك بێت یان رەخنەگر یاخود وەکو توێژەرێك، رێبینێك، هاوڕێیەك، هاووڵاتییەك لە خاك و سەردەمی خۆیدا، ئەدۆنیس هەمیشە ئەو شاعیرە بووە کە ترس و سڵەمینەوەی نەناسیوە.

*ئەم تێکستە پێشەکیی کتێبێکە لەبارەی ئەدۆنیس کە لە (دار بدايات) لە سوریا چاپکراوە بە ناونیشانی: "رۆشنایی مەشریقی – ئەدۆنیس لە دیدی بیریاران و شاعیرانی جیهانیدا". ئێدوارد سەعید بەم تێکستە ئەدۆنیسی لە سیمینارێکدا پێشکەش کرد کە لە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرك کرا.

## سەرچاوە

رۆژنامەی (الحياة)، 2004/9/9

# فرۆید و ناسنامەی یەهودی

**ئێدوارد سەعید**

**لە عەرەبییەوە: سارا ئەحمەد**




*Freud and the non-european*

*Edward w. said*

*Verso. London, new-york. 2003*

*p. 84*

**کتێبی (فرۆیدو ئەوروپییەکان) بە پێنوسی کەسێك نوسراوە ئێجگار بەناوبانگە، ئەو کەسەش پرۆفیسۆر "ئێدوارد سەعید"ی مامۆستای زمانی ئینگلیزی و ئەدەبی بەراوردکارییە لە زانکۆی کۆلۆمبیا لە نیویۆرك. هەروەها خاوەنی کتێبی (خۆرهەلأتناسی، تێڕامان لە تاراوگە و وتارگەلێکی تر، کۆتایی پرۆسەی ئاشتی، دەسەلأت. سیاسەت. کلتور، کلتور و ئیمپریالیزم) و چەندین کتێبی دیکەیە. هاوکات ئەندامی ئەکادیمیای ئەمریکییە بۆ هونەر و زانستەکان. ئەندامی کۆمەڵەی پاشایەتیە بۆ ئەدەب. ئەندامی ڕێکخراوی فەلسەفی ئەمریکی و ئەندامی ئەکادیمیای ئەمریکییە بۆ هونەر و ئەدەب. ئەم کتێبە نوێیە لەبەر دەستماندایە، بە ئەسڵ دەقی لێکچەرێکە کە پرۆفیسۆر "ئێدوارد سەعید" لە مۆزەخانەی "فرۆید" لە لەندەن پێشکەشیکردووە.**

**"کریستۆڤەر بۆلاس"ی بەڕێوەبەری مۆزەخانەکە لەسەرەتادا بەمجۆرە پێشکەش بە ئامادەبوانی دەکات: (میوانە بەڕێزەکان، خۆشحاڵم**

بە ئامادەبونتان لەم بۆنە گرنگەدا تا گوێ لە پرۆفیسۆر ئێدوارد سەعید بگرن، بۆ ئەوەی قسەتان بۆ بکات دەربارەی فرۆید و هەڵوێستی لە غەیرە ئەوروپییەکان.. دوای ئەوەی باسەکە کۆتایی دێت، مافی قسەکردن دەدەین بە جاکلین ڕوز بۆ ئەوەی وەڵامی بداتەوە).

"کریستۆڤەر بۆلاس" هەر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: (ئێدوارد سەعید لە قودسی خۆرئاوا چاوی بە دنیا هەڵهێناوە و لەو سەردەمەدا دایك و باوکی بەشێوەیەکی گشتی لە شاری قاهیرە نیشتەجێبوون. بەڵام خانەوادەکەی بەردەوام سەردانی فەلەستینی دەکرد، بۆ ئەوەی هەندێ کات لای خزمان و دۆستانیان بەسەربەرن.. یەکەمین ئەزمونی ئەو لەگەڵ تاراوگەدا ساڵی 1948 دەست پێدەکات، کاتێك خێزانەکەی بە یەکجاری لە فەلەستین وەدەردەنرێت و دوای چل و پێنج ساڵ ژیانی تاراوگە لە 1992 دەگەڕێتەوە بۆ فەلەستین! پاشان لە میسرەوە دەچێت بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لە زانکۆی برنستۆن دەخوێنێت، بە قسەی خۆشی ئەمە دەبێتە هۆی فراوانبونی و جیهانبینی ئاسۆی بیرکردنەوەی. پاش ئەوەی لە ساڵی 1964 لە زانکۆی هارڤەرد بڕوانامەی دکتۆرا وەردەگرێت، دەبێتە مامۆستا لە زانکۆی کۆڵۆمبیا لە شاری نیویۆرك.. ساڵی 1966 یەکەمین کتێبی خۆی دەربارەی ڕۆماننوسی بەناوبانگ جۆزیڤ کۆنراد بلاّو دەکاتەوە. دوای ئەوە نزیکەی بیست کتێبی دیکە دەنوسێت کە بۆ زیاتر لە سی و شەش زمانی جیهانی وەردەگێڕدرێن).

لە جێگەیەکی دیکەدا "بۆلاس" دەڵێت: (ساڵی 1977 دەبێتە ئەندام لە ئەنجومەنی نیشتمانی فەلەستین و تا ساڵی 1991 دەمێنێتەوە، لەو ساڵەدا بە هۆی ڕێکەوتنامەی ئۆسلۆی نێوان ئیسرائیل و فەلەستینیەکان دەست لەکار دەکێشێتەوە. لەپاڵ ئەوەشدا سەعید قسەکەرێکی ڕەسمی دیار و ناسراوی مەسەلەی فەلەستینیە.. سەرەڕای ئەوە میوزیك زانێکی لێهاتووە و بەشێوەیەکی سەیر و سەرنج ڕاکێش پیانۆ دەژەنێت).

دوای تەواوبوونی قسەکانی بەڕێوەبەری مۆزەخانەی "فرۆید" لە لەندەن، ڕێگا بە "ئێدوارد سەعید" دەدرێت بۆ ئەوەی باسەکەی پێشکەش بکات. ئەویش بەمجۆرە دەستپێدەکات: (دوو ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی لە مانای وتەزای – نا ئەوروپی – تێگەین. مانای یەکەمیان لەسەردەمی فرۆید خۆیدا هەبووە و دووەمیشیان لەو ماوەیەدا دێتە ئارا کە فرۆید ژیان جێدێڵێت لە ساڵی 1939، هەردوو ماناکەش بە کەڵکن بۆ تێگەیشتن یاخود بۆ خوێندنەوەی بەرهەمەکانی لەمڕۆدا. بەلای فرۆیدەوە جیهانی غەیرە ئەوروپی، بریتییە لە سەرجەم ئەو شارستانیەتانەی دیکە کە دەکەونە دەرەوەی ڤییەنا و نەمسا و ئەوروپاوە. بەداخەوە جگە لە میسر، فرۆید ئاشنایەتی ئەوتۆی لەگەڵ ژیارەکانی دیکەدا نەبووە، یاخود دەتوانین بڵێین لە ژێر کاریگەری ئەوترادسیۆنە یەهودی و مەسیحیەدا بووە کە تیایدا لەدایك بووە، بەڵام بە مانا ئایینیەکەی نا، بەڵکو بە مانا گشتییە فراوانەکەی.. لە ڕاستیدا فرۆید زۆر لە ژێر کاریگەری کەلەپوری هیومانستی و زانستی ئەوروپادا بوو لە سەردەمی ڕێنیسانسەوە تا سەردەمی ڕۆشنگەری و دوای ئەوەش).

پاشان "ئێدوارد سەعید" بەردەوام دەبێت و دەڵێت: (کێشەی ئەویتر وەکی ئەوەی لە مرۆدا ڕووبەڕومان بۆتەوە، بۆ فرۆید مەترەح نەبووە،



لەبەرئەوەی ئێمە لەسەردەمی پۆست مۆدێرنە یان پۆست بونیادگەریدا یاخود قۆناغی پۆست کۆلۆنیالیزمدا دەژین و لە ساتەوەختی مردنی فرۆیدەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان شتی زۆر گۆڕاوە. بەلاّم بەو پێیەی فرۆید سەرقاڵی کەشفکردن و دۆزینەوەی ئەو ڕووبەرە تاریك و ئەنگوستە چاوەبووە کە دەکەوێتە ئەودیو ئەقڵ و هوشیاریەوە و بە ناخود ئاگا ناودێری دەکەین، ئەوا بە جۆرێك لە جۆرەکان بە کێشەی ئەویترەوە خەریك بووە.. بێگومان فرۆید کوڕی کلتوری ئەوروپی بوو، بەلاّم دەیزانی ژیاری دیکە و کلتوری دیکەش هەن.. بۆ نمونە لە هەندێك شوێندا باس لە شارستانیەتی هند و چین دەکات، بەلاّم بەشێوەیەکی سەرپێی و بێئەوەی زۆر بچێتە ناو وردەکارییەوە. بەلاّم بەوەی کە سەردەم و ڕۆژگاری ئەو سەردەمی فەلسەفەی پۆزەتڤستی و بالاّ دەستی زانستی ئەوروپا بوو، ئەوا پێیوابوو کلتوری ئەوروپی لە تەواوی کلتورەکانی تر گرنگتر و بالاّترە. بەم پێیە فرۆید وەکی گەورە بیریارانی سەردەمی خۆی ئیرۆسەنتەریزمانە بیری کردۆتەوە، ئەمەش بۆ خۆی نەنگی نییە، لەبەر ئەوەی بیریار هەرچەندە بیر تیژ و مەزنیش بێت، هەر بە کوڕی سەردەمی خۆی دەمێنێتەوە و قودرەتی تێپەڕاندنی نابێت. لەبەرئەوە وەکی کلتورێکی سەرەتایی دواکەوتوو — کە سەر بە قۆناغی بەر لە زانست و بالاّ دەستی عەقڵە —، لە کلتورەکانی دیکەی ڕوانیوە. بەلاّم نەگەیشتە ئەو ئاستەی هەڵوێستێکی ڕەگەزپەرستانە وەرگرێت، وەك ئەوەی زۆر کەسی تر کردیان.. فرۆید بڕوای بەوە نەبوو هێڵێکی جیاکردنەوەی ئەستور لە نێوان مرۆڤی سەرەتای و مرۆڤی ژیاریدا، یاخود لە نێوان ئەوروپی و غەیرە ئەوروپیدا هەبێت. بەبۆچونی ئەو مرۆڤی سەرەتایی ئەگەر هەلومەرجی بۆ بڕەخسێت، دەشێت گەشە بکات و بەرەو پێش بچێت، بەلاّم بیریاری ڕەگەزپەرست بڕوای بەو شتە نییە و بڕوای وایە میللەتانی دیکەی غەیرە ئەوروپی شایەنی شارستانیەت نین و هەرچی بکەن پێیناگەن.. ئەمەش دیدگایەکی ڕەگەز پەرستانەیە. فرۆید ئەگەرچی ستایشی زۆری شارستانیەتی ئەوروپی دەکرد و بڕوای تەواوی بە بەهاکانی هەبوو، بەلاّم بەرامبەر چارەنوسی ئەو شارستانیەتە ڕەشبین بوو، لەبەرئەوەی پێیوابوو لەناو خۆیدا هەڵگری غەریزەی مردن و خۆ وێرانکردنە).

دواتر "ئێدوارد سەعید" دەستدەکات بە بەراوردکردنی هەڵوێستی "سیگمۆند فرۆید" و "فرانز فانۆن"، دەرهەق بە مرۆڤی ئەوروپی و غەیرە ئەوروپی و لەمبارەیەوە دەڵێت: (ئەڵبەتە فانۆن لە قۆناغی دواتردا ژیا کە فرۆید بە چاو نەیبینی، قۆناغێك کە کۆلۆنیالیزم و تاوانەکانی بەخۆیەوە بینی و بوو بە بەلاّیەك بەسەر مرۆڤی ئەوروپی و شارستانیەتی ئەوروپییەوە، ئەمەش بە کتێبە بەناوبانگەکەیەوە — ستەمدیدەکانی زەوی — دیار بوو). پاشان "ئێدوارد سەعید" باس لە میتۆدی "فرۆید" دەکات و دەڵێت: (فرۆید پەیڕەوی میتۆدی هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی لەناخی مرۆڤدا دەکرد، بەمەبەستی ئاشکراکردنی ئەوڕابردووەی پەردەپۆشکراوە یاخود چەپێنراوە یان ماوەیەکی دوور و درێژە سەرکوتکراوە. گەورەترین بەڵگەش بۆ ئەوە دواین کتێبیەتی کە چەند مانگێکی کەم بەر لە مردنی نوسیویەتی، مەبەستمان لەوەش کتێبی: موسا و یەکتاپەرستیە. فرۆید لەو کتێبەدا باس لەوە دەکات، موسای دامەزرێنەری ئایینی یەهودی و سیمبولی مەزنی یەهود بۆخۆی کەسێکی یەهودی نەبووە! ئەم قسانە یەهودیەکانی زۆر جاڕسکرد. بە

بۆچونی فرۆید موسا کەسێکی تەواو میسریە. ئایینی یەکتاپەرستیش لەسەردەمی ئەخناتون و بگرە بەر لەویش لە ئارەدا بووە. کەواتە ئەوەی ئایینی یەکتاپەرستی کەشفکردووە، میسریە کۆنەکانن نەك جولەکە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە شوناسێکی بێگەرد و تایبەت نییە، وەکی زۆرینەی یەهودیەکان و غەیری ئەوانیش پێیان وایە. بەڵکو هەموو شوناسێك لە چەندین ڕەگەزی ناوخۆیی و دەرەکی دروست دەبێت، بەم پێیەش پێویست بە دەمارگیری ناکات. بۆنمونە لەمبارەیەوە بڕوانە کتێبی –شوناسە بکوژەکانی– ئەمین مەعلوف).

شایەنی باسە لەم لێکچەرەیدا "ئێدوارد سەعید" خوێندنەوەیەکی تازە و بوێرانە بۆ کتێبی (موسا و یەکتا پەرستی) دەکات، لە هەموو ئەمانەیش مەبەستی ئەوەیە ڕابردوو بە ئێستاوە ببەستێتەوە و بەرپەرچی ئەو بۆچوونەش بداتەوە کە پێیوایە شوناسێکی بێگەرد هەیە. دواتر "سەعید" دەکەوێتە ڕونکردنەوەی ئەوەی شوناسی یەهودیەکان بێگەرد نییە، بەڵکو لە ساتە وەختی دروست بوونیەوە، واتە لە ساتەوەختی موسا پێغەمبەرەوە، ڕەگەزی میسری و لایەنی دیکەی تێکەڵ بووە.. لێرەوە سوربوون لەسەر خەسڵەتی یەهودی دەوڵەتی ئیسرائیل و سڕینەوەی هەموو ئەو شتانەی یەهودی نین لە فەلەستین، دژ بە حەقیقەتەکانی مێژوو و لۆژیکە. دواجار "ئێدوارد سەعید" دەگاتە داکۆکیکردن لە تێزەکەی خۆی کە دەڵێت: (پێویستە لە فەلەستیندا یەك دەوڵەت هەبێت، بەڵام دوو شوناسی هەبێت، واتە لەیەککاتدا هەم یەهودی و هەم عەرەبیش بێت.. گەر هاتوو هەر لایەنێك دانی بەوەدا نا کە شوناسی شوناسێکی بێگەردنییە و لە چەندین ڕەگەز پێکهاتووە، ئەوا قبوڵی دەکات بە ئاشتی لەگەڵ لایەنەکەی تردا بژی.

بەمجۆرە دەگەینە چارەسەرێك بۆ ئەو کێشە ئاڵۆز و پڕ گرفتەی سەبارەت بە فەلەستین هەیە). ئەمەش تێزەی سەرەکی ئەم کتێبەی "ئێدوارد سەعیدە"ە.

واتە "سەعید" دەیەوێت "فرۆید" و شکۆمەندی فیکری ئەو بەکاربهێنێت، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستین – ئیسرائیل! بەمەش "ئێدوارد سەعید" دەیسەلمێنێت بیریارێکی زۆر زیر و ستراتیژیەکی لێهاتووە. ئەو تەواوی ڕۆشنبیریی بەرفراوانی خۆی و توانستی میتۆدی بەکاردەهێنێت، بۆ ئەوەی ئەو دەقەی "فرۆید"ی پێبخوێنێتەوە و تیشك بخاتە سەر لایەنە شاراوەکانی. پاشان پێماندەڵێت: (فرۆید لەیەك کاتدا یەهودی بووە و یەهودیش نەبووە، واتە پەیوەندی ئەو لەگەڵ مەسەلەی یەهودیەتدا پەیوەندیەکی ئیشکالیئامێز بووە.. سەرەوەختێك کە کۆمەڵگەی ئەورووپیی پڕیبوو لە دژایەتیکردنی سامیەت و هەر کەسێك بە ئەسڵ یەهودی بوایە بە چاوێکی سوك سەیردەکرا، لەو کاتەدا بەشانازییەوە باسی لە یەهودیەتی خۆی دەکرد. بەڵام لە هەمان کاتیشدا بیریارێکی ئەقلانی بووە و مومارەسەی هیچ یەك لە ڕێوڕەسمەکانی ئایینی یەهودی نەکردووە، بەڵکو بە ئاشکرا باسی لەوە کردووە کە بڕوای بەو شتانە نییە.. واتە ئەو یەهودیەتی بە میراتی بۆ جێماوە یاخود یەهودی بوونی ئەو شتێکی ناچاریی بووە و دەستی خۆیی تێدا نەبووە). وەکی دەشزانین "فرۆید" یەکێك بووە لە وانەی پشتیوانیکردنی لە بزوتنەوەی زایۆنیزم ڕەتکردۆتەوە و دژی کۆچی بەلێشاوی یەهودیەکان بووە بۆ فەلەستین.

لە ڕاستیدا "ئیسحاق دۆیچەر" بە چاکترین شێوە تەعبیری لەوە کردووە، کاتێك هاتۆتە سەر باسی "فرۆید" و سێ کەسی تر لە گەورە




فەیلەسوفان کە بەڕەچەڵەك یەهودین، ئەوانیش بریتین لە: "سپینۆزا و مارکس و هاینیٚ"ی شاعیر. ئەمانە تێکڕا بەرهەمی کلتوری ئەورووپین کە کلتورێکی ڕۆشنگەر و ئەقلانی و یۆنیڤێرسالیە. ئەمانە هەموویان دەست بەرداری بیروباوەڕی یەهودیەت بوون و خۆیان جیاکردەوە، لە پای ئەمەشدا ڕووبەڕووی دژایەتیکردن بوونەوە.

ئەو بیریارانە پێیان وابوو تەواوی مرۆڤایەتی چونیەك و یەکسانن، ڕەگەزێك نییە چاکتر لە ڕەگەزێکی دیکە یاخود ئایینێك باشتر لە ئایینێکی تر.. یاسا زانستیەکان ئاڕاستەی مرۆڤ دەکات و جڵەوی هەڵسوکەوتەکانیان دەکات، وەك چۆن ئاڕاستەی گەردون و هەموو شتێك دەکات. هەروەها ئەو بیریارانە کەسانێکی ئەقلانی بوون و ڕەگەزپەرست و دەمارگیر نەبوون. تەنها شەڕیان لەسەر ئەو پرانسیپە ئینسانی و ژیاریانە دەکرد کە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی بوو، ئێمەش پێویستە بەمچاوە سەیریان بکەین، لەبەرئەوەی ئەوانە زیاد لە کەسانی تر دڵسۆزی پرانسیپەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری بوون.

## سەرچاوە

بیان الکتب – 27ی ئۆگستۆسی 2003.

# گفتوگۆیەك لەگەڵ ئیدوارد سەعیددا

رامین جەهانبەگلو

لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی



▪ **سەرەتا سوپاستان ئەکەم کە قایل بوون ئەم گفتوگۆیەتان لەگەڵدا بکەم. لە دەسپێکی ئەم گفتوگۆیەدا حەز ئەکەم سەبارەت بە ژیانی تایبەتی و ئەزموونەکانی رابردووتان لێتان بپرسم و، کاریگەریی ئەم ئەزموونانە لەسەر هزری ئێوە. ئێوە لە نۆڤەمبەری 1935دا لە ئۆرشەلیم لە خێزانێکی مەسیحی هاتوونەتە دونیاوە. ئایا هیچ یادەوەرییەکتان دەربارەی رۆژگاری رابردوو لە یاددا ماوە؟**

–لە نێوان ساڵانی 1935 تا 1947دا لە ئۆرشەلیم بووم. ئەو ماوەیە ئۆرشەلیم لە ژێر دەسەڵاتی بریتانیادا بوو. خێزانەکەمان یەکێك بوو لە خێزانە مەسیحییە رەسەنەکان و دایکیشم خەڵکی ناسرە بوو. لەو ساڵانەدا لە هەردوو شاری ئۆرشەلیم و قاهیرەدا ژیانمان بەسەردەبرد، لەبەرئەوەی باوکم لەم دوو شارەدا مەشغوڵی کار بوو. بەم پێیە ئۆرشەلیم بەلای منەوە شارێکی بریتانی بوو و لە نێوان جوولەکە و عەرەبدا جیاوازییەکی تەواو بەدی ئەکرا. ئەو دەمە جوولەکەکانی نیشتەجێی ئۆرشەلیم لە دوو تیرە پێکهاتبوون: یەکێکیان جوولەکەی هاسیدیك بوون کە لە بەشە ئۆرتۆدۆکسەکەی ئۆرشەلیم دەژیان و ئەوانی تریشیان جوولەکە ئەوروپاییەکان بوون کە بۆ ئۆرشەلیم کۆچیان کردبوو. کورێکی جوولەکەم دێتەوە یاد کە ئەو سەردەمە لە قوتابخانەی سانت جۆرج هاوپۆلم بوو.

قوتابخانەی سانت جۆرج، قوتابخانەیەکی تێکەڵ و سەربە کڵێسای ئینگلستان بوو. ئەو کوڕە ناوی دیڤید ئەزار بوو و تاقە کەسە کە لە ساڵی 1947ەوە لە یادمدا ماوە. تاقە کوڕە جووی پۆلەکە و کەسێکی تەواو سەربەخۆ بوو. پەیوەندییەکی هاوڕێیەتیم لەگەڵیدا هەبوو کە بووە هاوڕێیەتیەکی گیانی بە گیانی. ئەو دەمە ئۆرشەلیم کرابوو بە دوو بەشەوە. خێزانەکەی ئێمە لە بەشێکدا بووین و خێزانەکەی دەیڤیدیش کەوتبوونە بەشەکەی ترەوە. گەر لە بەشێکەوە بچووینایە بۆ بەشەکەی تر دەبووایە بەناو پۆستەکانی پشکنینی سوپای ئینگلیزدا تێپەڕینایە. هەلومەرجەکانی چلەکان زۆر گرژبوو و تەقینەوەی زۆر ڕووی ئەدا. بیرمە ئەو کاتە هەندێ شتم دەربارەی ڕووداوە تیرۆریستییەکەی ئیرگون خوێندەوە. ئەوانە چەند سەربازێکی ئینگلیزیان لە سێدارە دابوو. لای من ئۆرشەلیم شارێکی ناخۆش بوو و شتێکی سەرنجڕاکێشی تیا نەبوو و مۆرکێکی ئایینیی بەخۆوە گرتبوو.

▪ **ئایا ئەو سەردەمە کەوتبوویتە ژێر کاریگەریی مەسەلەی شوناسەوە؟**

—نا، بە شێوەیەکی جیددی نا، چونکە من لەو بەشەی دونیادا لەدایک بووبووم و باوکیشم هەر لەو شارە کۆنەدا گەورە بوو بوو دواتریش لەگەڵ ئێمەدا لەوێ دەژیا، هەمیشە پێی دەوتم کە حەزی لە ئۆرشەلیم نییە. ئۆرشەلیم لای ئەو سیمبوڵی مەرگ بوو. ئەبێ ئەوە بڵێم کە بەلای منیشەوە هەر وەبیرهێنەرەوەی مەرگە. دەزانیت کە لەو سەردەمەدا هیچ جۆرێك لە سەرگەرمی لە ئۆرشەلیمدا نەبوو. چەند سینەمایەکی تیابوو کە تەنها دووانیان هی عەرەب بوون. ئێمە دەمانتوانی هەر بۆ سینەمای عەرەبەکان بچین و بە هەمانشێوە جوولەکەکانیش هەر بۆ سینەمای جوولەکەکان دەچوون. لە شارەکەدا گرژییەکی زۆر هەبوو لە هەموو شوێنێکدا سەربازی ئینگلیز هەبوون. ئەگەرچی من لە ئۆرشەلیمدا لەدایك بووبووم، بەڵام هیچ هەستێك بە شوناس و وابەستەیی بەو شارەوە لەلام نەبوو، ئەوە نەبێت کە خێزانەکەمان خەڵکی ئەو شارە بوون.

▪ **دواتر، لە ساڵی 1947دا، لەگەڵ خێزانەکەتاندا چوون بۆ قاهیرە و لەوێ چوویتە کۆلێجی ڤیکتۆریاوە؟**

—بەڵێ، چووین بۆ قاهیرە و تا ساڵی 1951 دوو ساڵ لەو کۆلێجە بووم.

▪ **ئایا ئەو سەردەمە بیروباوەڕی سیاسیت هەبوو؟**

—بەڵی، بەڵام سیاسی لەو ڕووەوە کە هەموو نەیاری ئینگلستان بووین. کۆلێجی ڤیکتۆریا خوێندنگەیەکی ئینگلیزی بوو. گەرچی بەشێکی کەمی خوێندکارەکان ئینگلیز بوون، بەڵام هەموو مامۆستاکان ئینگلیز بوون. مامۆستاکانی کۆلێج نەژادپەرست نەبوون، بەڵام جۆرە ڕقێکم لێیان بوو، لەبەرئەوەی وا باسی عەرەبیان ئەکرد وەك ئەوەی لە خەڵکی تر جیاوازبن. وەکو دەزانیت هەموو دامودەزگا گەورەکانی قاهیرە لەو سەردەمەدا سەر بە ئیستعمار بوون. بۆیە ڕۆژگارێکی تاڵم بەسەربردو، ئاخریەکەی لەسەر ئەوەی کە ئەوان پێیان ئەوت "نارێکی"، لە خوێندنگە دەرکرام، بەڵام ڕاستییەکەی لەسەر ئەو ەبوو کە ڕەفتارم مامۆستاکانی هەراسان کردبوو. هەر بۆیە باوکم وای بەچاك زانی قاهیرە جێبهێڵم و بچم بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەو دەمە ئەو لایەنگری ئەمریکا بوو، لەبەرئەوەی لە ماوەی یەکەم جەنگی جیهانیدا لە سوپای ئەمریکیدا خزمەتی کردبوو و ئەو ڕۆژانەش بە پەیرەویکردنی ئەمریکا لە فەلەستین دەژیا. پاشان ڕۆیشتم بۆ ئەمریکا و لەوێ چوومە خوێندنگەیەکی شەوانەڕۆژ و لەوساوە تا ئێستا نیشتەجێی ئەمریکام و زوو زوو سەردانی

خۆرهەڵاتی ناوەڕاستم کردۆتەوە، بەڵام تاقە ئەندامی خێزانەکەمم کە لە ئەمریکادا دەژیم.

▪ **بەمجۆرە پاش تەواوکردنی ئامادەیی چوویتە زانکۆی پرینستۆن و لە بوارەکانی ئەدەب و فەلسەفە و مۆسیقادا سەرقاڵی خوێندن بوویت. چۆن ئەم سێ بوارەت پێکەوە خوێند؟**

–ئەو بوارەی دەمخوێند بواری زانستە مرۆییەکان بوو و پیانۆ و تیۆرەی مۆسیقاشمان دەخوێند. هاوکات لە خوێندنگەی جۆلیاردی نیویۆرک وانەی پیانۆم ئەخوێند و کۆنسێرتی زۆرم ئەنجام ئەدا.

▪ **بۆچی وەکو پیانۆژەنێك وازت لە مۆسیقا هێنا؟**

–نەمدەویست ببمە پیانۆژەن. ژیانم وەکو پیانۆژەنێك قایلی نەدەکردم و لەبری ئەوە فەلسەفە و ئەدەبم خوێند.

▪ **بۆچی ئەدەب؟ چی وای لێکردیت حەز لە ئەدەب بکەیت؟**

–کۆمەڵێك شت. پێویستە ئەوە بڵێم کە ئەمریکای پەنجاکان لە ڕووی سیاسییەوە سەرنجڕاکێش نەبوو. ئەو سەردەمە جگە لە ماکارتیزم هیچ ڕووداوێکی دی لە ئارادا نەبوو. ئەبێ ئەوەش بڵێم کە زانکۆی پرینستۆن تەواو دژی سیاسەت بوو هەر کەسە و چاکەتێکی لەبەردابوو و پایپی ئەکێشا، زۆر بەشیکی.

▪ **ئەو کاتە ئۆپنهایمەریش لەوێ بوو؟**

–بەڵێ، بەڵام لە زانکۆ وانەی نەدەوتەوە. ئێنشتاینیش لەوێ بوو. پرینستۆن شارێکی بچکۆلە بوو کە پڕ بوو لە کۆمەڵێك ئەمریکی کە ئاستی ژیانیان بەرزبوو، هەروەها لە پرۆتستانتی ئەنگلۆساکسۆنی سپی پێست (*W:A.S.P.S*). زانکۆی پرینستۆن زانکۆی چینی حوکمڕانی بوو، بەڵام زیاتر مۆرکی حیزبی پێوە دیاربوو هی زانکۆ. لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هیچ ژنێکمان نەدەبینی. هەندێ جار بۆ پشوو دەچووینە نیویۆرك و ڤیلادلڤیا. بەمجۆرە زۆربەی کات سەرقاڵی کار و خوێندنەوە بووم. ئەو ماوەیە بۆ من دەرفەتێکی زێڕین بوو بۆ بەدەستهێنانی زانست و خۆ فێرکردن. پاشان بۆ ماوەی ساڵێك لە میسر لەگەڵ کەسانی خێزانەکەماندا ژیام و سەرگەرمی پیانۆژەنین و نووسین بووم، واتە ساڵی 1957–1958، دوای قەیرانی کەنداوی سویس.

▪ **لەو سەردەمەدا لە ژێر کاریگەریی کام نوسەر و بیرمەندانەدا بوویت؟**

–لە قوتابخانە و زانکۆ مامۆستای باشم هەبوو. بەڵام لە مامۆستا ناسراوەکانی ئەمریکا نەبوون. زیاتر ئەکەوتمە ژێر کاریگەریی ئەو شتانەی دەمخوێندنەوە. لەو بڕوایەدام یەکەمین کاریگەریی بەهێزی فیکری دوای ئەوە بوو کە پرینستۆنم جێهێشت. یەکەم کەس ڤیکۆ بوو. بیرمە لە ساڵی 1953دا ڤیکۆم خوێندەوە و بە تەواوەتی کەوتمە ژێر کاریگەرییەوە. ئەوی تر لۆکاچ بوو. کتێبەکەی کە ناوی "مێژوو و هوشیاریی چینایەتی"یە ئەو دەمە تازە بڵاوبووبۆوە. وەرگێڕانە فەرەنسیەکەیم دەست کەوت، چونکە بە زمانی ئەڵمانی لەبەردەستدا نەبوو.

▪ **وەرگێڕانە فەرەنسیەکەی کۆستاس ئەگسیلۆس؟**

–بەڵێ ڕێك ئەو. وابزانم باشی دەناسیت، با لەوە بگەڕێین. دوای لۆکاچ کارەکانی هایدگەرم خوێندەوە. هەروەکو دەشزانیت یەکەم کتێبم دەربارەی کۆنراد بوو. ئەو دەمە لە پێشەوەی ئەو کەسانە بووم کە لە ئەمریکادا دەربارەی فەلسەفەی ئەورووپا ئەدوام. ئەو دەمە قۆناغی گەشەکردنی ڕەخنەی نوێ بوو لە ئەمریکا. لەو قۆناغەدا حەزێکی تایبەتم بۆ مەسەلە فەلسەفیەکان هەبوو.



بەمجۆرە پلەی دکتۆرام لە زانکۆی هارڤارد وەرگرت. نامەکەم سەبارەت بە کارەکانی کۆنراد و کارە ئەدەبییەکانی ئەو بوو. دواتر کەوتمە ژێر کاریگەریی کارەکانی میرلۆپۆنتی و هایدگەرەوە. ئەوەندە کارە فەلسەفییەکانی سارتەرم نەدەخوێندەوە، بەلاّم ڕۆمانەکانیم خوێندەوە کە پتر لە هەر شتێك بریتین لەئەزموونی ژیان. کۆمەڵێك کتێبی پۆلیٚ شم خوێندەوە. هەروەها لە ئەمریکادا یەکەم کەس بووم کە لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیدا بەوپەڕی جیددییەوە خوێندنەوەم بۆ کارە فەرەنسییەکان کرد و شتم لەسەریان نووسی. بەمپێیە یەکەم کەس بووم کە دەربارەی میرلۆپۆنتی و لیڤی شتراوس و فۆکۆم نووسی.

▪ **بۆچی کۆنرادت هەڵبژاردو لە کارەکانیت کۆڵیەوە؟**

–بابەتی کارەکانی کۆنراد "تاراوگە" بوو و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی حەز بە کارەکانی بکەم. من بە تەواوەتی لە ژێر کاریگەریی کارە دەرەکییەکانی کۆنراددا بووم، وەك نۆسترامۆ، لەناو دڵی تاریکیدا، تۆفان و ئەوانی تر. کتێبی کارمەندی نهێنی سەرنجی ڕانەکێشام. زۆربەی ئەم ڕۆمانانەم بەلاوێتی خوێندەوە. ئەگەر چی کۆنراد بە ئینگلیزی دەینووسی، نووسەرێك نەبوو و هەر ئەمەش وای لەمن کرد بایەخی پیٚ بدەم. ئەو لەگەڵ هاوسەردەمەکانی خۆیدا، وەك کیپلینگ و هنری جەیمز، جیاوازیی زۆر بوو. هەمیشە لەخۆم دەپرسی کە ئەو شتە چییە کارەکانی کۆنراد لەوانی تر جیا دەکاتەوە و گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە چەمکی "نەفیکردن" لە کارەکانی ئەودا بەکاربراوە. کۆنراد یەکەمین نووسەر بوو لە هەمانکاتدا کە دژی ئیمپریالیزم بوو، سەبارەت بە دونیای ئیمپریالیستی شتی دەنووسی. زمانی نووسینی زۆر بەرز بوو و لە زمانی هاوسەردەمەکانی خۆی، وەکو کیپلینگ و چیستەرتۆن جیاواز بوو.

▪ **بۆیە لەو سەردەمەدا ئێوەش بایەختان بە پەیوەندیی نێوان ئیمپریالیزم و کەلتوور داوە؟**

–بەڵیٚ، زۆر، بەلاّم نەك لە ڕووی سیاسییەوە. من لە کاریگەریی ئەم دووانەم لەسەر ژیانی تاکەکەسەکان دەتۆژییەوە. هەر بۆیە دەربارەی کۆنراد هەندیٚ شتم نووسی. کۆنراد بەرەنجامی ژیانێکی ناجێگیر بوو. کابرایەکی خەڵکی پۆڵەندە کە دوای فێربوونی زمانی فەرەنسی، فێری ئینگلیزییش بوو، بە دەوری دونیادا سەفەری کرد و بە تەواوەتی لە ژێر کاریگەریی باوکێکدا بوو کە وەرگێڕی کارەکانی شەکسپیر و دۆمۆسیٚ و لامارتین بوو. کۆنراد لە کتێبەکەیدا خۆی لە قەرەی هەندیٚ مەسەلەی وەکو شوناس و مەسەلەی ژیان داوە، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا لە ئەدەبدا مەسەلەی دانسقە بوون.

▪ **دوای وەرگرتنی دکتۆرا دەستت بە فێربوونی ئەدەبی بەراوردکاری کرد لە زانکۆی کۆڵۆمبیا. بۆچی لەبری کامبریج و ماسا چۆست و هارڤارد، نیویۆرکت هەڵبژارد؟**

–ئێستاش حەزئەکەم بگەڕێمەوە بۆ هارڤارد. نزیکەی دوو ساڵ لەمەوبەر دووبارە پێشنیازی کورسیی ئەدەبی بەراوردکارییان لە زانکۆی هارڤارد بۆ کردمەوە. بەلاّم حەزم بە نیویۆرکە. بەر لە هەموو شتێك چونکە زانکۆی کۆڵۆمبیا یەکەمین زانکۆ بوو کە پێشنیازی خستە بەردەمم و، بە پلەی دووەمیش لەبەرئەوەی "لایۆنیل تریلینگ"م زۆر خۆشدەویٚ، کە ڕەخنەنووسێکی ئەمریکی بەناوبانگە و ئەو دەمە لە زانکۆی کۆڵۆمبیا وانەی دەوتەوە. ناوبانگی زانکۆی کۆڵۆمبیا زیاتر ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لەویٚ پتر بایەخ بە فێرکردنی لایەنە ئەقلاّنیەکان

ئەدرێ. لە زانكۆی هارڤارد لە بواری ئەدەبدا بە تەنها بایەخ بە دەق ئەدەن، لە كاتێكا لە زانكۆی كۆڵۆمبیا پتر بایەخ بە بابەتەكانی مێژوو و سیاسەت ئەدرێ. پەیوەندییەكی بەرتەسك لە نێوان تریلینگ و ڕۆشنبیرەكانی تری نیویۆركدا هەبوو، وەك هانا ئارێنت و میری ماكارتی، لە ساڵی دووەمدا لە زانكۆی كۆڵۆمبیا هانا ئارێنتم بینی، هەردووكمان ئەندامی سیمینارێك بووین. بەم پێیە زانكۆی كۆڵۆمبیا شوێنێك بوو خاڵی لە دەمارگیری نیشتمانی. سی و دوو ساڵە لە زانكۆی كۆڵۆمبیام و زۆرم خۆشدەوێ. لە زانكۆ ڕێیان پێداوم هەرچییەكم بوێ بیكەم، بەڵام دەبووایە لە بواری زانستە مرۆییەكاندا وانەم بوتبایەتەوە. لە ساڵی دووەم و سێیەم بەدواوە بڕیاری خۆمدا تا دەست بە وتنەوەی ئەو بابەتانە بكەم كە حەزم لێیانە. بۆ نموونە لە كۆتایی شەستەكاندا تیۆرەی ئەدەب و فەلسەفەی ڕەخنەم وتەوە. یەكەمین كەس بووم لە ئەمریكا كۆنگرەیەكم سەبارەت بە گرامشی سازداو دەربارەی فۆكۆ و دێریدا كۆڕم گرت. پاشان سیمینارێكم ڕێكخست و تەواوی كەسەكانم بۆ هاوكاری و وانە وتنەوە بانگهێشت كرد. هیچ پارەو پوولێكم تیا خەرج نەكردن، بەڵام ئەوان هاتن، لەبەرئەوەی نیویۆرك نیویۆركە. هنری دۆمان و دێریدا و جۆرج پۆلێش هاتن. هنری دۆمان یەكێك بوو لە هاوڕێ كۆنەكانم لە زانكۆی هارڤارد، بەڵام تا ئێستاش من لەگەڵ بیروباوەڕەكانی ئەودا یەك ناگرمەوە.

▪ **ئایا ئێستاش زانكۆی كۆڵۆمبیا هەروایە؟**

—نەخێر، جیاوازیی زەق لەوەدایە كە چیدی (ئەوروپا — سەنتەری) نییە. ئەمڕۆ نووسەرانێكی زۆری جیهانی سێیەم، وەك هیندستان و چین و ئەفریقا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەم زانكۆیەدا دەگوترێنەوە كاتێ لە ساڵی 1963دا لە زانكۆی هارڤارد دەرچووم، ئینگلیزی و ئەدەبی بەراوردكاری تایبەت بوو بە ئەدەبی ئەوروپا. نووسەری خۆشەویست و ڕێبەری من ئایورباخ بوو. ئەوم نەدەناسی، تەنها كارەكانیم دەخوێندەوە و لە ئەڵمانییەوە وەرمدەگێڕان. ئەم ساڵانە چیدی ئەدەبی بەراوردكاری ئەوروپا — سەنتەری نییە و ئەدەبی چین و ژاپۆنیش دەگرێتەوە. بەشی ئەورووپی كە بناغەی ئەدەبی بەراوردكاری بوو، ئەمڕۆ لەناوچووە.

▪ **ئەمڕۆكە ناوبانگی ئێوە زیاتر بەهۆی كتێبی "خۆرهەڵاتناسی"یەوەیە. لە نێو كتێبەكانتاندا چۆن ئەم كتێبە هەڵدەسەنگێنن؟ بەتایبەتیش كە ئێستا هەژدەساڵ بەسەر نووسینیدا تێدەپەڕێت.**

—هەروەكو دەزانیت، پاشكۆیەكم بۆ ئەم كتێبە نووسی كە لە ساڵی 1995دا بەزمانی ئینگلیزی بڵاوبۆوە. لەبەرئەوەی ئەم كتێبە بۆ بیست و پێنج زمانی دونیا وەرگێڕدراوە، لە ناویشیاندا زمانی مالیزی و سلاڤی و كۆری، دیارە كە كتێبێكی ناسراوە.

زۆرترین فرۆختی ئەم كتێبە لە ژاپۆن بووە كە دەجار چاپكراوەتەوە و بیست و پێنج جاریش بە زمانی ئینگلیزی لە چاپدراوەتەوە، كە من خۆشم بەلامەوە سەیرە. من وامدەزانی كتێبێكی سادەم نووسیوە. كاتێك لەگەڵ خاوەنی دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەكاندا قسەم دەكرد هیچ مەیلێكیان بۆ چاپكردنی پیشان نەدەدا. بەڵام ئەم كتێبە لەبەرچەند هۆیەكی جیاواز كتێبێكی سەرچاوەیە: یەكەم لەبەر ئەوەی لە نووسینی ئەم كتێبەدا هەلێكی وام بۆ ڕەخسا تا بۆ یەكەم جار دانیشم و بەوردی لەسەر بابەتێك ئیش بكەم و كۆتایی پێ بهێنم. كاتێك خۆم بۆ ئەو كارە تەرخان كرد،



سیستمێکی وردم نەبوو، بەڵام بەرنامەکەم کامڵ بوو و ئەو کاتەی کە بۆم دەمایەوە بۆ نووسینی کتێبی "کەلتوور و ئیمپریالیزم" تەرخانم دەکرد. بەمجۆرە لەیەك کاتدا بەرنامەڕێژیم بۆ دوو کتێب کرد. دووەمیان ئەوەیە کە لە دونیای ئیسلامیدا لێکدانەوەیەکی هەڵەیان بۆ ئەم کتێبە کردووە، خەڵك ئەم کتێبە بە بەرگریکردنێك لە ئیسلام دەزانن و بایەخیان بەوە نەداوە کە من وتومە. بەڵام لە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی عەرەبیدا کە وەرگێڕانێکی باشی ئەم کتێبە لە ئارادایە، باوەڕی خەڵك وایە کە بە مەبەستی بەرگریکردن لە ئیسلام ڕەخنە لە ڕوخساری خۆرئاوا گیراوە. لەم ڕووەوە وای بۆ دەچم کە لێکدانەوەیەکی خراپ بۆ کتێبەکەم کراوە. بە بڕوای من چ خۆرهەڵات و چ خۆرئاوا دوو بونیادن کە لە پەیوەندیدا بە چۆنێتیی بەکاربردنی دەسەڵاتەوە هاتوونەتە ئاراوە.

لەڕووی بنەماکان و لە ڕووی فەلسەفییەوە، ئەم کتێبە لە دەرەوەی جیهانی عەرەبیدا کاریگەریی زیاتر هەبووە و ئەم مەسەلەیە کاری لە خۆشم کردووە. لەبەرئەوەی جیهانی عەرەبی تەنها وەکو هێرشێك بۆ سەر خۆرئاوا سەیری دەکەن و تێڕوانینی ئەفریقی و هیندستانییەکان بۆ ئەو کتێبە لەبەرچاو ناگرن. هیندستانیەکان کاری فراوانیان لەسەر ئەم کتێبە کردووە. زۆربەی ژاپۆنیەکان ئەم کتێبەیان خوێندووەتەوە و لێی تێگەیشتوون. هەروەها سەبارەت بەم کتێبە گەلێ قسەم لەگەڵ فێمینیستەکاندا کردووە. بەڵام جیهانی عەرەبی بە تەنها وەکو هێرش و بەرگری سەیری دەکەن. بەداخەوە کە زانستە مرۆییەکان و لێکۆڵینەوە مێژووییەکان لە جیهانی عەرەبیدا ڕەوتێکی سستیان هەیە ئەم مەسەلەیەش نیشانەیەکی دیاری ئەوەیە. لەوانەشە هۆکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو گوشارانەی دەرەوەی خۆیان، واتە ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل.

- **تیۆرەی پیلان لەم بەشەی جیهاندا دەبینریێ؟**

—بەڵێ، بەشێوەیەکی ترسناك. تاڕادەیەکی زۆر لەم ناوچانەدا بێئاگاییەکی تەواو سەبارەت بەو ڕووداوانە هەیە کە لە دەرەوەی جیهانی عەرەبیدا ڕوو ئەدەن. سەیر لەوەدایە کە لەم بەشەی دونیادا پێویستییەك نییە بۆ ئەوەی تەنها بایەخ بە ئەوروپا یان ویلایەتە یەکگرتووەکان بدەیت، بەڵکو دەتوانیت بایەخ بە ژاپۆن یان هیندستانیش بدەیت، بەڵام هیچ بایەخێك لەلاییەن عەرەبەوە بە هیندستان و ئەفریقا بەدی ناکریێ. ساڵی ڕابردوو سەردانێکی ژاپۆنم کرد. پاشنیوەڕۆیەك لە شوێنێك دەعوەت کرام کە تەواوی میوانەکان پسپۆڕی ژاپۆنیی کارناس بوون لە کاروباری جیهانی ئیسلامیدا. پێم وتن کە هەبوونی ئاسۆیەکی وا لە میسر یان وڵاتە عەرەبەکانی دی مەحاڵە. لەگەڵ میوانەکاندا هەر بە عەرەبی قسەم کرد. بەمجۆرە دەبینین کە لە جیهانی عەرەبیدا چەشنێك لە بەدگومانی بەرامبەر بە خۆرئاوا هەیە، کە وا دەکات پەیبردن بە ئەو شتانەی کە لە ئەدەبی ئەمریکیدا ڕوو ئەدەن، بەلای عەرەبەکانەوە دژواربێت. برایانی عەرەب تەنها بایەخ بە شیراك یا کێسنجەر ئەدەن، نەك بە ئەدیبانی ئەمریکی یان ئەوروپی.

- **بایەخدانی ئێوە بە مەسەلەکانی فەلەستین کەی دەستی پێکرد، تاوای لیێ کردن لەسەر ئەم بابەتە بنووسیت؟**

—سەرەتا دەستم بە نووسین کرد لە کۆتایی شەستەکاندا چوومە ڕیزی بزووتنەوەی فەلەستینەوە. هەروەکو دەزانیت زۆربەی کەسانی خێزانەکەمان کۆچەرین و لە کۆتایی چلەکاندا فەلەستینیان جێهێشت. زۆربەیان (ئامۆزاکانم و ئەوانی تر) چوون بۆ ئوردون. هەندێکیان بۆ لوبنان





و ئەوانی تر بۆ میسر. من هەرگیز لە ئوردون نەبووم. دوای شەڕی شەش ڕۆژە لەگەڵ ئیسرائیلدا، بۆ دیدەنی خێزانەکەمان چووم بۆ عەممان. هەروەها یەکێك لە هاوڕێ فەلەستینییەکانی خۆم بینی. ئەو لە ئەمریکا لەگەڵمدا بوو و ساڵی 1968 دوای وەرگرتنی پلەی پرۆفیسۆر چوو بۆ ئوردون و پەیوەندیی کرد بە بزوتنەوەی فەلەستینەوە. لە ڕێی ئەوەوە کەوتمە بایەخدان بە بزووتنەوەی گەلی فەلەستین. لە کاتی ڕووداوەکانی ئەیلوولی ڕەشدا من لە ئوردون بووم، بەم پێیە پەیوەندیی من لەگەڵ بزووتنەوەی فەلەستیندا تەواو سروشتی بوو. دوای ئەیلوولی ڕەش بۆ بینینی دایکم چووم بۆ لوبنان و لەو بزووتنەوەیە نزیك بوومەوە. لە سەرەتای حەفتاکاندا سەبارەت بە مەسەلەکانی فەلەستین دەستم بە نووسین کرد و توانیم نووسینەکانم چاپ بکەم. ئەو کاتە کەس نەیدەتوانی لە "نیویۆرك تایمز" و گۆڤارەکانی تری ئەمریکادا کە لە بنەڕەتدا زایۆنیست بوون، شت بنووسێت. بەڵام دوای ساڵی 1973 گوزارشتکردن لە دۆخی عەرەب بوو بە شتێکی پێویست و لە ساڵی 1974دا عەرەفات هات بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان. من وتارەکەی ئەوم کرد بە ئینگلیزی. هەڵبەت پەیوەندیی من بە بزووتنەوەی فەلسەتینەوە هەمیشە پەیوەندییەکی هەستیارانە بووە. پەیوەندییەکی زۆر نزیکم لەگەڵ عەرەفاتدا هەبوو، ئەوم باش دەناسی، هاوڕێ و خزمێکی زۆریشم لەناو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازیی گەلی فەلەستیندا هەبوو. بەڵام هەرگیز نە ئەندامی ڕێکخراوی فەتح بووم و، نە ئەندامی حیزبەکانی تر. لە ساڵی 1977دا لەئەنجومەنی میللیدا هەڵبژێردرام و قبووڵم کرد، بەڵام سەربەخۆیی خۆم پاراست.

- **بەڵام تۆ ئێستا دژ بە ڕەوتی ئاشتیت.**

–ئەزانیت کە من لەو یەکەمین فەلەستینیانە بووم کە قسەم لەسەر بوونی دوو دەوڵەت کردووە. ئەم ڕۆژانە قسەکردن لەسەر دۆخێکی وا شتێکی مەترسیدارە. هەمیشە باوەڕم وابووە کە پێویستە جۆرێك لە سازش هەبێت، بەڵام بڕوام وایە کە پەیمانی ئاشتی دەبێ لە نێوان دوو وڵاتی یەکساندا هەبێت. نەك لە نێوان براوەیەك و دۆڕاوێکدا. پاش جەنگی کەنداو گومانم بەرامبەر بە دۆخی ڕابەرێتیی ڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستین و بەتایبەت عەرەفات پەیدا کرد، کە زۆر بەرژەوەندخوازانە بوو و لەگەڵ بیروباوەڕی ڕاپەڕینەکەدا نەبوو. من تەواو دژی هاوپەیمانێتیی ئەوان بووم لەگەڵ عێراقدا لە کاتی جەنگیدا لەگەڵ ئێراندا.

لە هەشتاکاندا چەند جارێك چووم بۆ تونس و لە ساڵی 1988دا ئەرکێکی گرنگم گرتە ئەستۆ و ئەو کات هێشتا هەر ئەندامی ئەنجومەنی میللی بووم و لەگەڵ مەحمود دەروێشدا کارمان بۆ بەیاننامەیەك دەکرد. بەڵام هەلپەرستی و گەندەڵی لە بزوتنەوەی فەلەستیندا منی ڕووبەڕووی گیروگرفت ئەکردەوە. ئەندامەکانیشی هیچیان لە بارەی خۆرئاواوە نەدەزانی و هەرگیزیش هەوڵیان نەئەدا ئەمریکا بناسن، تەنانەت هەوڵیان نەئەدا ڕای گشتی لەوێ بخەنە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە.

ساڵی 1991 چووم بۆ ئەفریقای باشوور. میوانی زانکۆی کیپ تاون بووم و نیلسۆن ماندێلام بینی. هەندێ شت سەبارەت بە خەبات لە ماندێلاوە فێربووم و هەوڵمدا ئەوە بۆ جەنگاوەرە فەلەستینیەکان ڕوون بکەمەوە کە ڕاپەڕینێکی سەرتاسەری دەبێ چۆن ڕابەری بکرێ، هەروەکو ئەوەی کە کۆنگرەی میللی ئەفریقا ڕابەرایەتی کردبوو. لەبەرئەوەی ماندێلا بە منی وتبوو ئەگەر پاراستنێکی نێودەوڵەتی نەبێت، هەرگیز ئەو ڕاپەڕینە سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت. بەڵام



عەرەفات هیچ بایەخێکی بە بیروباوەڕی گشتی نەدا. بە تەنها بایەخی بە پەیوەندیی لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەدا.

▪ **ئایا هیچ گفتوگۆیەکی گرنگت لەگەڵ ڕۆشنبیرە جوولەکەکاندا هەبووە؟**

–بەڵێ، لە حەفتاکاندا گەلێ سیمینارمان لەگەڵ ڕۆشنبیرەکان نەك سیاسەتمەدارەکانیان لەسەر مەسەلە و کێشەکانی فەلەستین هەبووە. بەڵام مایەی نائومێدی بوون، چونکە هەستم کرد ئەوان لە ئێمەی ڕۆشنبیری فەلەستینی داوای ئیمتیازی زیاتریان دەکرد و تەنانەت نەیاندەویست لە قسەکانمان تێبگەن.

▪ **دەچینە سەر دوا کارتان، خۆنواندنەوەی ڕۆشنبیران، لەم کتێبەدا نووسیوتانە: "دژوارترین لایەنی ڕۆشنبیربوون ئەوەیە کە ئەوەی لە لێکۆڵینەوە و چالاکیەکانی خۆتدا لافی لێ ئەدەیت، پیشانی بدەیت". تۆ لەو بڕوایەدایت لە جێی نووسەر، مامۆستا یان ڕۆشنبیرێك کە لەگەڵ مەسەلە سیاسیەکاندا دەستەویەخەیە، توانییێتی ئەم کارەی ئەنجامدابێت؟**

–کەس تا ئێستا ئەم کارەی بەتەواوی ئەنجام نەداوە. بەڵام ئەنجامدانی تارادەیەك مومکینە. هەمیشە هەوڵمداوە بە بیروباوەڕەکانمەوە وابەستەبم، تەنانەت گەر ڕووبەڕووی دۆخێکی سەختیش ببمەوە. بۆ نموونە لە ساڵی 1992دا چووم بۆ فەلەستین و هێرشم کردە سەر ڕژێمی بەعسی عێراق کە ئەو کاتە خەڵکێکی زۆر لایەنگری بوون. بەڕای من توانای ئەنجامدانی کارێکی وا بۆ ڕۆشنبیر زۆر گرنگە. چەندەها جار هەڕەشەم لێکراوە. نووسینگەکەمیان سووتاندووە، هەڕەشەیان لە خێزانەکەم کردووە. بەڵام بڕوام وا نییە کە بە هۆی ئەم هەڕەشانەوە بیروباوەڕی خۆم بگۆڕم و ئەمەش بەلامەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە.

▪ **بۆ ئەنجامدانی کارێکی وەها ڕۆشنبیر پێویستی بە ئازایەتی هەیە.**

–بەبڕوای من پێویستە هەموو کەسێك وا بێت و لەو باوەڕەشدا نیم ئەم کارەم بە ئازایەتیەوە ئەنجامدابێت، ئەوەم کردووە لەبەرئەوەی وا بیرم کردۆتەوە کە دەبێ ئەو کارە ئەنجام بدەم. لەلایەکی ترەوە نابێ هەر بەوەشەوە بوەستین. چەندەها جار دوچاری شکست بووم، بەڵام شکستهێنان کۆتایی ڕێگا نییە. ئەبێ ڕۆشنبیر درێژە بەم کارە بدات.

▪ **ئایا تۆ خۆت بە ڕۆشنبیرێکی جیهانی دەزانیت؟ یان لەگەڵ میشیل فۆکۆدا هاوڕایت کە وتویەتی: "ئەمرۆ ڕۆشنبیری تایبەت جێی ڕۆشنبیری جیهانی و سەرتاسەر بینی گرتۆتەوە".**

–لەو بڕوایەدام کە دەبێ هەردووکیان پێکەوە بن. لە هەموو حاڵەتێکدا دەبێ پێگەیەکت هەبێ. بڕوام وایە کە سەبارەت بەم باوەڕە کێشەیەك هەبێت کە من لە ڕووی ئەدەبییەوە پێشزەمینەیەکم سەبارەت بە زانستە مرۆییەکان هەبووە و ئەوە یارمەتیی داوم و توانیومە لە شتێك بکۆڵمەوە. نموونەیەك دەخەمە ڕوو: لەسەدا نەوەدو پێنجی خەڵکی فەلەستین بە وردی پەیمانی ئۆسلۆیان نەخوێندۆتەوە. بۆیە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی ورد زۆر گرنگە. من لەم ڕووەوە وەکو ڕۆشنبیرێك فێرگوزارییەکی تایبەتم هەبووە. هەرگیز لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست وانەم نەوتۆتەوە و بابەتی وانەکانیشم هەمیشە ئەدەب بووە، بەڵام هەوڵمداوە بەسەر ئەمجۆرە خووەمدا زاڵ بم و ئەو شتانە بەکاربەرم کە دەربارەی مەسەلە جیهانیەکان فێریان بووم. لە ئەنجامیشدا، هەمیشە وەفام بۆ بیروباوەڕە مرۆڤدۆستانەکان هەبووە و باوەڕم وابووە کە نابێ ئەو ئینسانیەتە لە خەڵکی بسێنرێتەوە، وەکو خەڵکی فەلەستین یان ڕەشپێستەکان. دەربارەی

مەسەلەی توندوتیژیی زمانەوانی و ئەوەی کە چۆن بەشێوەیەکی پەرشوبڵاو کاردەکات، هەندێ کارم ئەنجامداوە، هەموو ئەوانە بەرهەمی فێربوونی تایبەتین و دۆخێك کە دەبێتە مایەی ئەوەی هەرکەسێك بتوانێ بیروباوەڕەکانی سەبارەت بە مەسەلە جیهانیەکان بخاتە کار. هەروەها هەمیشە باوەڕم وابووە کە مەسەلەی فەلەستین پەیوەستە بە مەسەلە جیهانیەکانی وەکو مەسەلەی ئازادی و عەدالەتەوە. ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی بە کۆمەڵێك ڕووداوی گرنگەوە هەیە. دەربارەی پەیوەندیی نێوان وڵاتانی پێشکەوتوو وڵاتانی دواکەوتوو و پەیوەندیی نێوان باکوور و باشوور گەلێ شت هەن بوترێن. بۆیە خۆ لە قەرەدانی ئەم مەسەلانەم زۆر بە سوودمەند زانی. بە بڕوای من جیاوازی لە نێوان جیهانی و سەرتاسەریبوون و تایبەتبووندا، هەندێ جار دراماتیکە، لەبەرئەوەی بە بۆچوونی من بوون بە بیرمەندێکی جیهانی واتە ئەوەی کە بتوانیت بنەما جیهانییەکان بەدەست بهێنیت. ئەگەر دەسدرێژیکردن بەشتێکی نەگەتیڤ سەیر بکەیت، ناتوانیت بڵێیت کە ئەم شتە لە هەموو دونیادا مایەی ناپەسەندییە، جگە لە میللەتەکەی خۆت کە هێرش نەکاتە سەر ئەوانی دی. لەم بارەیەوە هەمیشە تۆکڤیل بە نموونە دەهێنمەوە، کە بەهۆی سەرکوتکردنی سوورپێستەکانەوە، بە توندی ڕەخنەی لە ئەمریکا دەگرت، کەچی کاتێ چوو بۆ جەزائیر، خۆی بووە لایەنگری سەرکوتکردنی خەڵکی جەزائیر "لە پێناوی گەورەیی فەرەنسادا".

▪ **لە کتێبەکەتاندا نووسیوتانە: "دەنگی ڕۆشنبیر تەنیایە، بەڵام ئەم دەنگە زرنگانەوەی هەیە، لەبەرئەوەی ئازادانە بە حەقیقەتی بزاوتێکەوە دەبەسترێتەوە". ئەم مەسەلەیە ئەو قسەیەی بلانشۆ دەهێنێتەوە یادم کە لە کتێبی "پرسیار لە ڕۆشنبیران"دا دەیکات و دەڵێت: "بوون بە ڕۆشنبیر سەختە، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی کە ناکرێ تەنیا ڕۆشنبیر بیت و ئەو پێداویستیە شەخسییانەی کە ڕۆشنبیر لەگەڵیاندا دەستەو یەخە دەبێت ئەو دەخەنە تەنیاییەکەوە کە بە سەلامەتی لێی دەرناچێت".**

–بلانشۆ زۆر ڕاست دەکات. بە بڕوای منیش تەنیایی تەواو پێویستە. بەڵام نەك تەنها لە پێناوی خۆدا، ئەگەر پێویست بوو بەبێ ڕێککەوتنێکی گشتی هەڵوێستێك دەربڕیت، لێگەڕێ هەمیشە وا هەستبکەیت کە ئەوە لە پێناوی یارمەتیدانی لاوازەکان و ستەمدیدەکانی جیهاندا ئەنجام دەدەیت. من هەمیشە هەستێکی وام لا هەبووە. دژایەتیکردنی دەزگایەکی دەسەڵاتدار کارێکی سەختە، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە بەم کارە لە بەدبەختیی خەڵك کەم دەکەینەوە. بەڵام هەروەکو ئادۆرنۆش دەڵێت: "مەسەلەکە بە تەنها بریتی نییە لە یەکبوون و ئەو ئیلتیزامەی کە کەسانێکی وەکو سارتەر باسی دەکەن". بە یەقینەوە دەڵێم کە پێویستە سەربەخۆیی تەنانەت لە شێوازی نووسینیشدا بپارێزین. لەم بارەیەوە بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی گەلێ شتم نووسیوە. تۆ ئەتەوێ خوێنەر گوێی لە دەنگت بێت. ئەو ئەزانێ کە ئەوە تۆیت قسە ئەکەیت. هەر بۆیە من ڕقم لەو کەسانە دەبێتەوە کە بەناوی خوازراوەوە شت دەنووسن، ئەو کەسانەی کە وا دەنوێنن کەسی ترن. من خۆم هەرگیز نەمتوانیوە شتی وا بکەم. کاری لەمجۆرە شایستەی ڕۆشنبیر نییە.

▪ **سوپاس بەڕێز ئێدوارد سەعید.**

25ی نۆڤەمبەری 1996

## سەرچاوە

(نقد عقل مدرن) رامین جهانبگلو، جلد دوم، مجموعه سپهر اندیشه، تهران – 1377 (1998).

# لەبارەی ئیدوارد سەعیدەوە

## گفتوگۆیەك لەگەڵ د. مارکۆ شۆڵلەردا

لە فارسییەوە: کارزان محەمەد



ڕەنگە ناوی ئیدوارد سەعید (*Edward Said*)ی ئەدەبناس، بەرگریکەری مافەکانی فەلەستینییەکان لەئەمریکاو نوسەری کتێبە ڕەخنەییو سەرنجڕاکێشەکەی (خۆرهەڵاتناسی)یت بیستبێت.

ئیدوارد سەعید دوێنێ * لەتەمەنی (68) ساڵیدا دوای ماوەگەلێك لەتەحەمولکردنی نەخۆشی شێرپەنجەی خوێن، لەنیویۆرك کۆچی دوایی کرد.

ناوبراو لەدایکبووی ئۆرشەلیم بوو، دوای جەنگی سەربەخۆیی ئیسرائیل لەساڵی (1948)ی زایینی، خێزانەکەی ئەو لەقاهیرە کۆچیان کرد.

ناوبراو کە لەزانکۆکانی هارڤاردو پرینستۆن خوێندبووی، لەساڵی (1963)دا بووە مامۆستای ئەدەبیاتی ئینگلیزیو ئەدەبیاتی پراکتیکی لەزانکۆی کۆڵۆمبیا. بەناوبانگترین بەرهەمی ناوبراو، (خۆرهەڵاتناسی)یەو لەساڵی (1978)دا بڵاوکرایەوە.

سەعید لەم کتێبەدا خۆرئاوای تۆمەتبارکردبوو بەوەی کە دەڵێت دەربارەی خۆرهەڵات لێکۆڵینەوە دەکات، بەڵام لەراستیدا خۆرهەڵات بەوشێوەیەی دەیەوێت، دەیسازێنێتو بەمشێوەیە خۆرهەڵات بۆ مەسەلەی کۆڵۆنیالیزم دەگۆڕێت.

ســـەعید لەوتارگـــەلێکی زۆردا، ڕەخنـــەی لەئیســرائیل گرتــووەو نوســیبووی کــە ئیســرائیل دەوڵەتەکــەی خــۆی لەســەر گۆڕەکــانی کۆمــەڵگای فەلەستین بنیات ناوە.

ئەو گفتوگۆیـەی دەقەکـەی لـەخوارەوەدا دێـت، بــەیادی (ئیـــدوارد ســـەعید)و بەلەبەرچــاوگرتنی خزمەتــە زانســتییەکانی ئــەو و ئــەو گۆڕانانــەی کــە بەڕەخنەگرتنـــەکانی لـــەخۆرئاواو خۆرهەڵاتناســـی هێنایەئاراوە، ئەنجام دراوە لەگەڵ (د. مارکۆ شۆللەر *Marco Schller*)ی مامۆســـتای عـــەرەبناس و ئیسلامناس لەزانکۆی کۆڵنی ئەڵمانیا.

***بەڕێز د.شۆللەر، ئیدوارد سەعید چ پێگەیەکی لـەناو کلتـــوری داهێنەرانـــدا هەیـــە بەشـــێوەیەکی گشـــتیانە، و بەشێوەیەکی دیاریکراوتر لەلای خۆرهەڵاتناسان؟**

—مــــارکۆ شـــۆللەر: ئیــــدوارد ســــەعید، لەسەرتاســەری جیهانــدا پێگەیــەکی بــاڵای هەیــە. و ئەمــەش زۆر شــیاوی ســەرنجە. سەرنجڕاکێشــە ئــەوە بــــزانین کــــە زۆرینــــەی کــــەس، ســــەعید وەك ئەدەبیاتناســـێك دەناســـن نـــەك تـــەنها وەك خۆرهەڵاتناس.

نیـــوەی بەرهەمـــەکانی ســـەعید دەربـــارەی مێـــژووی هـــزری مـــۆدێرن و زانســـتی ئەدەبیاتـــە، واتــــا ئــــەو شــــتگەلانەی لەگــــەڵ کلتــــوری خۆرئــــاوادا ســــەروکاریان هەیــــە و نــــەك لەگــــەڵ کلتوری خۆرهەڵاتدا.

ئــەزمونی مــن ئەمــە بــووە کــە زۆرینــەی ئــەو کەســـــانەی هـــــەرگیز ســـــەروکاریان لەگـــــەڵ خۆرهەڵاتناســـیدا نییـــە، ســـەعید دەناســـن، ئـــەو کەســانەش کــە هــەرگیز نــازانن ســەعید چ ڕۆڵێکــی لــەناو خۆرهەڵاتناســاندا گێــڕاوە. ئــەو ڕۆڵــەی ئــەو لــەناو خۆرهەڵاتناســاندا هــەیبووە، دەکــرێ بڵــێین بەتایبەتی مەزن بووە.

کتێبەکـــەی ســـەعید (خۆرهەڵاتناســـی *Orientalismus*) زۆر ناوبـــانگی پەیـــداکرد. لەبەرئەوەی ئەو لەم کتێبەدا دەستی لەڕەخنەی توند وەرداوە ســەبارەت بەخۆرهەڵاتناســیی خۆرئــاوا، بەتایبەتی خۆرهەڵاتناسی لەبەریتانیاو فەرەنسا.

ئـــەو دەڵێـــت کـــە پـــەیبردنی خۆرئـــاوا بـــۆ خۆرهـەڵات، پەیبردنێکی بریندارە کە لەگەڵ وێنای واقیعیانــەی کلتــورە ئیســلامی و خۆرهەڵاتییەکانـدا وێکنایەتەوە.

***بەتێڕوانینی تۆ، ئەم کتێبە چ کاریگەرییـەکی لەسـەر خۆرهەڵاتناسان و کارەکانیان داناوە؟**

—دەبــێ بگوترێــت کاریگــەری ئــەم کتێبــە بەڕاســتی زۆر مــەزن بــووە. هەڵبەتــە دووبــارە کــەمتر لــەوڵاتانی نمونــەی ئــەڵمانیا، نەمســاو هۆڵەنــدا کــە نەریتێکی دوورودرێژیان لە خۆرهەڵاتناسیدا هەیـە، بــەڵکو زیــاتر بــۆ نمونــە لــە بــەریتانیا، فەرەنســاو ئەمریکادا. ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە ڕەخنـەکانی سـەعید زۆر تونـدن و لەزۆربـەی مەسـەلەکاندا ڕووی وتەکەی لەگەڵ کۆلۆنیالیزم و لەگـەڵ ڕۆڵـی سیاسی خۆرئاوایە لەوڵاتانی خۆرهەڵاتدا. و بەسروشتییەوە لـەناو بـەریتانیاو فەرەنسا دەخرێنـەڕوو، و سـەعید پــتر لەهــەمووان ئــەوانی باســکردووە. دەزانــین کــە ئــەڵمانیا نــەریتێکی ئــەوتۆی لــەکۆلۆنیالیزەکردنی خۆرهەڵاتدا نـەبووە، بەهەمانشێوە وڵاتـانیتریش کـە ناومــان هێنــان، بــۆ نمونــە نەمســا، هۆڵەنــدا و وڵاتــە بچوکەکانیتری ئەوروپاش.

کاریگــەری ئــەم کتێبــە بــەم جــۆرە بــوو کــە ئــەو خۆرڵاتناسانەی تـازە کـاری خۆیـان دەسـتپێکردبوو، سەرنجی ئەمەیان دا کە لەمبارەیــەوە بیربکەنــەوە کــە ئایــا لەواقیعــدا دیــدی خۆرئاواییــەکان بــۆ خۆرئــاوا بریندارکــەرە یــاخود نــا. بــەڵام لەراســتیدا لەهەنــدێ لەخاڵەکانـــــدا کـــــە ســـــەعید لەکتێبەکەیـــــدا

خستوویەتەڕوو، زۆر توندڕەوو بووە. زۆرینەی خوێنەرانی کتێبەکەی، ڕووبەڕووبوونەوەیەکی پۆزەتیڤیان لەگەڵ ئەم کتێبەدا هەبووە، بەڵام زۆریتریش ئەم کتێبەیان بەنیگەتیڤ هەڵسەنگاندووەو وتویانە سەعید زۆر دەیگشتێنێت و ئەوەی ئەو دەیڵێت نەك لەمەڕ خۆرهەڵاتناسی، بەڵکو لەمەڕ سیاسەتی خۆرئاوا ڕاستەو ئەمەش دوو مەیدانی جیاوازن.

هەروەها ئەم ڕەخنەیە خرایەڕوو کە ئەوەی سەعید دەیڵێت لەمەڕ بەریتانیاو فەرەنسا ڕاستە، و ئەویش کەمتر لەبارەی خۆرهەڵاتناسانی ئەم دوو وڵاتە، بەڵکو سەبارەت بەسیاسەتەکانیان لەسەدەی نۆزدەهەمو بیستەمدا.

***بەتێڕوانینی تۆ ئایا کتێبی خۆرهەڵاتناسی لەبارەی پەیوەندییەکانی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا، زیاتر ڕۆڵێکی نزیککەرەوەی هەبووە یاخود جیاکەرەوە؟**

—ئەم پرسیارە ناکرێ بەئاسانی وەڵام بدرێتەوە، بەڵام پێموایە ئەم کتێبە لەدەستپێکدا زیاتر کاریگەرییەکی جیاکەرەوەی هەبووە لەڕۆحی زۆرینەی خۆرهەڵاتناسانو زۆربەی خەڵکی خۆرهەڵاتو موسڵمانانا. لەبەرئەوەی بۆ موسڵمانان، ئەم کتێبە تائەندازەیەك وەك جەختکردنەوەو بەڵگەیەك بوو، بەپێی ئەم دروشمانەی کە ئێمە دەمانزانی خۆرئاوا ناتوانێ تێ‌بگات یاخود دەیەوێت لەهەندێ لەشتەکاندا بەپێچەوانەی ئەوەی لەواقیعدا هەیە، نیشانی بدات.

لەخۆرئاوادا بەم ئەنجامە گەیشتن کە ئەمە دروستەو ئێمە لەخۆرئاوا هەندێ پێشداوەریمان هەیە کە ناتوانین بیگۆڕین. بەمپێیە لەیەکەمین ساڵانی دوای بڵاوبوونەوەی، ئەم کتێبە کاریگەرییەکی جیاکەرەوەی هەبوو. هەمووان جەختیان لەسەر جیاوازییەکانو بەدحاڵیبوون بوو. بەڵام پێموایە هەنوکە کە نزیکەی (25)ساڵ بەسەر بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبەدا تێدەپەڕێت، زۆرێك ئاگاداری ئەم خاڵەن کە باسکردنی جیاوازییەکان دەبێتەمایەی ئەوەیکە لەناواخنیدا لەگەڵ یەکتر نزیك ببینەوە. پێموایە نەوەی نوێی خۆرهەڵاتناسان لەکاتی بڵاوبوونەوەی کتێبی خۆرهەڵاتناسیدا هێشتا دەچوونە دایانگەی منداڵان، بەجۆرێکیتر دەنۆڕنە خۆرهەڵاتناسیو خۆرهەڵات تا ئەو کەسانەی کە ساڵانێکی دووردرێژە باسیان لە خۆرهەڵاتناسی کردووە. هەربۆیەشە دەکرێ بڵێین ئەم کتێبە سەرەنجام بۆتەمایەی دۆزینەوەی پەیوەندی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا. و هەروەها بۆتەمایەی هاتنەئارای شێوازێکی نوێ لەڕووبەڕووبوونەوەی خۆرهەڵاتناسان لەگەڵ خۆرهەڵاتناسیو خۆرهەڵاتدا.

*ئەم گفتوگۆیە یەك سەر دوای کۆچی دوایی ئیدوارد سەعید ئەنجامدراوە لەگەڵ دەنگی ئەڵمانیادا (و—ك).

**سەرچاوە**

سایتی (***www.payam.com***)، 2005/8/3.

- **"ئەلکسیس زۆربا"ی کازانتزاکی**

ئیبراهیم ئەلعەریس

لە عەرەبییەوە: رێبوار

- **نامەیەکی ماکسیم گۆرکی بۆ کاترینای هاوسەری**

لە فارسییەوە: حەمە رەسووڵ حەسەن پوور

- **سەرەتا دژوارەکانی (مۆدێرنە)ی فەرەنسی**

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: شاد مستەفا

- **ئەدرنۆ**

ستیڤان مۆلێر

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

# "ئەلکسیس زۆربا"ی کازانتزاکی

ئیبراهیم ئەلعەریس
لە عەرەبییەوە: ڕێبوار



لە ماوەی ژیانە تاڕادەیەك درێژەکەیداو، لەو سەفەر و گەڕانە زۆر و زەبەندانەدا کە بە نێو وڵاتان و ئایدۆلۆژیەکاندا کردویەتی. نووسەری هەرە ناوداری یۆنانی سەدەی بیستەم نیکوس کازانتزاکی، گەلێك کەسی دیوە، لە ڕێگای خوێندنەوەیشەوە زۆری تری ناسیوە.. هەرخۆی بوو بەردەوام دەیوت ئەوەتا ئەندازەیەك "هەموو کەسی" ناسیوە، لە سوکرات و پێش سوکراتەوە تا پێش خزمەتی ئوتێلەکان. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوانەی هەمیشە کاریان تێکردووە و لەگەڵیدا بوون، تا تەمەنێکی دێرینیشی، چوار کەس بوون و پێنجەمیان نەبووە: هومیرۆس، نیچە، هنری برگسون و ئەلکسیس زورباس. پێویست ناکات خوێنەر بکەوێتە گەڕان بەناو ئینکلوپیدیای ناودار و سەرکردەو ناوە لووتکەکاندا لە هەر بوارێکدا بووبێت، تا بزانێت چوارەم ناو کێیە، چونکە زۆر بە ئاسانی، (زۆر باس) لە بنەمادا مرۆڤێکی زۆر ئاسایی ناو خەڵکی ڕەمەکیە. پاشان کرایە "پاڵەوان" و ناونیشانی یەکێك لە بەرهەمە ناوازەکانی کازانتزاکیس، پێش ئەوەی دەرهێنەری یونانی لەدایکبوی میسر مایکل کاکویانیس، لە ساڵی چلەکانی سەدەی ڕابوردودا، ئەو پایە نێو دەوڵەتیەی پیٚ ببەخشێت، کاتێك لە ڕۆمانەکەوە فیلمێکی بەرهەم هێنا کە "ئەنتونی کوین" دەوری زۆربای تیا دەبینی، ئیتر تا کۆتایی تەمەنی ئەنتۆنی کوین هەر ئەو ناو و دەورەی پێوە نووسا و لێی نەبوەوە.. هەروەها بە ژیانی کازانتزاکی و پاشان بە ژیانی کاکویانیشەوە.. کە توانیویەتی هێوری و کەسایەتی و ئەو خۆشەویستیەی بپارێزێت کە بیٚ کۆتاییە. چونکە زوربا، یان "زورباس" وەك لە ئەسڵدا وابووە، هەر لە یەکەم چرکەساتدا کە چوە نێو زەینی خوێنەرەوە ئیتر هەرگیز لێی نابێتەوە، زۆربا کەسایەتێکی زاڵ و زیندووە، لە هەموو ئەدەبی دنیادا بە ئاسانی نموونەی نادۆزێتەوە، لە کاتێکدا کە گەلێك نووسەری دوای کازانتزاکی هەوڵیانداوە کەسایەتیەکی لەو بابەتە دابڕێژنەوە، وەلیٚ جیاوازیی سەرەکی لەو نهێنیەدایە کە نووسەرە یونانیەکە کەسایەتیەکەی دانەهێناوە، بەڵکو و ڕاستەوخۆ لەناو خودی ژیانەوە هێناویەتی و، تەنیا نیگاری بۆ وێنە قەڵەمیەکان کێشاوە.. لانی کەم، ئەمە هەر قسەی خۆیەتی.

وەلیٚ بۆ کازانتزاکی ئەم کەسایەتیەی لە ژیانەوە خستۆتە ناو فەزای ڕۆمانەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر بە سانایی، هەر وەك ژیان نامە نووسەکانی کازانتزاکی دەڵێن، چونکە نووسەر شکۆمەندیی تەنیا بە مەزن و سنوورە بەربڵاوەکانی مێژوو لووتکەی چیاو ئەو تاکانەداوە کە هەنگاوی زۆر گەورەیان ناوە.. تەنیا خۆشیی لەو بلێسەیە هاتوە لە ناوەوەی مرۆڤدایە، کە دەڵێین بلێسە، یەکسەر "ئەلکسیس زۆربا"مان دێتەوە یاد، ئەمەیش دەگەڕێتەوە

بۆ ساڵی 1915، کاتێك کە کازانتزاکی کە ئەوسا تەمەنی سی و دوو ساڵ بوو ژیان نامەی تولستۆی خوێندەوە، لە دەفتەری یاداشتنامەی رۆژانەیدا زوو ئەمەی نووسی: "ژیان نامەی تۆلستویم خوێندەوە.. هەر لە یەکەم چرکەساتەوە سیحر و مەزنیەکەی کاریان تێکردم، دەرکم بەوە کرد کە تەنیا ئەدەب هەرگیز بەس نییە بۆ ئەو.. بەڵکو و ئەوەی بە ڕاستی پێویستیەتی باوەڕە، بۆیە هەستم کرد دەبێت من لەو شوێنەوە دەست پێبکەم کە تولستوی پێی گەیشتووە، ئەگەر کازانتزاکی هەر لەو چرکەساتەوە، هەوڵی ئەوەی دابێت لە هەموو رۆمانەکانیدا لەوێوە دەست پێ بکات کە تولستوی پێی گەیشتووە. "بە داهێنانی ئەو کاراکتەرانەی کە لاسایی کاراکتەرەکانی تولستوی بکاتەوە وەك خۆیشی لاسایی ئەو دەکاتەوە" کەواتە هەردەبوو لە نێوان ساڵانی 1941 و 1943دا "ئەلکسیس زۆربا بنووسێت. بۆ ئەوەی هەست بەوە بکات کەبەئامانجەکەی گەیشتوە. تەنانەت ئەگەر ئەوەمان لاگران بێت کە ئەم رۆمانە بە بەهێزترین کاری دابنێین، هێشتا کارێکە، ئەگەرچی سیمای رۆمانی هەیە و هەروایش دەخوێنرێتەوە، بەڵام تێکەڵەیەکیشە لە نێوان ژیاننامە و ژیانی گەورە پیاوێکی دنیادا.



ئەگەر کازانتزاکی لەو کاتەوەی کە ژیان نامەی تولستۆی خوێندۆتەوە، بۆ یەکەمجار خۆی بەرەو رووی بیرۆکەی نووسینی رۆمانێك کردبێتەوە کە تەوەرەکەی کەسایەتیەکی ئاوارتە بێت، کەواتە ئەوەی ساڵی دوای خوێندنەوەی ژیان نامەکە ڕوویدا، ئەوە بوو کە بۆ دۆزینەوەی کانزایەك و بەکارهێنانی رووی لە ناوچەی براستوفا کرد لە کەناری بیلوبونیز. لەو گەشتی سووسەکردنەدا کەسێکی لەگەڵ خۆیدا برد کە (جۆرج زۆربا) بوو.

ئەم یاوەریەی زۆربا، لە باتی ئەوەی بۆ دۆزینەوەی کانزایەك بێت کە پارە و سامان بەسەر خاوەنەکەیدا برژێنێت، بوو بە هۆی دۆزینەوەی هەقیقەتی مانای مرۆڤ و هاوڕێیەتی و ژیانی لە هاوسەفەرەکەیەوە، بەم جۆرە، بە درێژایی چارەکە سەدەیەك، ئەو بیرۆکەیە لە سەریدا گینگڵی خوارد. تا لە دواییدا، لەو کاتەدا کە کازانتزاکی لە ناوچەی ئیجینا دەژیا و، یۆنانی وڵاتی بە هۆی جەنگی جیهانی دووەمەوە داگیر کرابوو، ئەوییش بەرانبەر بە ئایندەی وڵاتەکەی لە غەم و ترسێکی گەورەدا بوو، کەسایەتی زۆربا خۆی خزاندە سەریەوە، بۆ ماوەی دوو ساڵ لەسەر پەڕە وێنەی کێشا، تا ئەو رۆمانەی لێ دەرچوو کە ناوبانگی کازانتزاکی گەیاندە لووتکە، بۆ ئایندەیش بە گشتی ئەدەبی یونانی شارەزای دنیای کرد.

ناوی رۆمانەکە لە ئەسڵا "ژیانی ئەلکسیس زۆربا"یە، بابەتەکەیش زۆر سادەیە، لاوێکی شاری چاوی لەوەیە رۆژێك لە رۆژان کانێك بدۆزێتەوە، بە یاوەریی کەسێکی یۆنانی کە بە رێکەوت یەك دەگرن، ناوی ئەلکسیس زۆربایە، رۆمانەکە باس لەو دیمانەیەو،

ئەو هەوڵ و سەرکێشیانەیە کە کوڕە شاریەکە لەگەڵ هاوڕێکەیدا دەیکات. هەرچەندە ڕۆمانەکە پڕە لە چیرۆك و وردەکاری، هەر لەسەرچڵی و ئارەزووەکانی خودی زۆرباوە و پاشان سەرکێشی و ژوانی لەگەڵ خاتوو مەدام هورتانسی فەرەنسیدا کە لە گوندێکی دراوسێ بەکانەکەیان دەژی، تاکوشتنی ئەو بێوەژنەی گوایا بوەتە هۆی مردنی هەرزەکارێك. هەموو ئەمانە تاڕادەیەکی زۆر لە ڕۆمانەکەدا بایەخێکی زۆریان نییە، یان نابنەتەوەر، بەڵکوو ڕۆڵی سەرەکی لە چوارچێوەی پەیوەندی هاوڕێیەتی ئەو دوو کەسەدا و لە وێنەی کەسایەتی زۆربادایە. ئەو پیاوە ئازاو بوێرەی کە لێوان لێوە لە ڕەوشت و دڵ گەورەیی. هەر ئەمەیش وای لە شاریەکە کردوە — کە لە بنەڕەتا خودی نووسەرە — کاریگەری زۆربای بکەوێتە سەر. زۆربا بە پێی وێنای ناو ڕۆمانەکە کەسێکی ژیان دۆستە، بۆ ئەوەی ئەو خولیایەی دەربڕێت و ئازادی خۆی لەکیس نەدات و ژیان بە پێی میزاج و ئارەزووەکانی دابین بکات، خۆی لە هەموو بیرە کۆنەکان دوور دەخاتەوە، لە هەموو داب و نەریتە سەپێنراوەکان کەلە دەرەوە دێن و یاری بە چارەنووسی مرۆڤ دەکەن. زۆربا بە هەموو مانای وشە مرۆڤە، مرۆڤێکە ئەقڵی تاکە پێوەری بیروڕا و مرۆڤایەتیەکەیەتی وەك تاقە لۆژیکێك بۆ ژیان و بەرەنگار بوونەوەی. ئەو بەرجەستەی مرۆڤێکی ئازادە کە بەڕاستی لە مانای ئازادی گەیشتبێت. ئەو ژیان بەسەر کێشیەك دەزانێت کە شیاوی ئەوەیە لێی نەترسیت و بیکەیت. لەبەرئەوەی زۆربا وایە، بۆیە دەبینین وانەیەکی ڕاستەقینەی ژیانی دەداتە هاوڕێ شاریەکەی کە لە کۆتی بیر کۆن و دابە باوەکان ڕزگاری نەبووە. ئەو لە هەموو هەڵسوکەوتێکیدا ئەو ڕاستیانە دەردەبڕێت، بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە گۆرانی دەڵێت و سەما دەکات و، ئەو ساتانەی "سەنتور"ەکەی دەژەنێت. ئەو ئامێرە موسیکیەی کە زۆربا بە بەردەوام پێی دەڵێت: پێویستە بۆ ژیانی و بۆ دەروشانەوەی ڕۆحی.

لە ڕاستیا، ئەگەر نیکوس کازانتزاکی لە ژیانیدا چەند ئاین زاو ڕێبازێکی فیکری تاقی کردبێتەوە، بە تایبەتی سۆڤ گەریەکی مەسیحی زۆر تایبەت "ڕەنگە ئەمەیان زۆر لە تولستویەوە نزیك بێت" و مارکسیەتیش. کەچی لەم ڕۆمانەدا زیاتر کاریگەریی نیچەی لەسەرە کە زۆر زوو خوێندویەتیەوە و گەیاندویەتیە "نەهلیزم"ی کە بەرەو ڕەوتێکی بێ بڕوایی بردو هەر تیا مایەوە، هەندێك جار دەرکەوتوەو پاشان خامۆش بۆتەوە.

کازانتزاکیس (1883-1957) هێشتا هەرزەکار بووە کە نیچەی خوێندۆتەوە و کاری تێکردووە. بە تایبەتی کتێبی "زەردەشت وای وت" ئەو لە هیراکلیونی دوورگەی کریت لە دایك بووە، منداڵیی کازانتزاکی مۆرکی ئەو ڕاپەڕینانەی گرتوە کە دانیشتوانی دوورگەکە کردوویانە، هەر ئەو ڕاپەڕینانەیش خێزانەکەیان ناچار کردووە کە جارێك بەرەو بیریە بچن و جارێکی دی بەرەو ناکسوس. دواییش بابەتی ڕۆمانە مەزنەکەی "ئازادی یا مەرگ"ی پێ ببەخشێت. کازانتزاکی ساڵانی خوێندنی زانکۆی لە پاریس لای هینری برگسون بوە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ یونان و خۆی بۆ

نووسین تەرخان بکات، ئەمە تا دوا ساڵی تەمەنی بەردەوام بوو، کە هەندێك لە ناودارترین کاری ئەدەبی یونانی سەدەی بیستەمی لێ بەرهەم هات.

لەوانە "دوا وەسوەسەکانی مەسیح" کە ئێستا زۆر باسی لێوە دەکرێت. هەروەها ئەو فیلمەی کە مارتن سکورسیزی لە رۆمانی "ئازارەکانی مەسیح" بەرهەمی هێناو میل گیبسون دەریهێناو تا ئێستایش هەراوزەنای ناوەتەوە.

**سەرچاوە**

الحياة 2004/3/9، ژمارە 14956

## نامەیەکی ماکسیم گۆرکی بۆ کاترینای هاوسەری

له فارسییەوە: حەمە رەسووڵ حەسەن پوور

کاتێك باسی نامەکانی گۆرکی دێتە ئاراوە، ئەوانەی ئەگەر ئەبەدیش نەبن لانیکەم بەم زووانە کۆن و بێبایەخ نابن. لەبەرئەوەی لە بەرامبەر دیاردەی وەك، نەداری، قاتوقڕی فەساد،




ئەشکەنجە، ملهوڕی و تیرۆردا.. قەرار دەگرن.

گۆرکی لە بەشێکی بەرچاو لە نامەکانیدا جگە لە لە ئاگاداریی گرینگی رووداوی مێژوویی، سیاسی، ئەدەبی، کۆمەڵایەتی و هیتد.. کە هاتوونەتە بەر باسکردن و لە رەوتی مێژوودا لەگەڵ جێگۆرکێ و گۆڕانی کات و سات و شوێندا، لەسەر یەك نەگۆڕن. هەڵوێستی وەك مرۆڤدۆستی، بەربەرەکانی بە دژی نەخوێندەواری ئۆگری بە پەرەسەندنی زانست و ئەدەب و هونەر یان بە راشکاوی و زۆر شەفاف تێدا بەدی دەکرێت و بە گشتی نامەکانی گۆرکی بۆ ئەوە دەشێن لە زۆر لایەنەوە شتیان لێ فێر بین. رەخنەگرێکی ئەدەبی یان هونەری ژیاننامەنووس یان مێژوو زانێك شتی زۆر بە نرخیان تێدا دەدۆزێتەوە بەڵام گرینگترین نرخیان پەیوەستە بە راکێشانی مرۆڤ بۆ لای خۆیان. گۆرکی بەهۆی نووسینی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی خەڵکی رەنجدەرو سادەو ساکارەوە ناووناوبانگی لە نێو مرۆڤی ئەم سەرزەمینەی ئێمە تێیدا دەژین، بۆ خۆی دەستەبەر کردووەو نوسراوەکانی وەرگێڕدراونە سەر چەندەها زمانی وڵاتان.

نامەکانی بۆ: (ئیباك بابێل، ئێونۆف، پاسترناك ئەتیکسی تۆڵستۆی و..) وەرگێڕدراونە سەر زمانە زیندووەکانی جیهان.

سامۆبیل مارشاك سەبارەت بە بەرهەمە ئەدەبییەکانی گۆرکییەوە دەڵێت: (ئەگەر ئەم نامانە لە داهاتوودا لە جێیەکدا کۆکرانەوە، ئەو دەم رووندەبێتەوە کە ئەو جیهانەی ئەم نووسەرە بەرز و بلیمەتە لەگەڵی لە پێوەندیدا بووە، تا چ رادەیەك پان و بەرین بووە).

بە کاترینا پشکۆ وا لە نێوان ساڵانی 1896–1904 دا هاوسەری گۆرکی بووە.

گۆرکی خۆی لە ساڵی 1891–1992 لەشاری تەفلیسدا دەژیاو لە پێوەندی بە شۆڕشگێرانی ئەم شارەوە گیراو راپێچی بەندیخانە کرا. ئەمەی لە خوارەوە دەیخوێننەوە نامەیەکە گۆرکی لە بەندیخانەوە بۆ ژنەکەی نووسیوە:

**تەفلیس**

14 **یان** 15**ی** 1898

تێکڕا هەموو شتێك بە باشی دەچێتە پێشەوە. سێ ڕۆژ لەمەوبەر هێنایانم بۆ تەفلیس، بەڵام نازانم ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە، شەوێ کاتژمێر دووی بەیانی هێنایانم بە پێوە بردیانمە قەڵای "متغ یان متاخ *Metekhor or Metakn*". ئەم قەڵایە لە سەرتاشە بەردێکی لێوار چۆمی کوورا دایە. لە دیوێکی تاکە کەسی بەندکراوم و نزیکەی 24 کاتژمێر خەوتم لەبەر ئەوەی لە ماوەی سەفەرەکە لە شارێی گیورگیان"دا لەگەڵ ئەوەی زۆر شەکەتبووم نەمتوانی بخەوم ئەم شارێیە شەقامێکی پانوقەشەنگە. بەڵام دوایی

ڕێگەم بدە! لە مەر ڕووداوەکەوە بدوێم:

بە سەرنجدان بەم تاوانانەی بە دژی من لە ئارادان، ڕێگەی قسەکردنم پێنادرێت، بەڵام تەنیا ئەوەت پێدەڵێم ئەگەر یەکێك هەبێ و ببێتە کەفیلم دەتوانم ئازاد بم. ئەو کات ڕەوانەی "نیژنی"م دەکەن بۆ لای تۆ. لە ژێر چاودێری پۆلیسدا. تۆ پێویستە بۆ شێوەی کەفالەتەکەو ئەو بەڵێنییانەی کەفیلەکە دەبێ بیاندات بچییە لای ئەلیکساندر ئیڤانوڤیچ لانین و پرسیاری لێبکەی داخوا دەبێتە کەفیلم یان نا! دڵنیای بکەوە لەوەی کە هەڵنایەم چونکی کاترینکا! لە ڕاستیدا بە بڕوای من مرۆڤ ناتوانێت لە دەست چارەنووس هەڵبێت.

من لەگەڵ ئەم نامەیەدا نامەیەکیش بۆ "ماریا سرگیڤنا" دەنووسم. لەوانەیە لانین بەهۆی ئەو بەد چانسییانەی هاتونەتە پێشێ ئەمکارە قبووڵ نەکات. لەگەڵ ئەم نامەیەدا فۆرمی کەفالەتنامەکەت بۆ دەنێرم کە مەئموری چاوەدێری بەسەر دۆسیەکەمدا بە یارمەتی دایمێ. بۆ خۆت تەرتیبی ئیشو کارەکان بکە.

باشە! ماکسیم چۆنە؟ وشەی نوێ فێر بووە؟ زۆر باشە؟ پەرستارەکە چۆنە؟ ئەوەی پێشوو ڕۆیشتووە و ئیدیکە هاتووە؟ ئیشووکاری چێشت لێنان و هی ترت هەن؟ سەبارەت بە ئیشوکاری ناوماڵ بە درێژی بۆم بنووسە و ئادرەسی ئیدارەی پۆلیسی شاری تەفلیسدا نامەم بۆ بنێرە. ژیان لێرەدا زۆر خەراپ نییە، ئەمڕۆ مۆڵەتیان پێدام کەڵك لە قەڵەم و کاغەز و کتێب و مەرکەب وەربگرم، بۆیە لە سبەینێوە دادەنیشم و خەریکی ئیشووکارەکانم دەبم، خواردنەکەی تێکڕا باشە تەندروستیم خەراپ نییە، هەست بە ئارامی دەکەم. گەرچی لە کاتی لێکۆڵینەوەدا هێندێك تێکچووبووم ئاخ! تۆ، باشتر لە هەر کەسێك دەزانی چ مرۆڤێکم. ژووره تاکە کەسییەکەم گەورە و دەلەحەوت (10×7)دایە. دوو پەنجەرەی تێدان کە بەرەو "کوورا" دەکرێنەوە، دیمەنێکی قەشەنگی بەشی ئاسیایی شارەکەیە، شار لە لێژاییەکدا هەڵکەوتووە لە باری شێوەی ژیان و دەرەوەییەوە پەسەندە. لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکەم و ئەو دەبباغخانەی ئەو لای ڕووبارەکە کە سەرقاڵی ئیشکردنن و ئەو کیژە بچکۆلانەیە کە چۆن ڕۆژ بەسەر دەبات و خەڵکی بەو تۆڕەی بە دارێکیانەوە بەستووە، چۆن ماسی دەگرن، دەیانبینم.

هەندێك جار وا هەست دەکەم، حەزدەکەم ماکسیم هەڵدەمە هەواو بیگرمەوە بەڵام هێندەی پێناچێت ئەو هەستەم نامێنێت. لە ڕاستیدا دەزانی چییە؟ تا ئەو کاتەی بابەتی بەندیخانە و ڕیژیم لە ئارادایە،

شتی بەنرخییش هەیە باشە با لەوەی بگوزەرێین.

تێبکۆشە ئەوانەی دەتوانن ببنە کەفیلم، بدۆزییەوە، ساڤ و سەلامەتی و ئارامی خۆت بپارێزە. ئاگاداری کورە بچکولانەکەمانبە، دەزانم دەتوانی ئیشوکارەکان ئەنجام بدەن، لەو ماوەیەدا کە چاوەڕوانی منی بچۆ بۆ داشالەمیزا، یاخود بچۆرە لای ماریا سترگیڤان. دەزانم لەوانەیە دۆزینەوەی کەفیل کاتی پێویست بێت کەوایە بە سوودی منداڵەکەیە لە شاردا نەمێنێت.

بیرورات سەبارەت بە چوون بۆ لای سامارا چۆنە؟ پێویست ناکات ئەوەی بۆ من رووی داوە بە دایکت بڵێی. تەنیا پێی بڵێ تەندروستیم لە پڕێکدا تێکچووە و چووە بۆ قەفقازیا، دیارە ئەو بێ سێ و دوو راستییەکە دەزانێت بەڵام ئەو کات زۆر داناچڵەکێت.

بەهیواو بە نیازی دیدار کاتیا!

بە دوور و درێژی نامەم بۆ بنووسە. بەڵێ! شتێکی دیکە. چەند وشەیەك بۆ بلاوکەرەوەکە (ناشر) بنووسە داوای لێبکە کتێبەکانم بۆ رەقابە بنێرێتە ئیدارەی رۆژنامەی قەفقازیا لە تەفلیس. ئەو چاکەی زۆری دەرهەقم کردووە.

لەگەڵ ماچێك بۆ کورەکەمان و بۆ خۆشت ئالکسی.

باڵندەکان چۆنن؟ ئەگەر تا ئێستا ئازادت نەکردوون ئازادیان بکە. ئێستا هەستدەکەم بوون لە قەفەسدا چەندە ناخۆشە و من دەمەوێت ئینسان بم.

ئارامی خۆت بپارێزە، تۆ پێویستە لەگەڵ ناهەموارییەکانی ژیاندا ڕابێیت، چونکی لەگەڵ زۆر شتی دیکەدا بەرەو روو دەبیت، شتێکت لە یادنەچێ، هیچ شتێك بۆ هەتا هەتایە پایەدار نابێت. هەموو شتێك تێدەپەڕێت، دڵنیابە!

**سەرچاوە**

کتێبی "نامەکانی ماکسیم گورکی "ترجمە حسین نیر لاپەرەی 60-64"

## سەرەتا دژوارەکانی (مۆدێرنە)ی فەرەنسی

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: شاد مستەفا



ڕۆشنگەری لە فەرەنسا چۆن هاتە ئاراو چۆن ئەو وڵاتە گاف گاف لە ڕۆژگاری فێندەمێنتالیزمی کاتۆلیکی ڕەهاوە گواستیەوە بۆ سەردەمی ئیمانی ڕۆشنگەر و فیکری ئەقڵانی؟

هەندێك لە گەورە مێژو نوسانی هاوچەرخ پێیان وایە "فۆنتنێل" (1657-1757)، یەکەمین کەس بووە ستایشی سەردەمی ڕۆشنگەری کردووە.. متمانەی "فۆنتنێل" بە مرۆڤایەتی و داهاتوی ئینسان دەگەڕایەوە بۆ ئەو پێشکەوتنانەی زانست لە سەردەمی ئەودا بە دەستی هێنابوو، بە تایبەت زانستی ماتماتیك و فیزیك. سەرەڕای گومان و سەنگینی، بەڵام خۆشحاڵی خۆی بەو گۆڕانکاریانە نەدەشاردەوە کە بەسەر ژیانی رۆشنبیری فەرەنسیدا هاتبوو.

بۆ نمونە لە جێگایەکدا دەڵێت: (ماوەیەکی کەمە گیانێکی فەلسەفی زۆر نوێ لە وڵاتەکەماندا بلاوبۆتەوە، ئەمەش بریتییە لە ڕۆشناییەك کە باوانمان دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەڕەخسا لێیبەهرەمەندبن و

سەرەنجام ئێمە پێیگەیشتین). هەروەها دەڵێت: (ئێمە درەوشاوەین بە روناکی ئاینێکی راستەقینە و بڕواشم بە هەندێك تیشکی فەلسەفەی ڕاستەقینە هەیە. هەنوکە ئێمە هەزاران جار لە خەڵکانی سەردەمانی پێشوو ڕۆشنترین، ئەو خەڵکانەی وەهم و خورافاتیان بەرهەم هێنا).

لێرەدا سەرنج دەدەین "فۆنتنێل" هەستیکردووە لە سەردەمێکی ڕۆشنگەردا دەژی، لانیکەم لەبواری فەلسەفەدا بە تایبەتی پاش "ڕینێیە دیکارت"، هەروەها لە بواری زانست و ڕەخنەی مێژویدا. بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین تا ساتەوەختی "فۆنتنێل"، چەمکی ڕۆشنگەری هیچ ڕەخنەیەکی –بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ– ئاڕاستەی فیکری ئایینی نەکرد بوو.

شایەنی باسە "فۆنتنێل" بەشێوەیەکی سەرەکی لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەدا ژیاو دەستی بە نوسینکرد.

ئێمە دەزانین جەنگی نێوان ئەقڵانییەکان و پیاوانی ئایینی بەشێوەیەکی فیعلی تەنها لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمدا دەستی پێکرد، بە تایبەت پاش ساڵی 1760، کاتێك کتێبە سەرەکیەکانی "ڕۆسۆ"و "دیدرۆ"و "فۆلتێر"و "بارۆن دۆلباك" چاپکران و بڵاوبوونەوە.

ڕاستە چەمکی سەردەمی ڕۆشنگەری لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا هەبوو، بەڵام تەنها لە دوای نیوەی دووەمی ئەو سەدەیە بووە بنەما و دروشم، ئەمەش ناگەڕێتەوە بۆ هەندێك لەو ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتیانەی لەو ماوەیەدا ڕویاندا، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ڕوداوێکی فیکری سەرەکی ئەویش بڵاوکردنەوەی ئینسیکلۆپیدیا بەناوبانگەکە بوو کە "دیدرۆ" (1713–1784) سەرپەرشتیکرد.

ئەم پڕۆژە فیکرییە مەزنە تەواوی ڕۆشنگەرەکانی لە هەموو بوارەکاندا لە دەوری خۆی کۆکردەوە. بەیاننامەی سەرەتای ئینسیکلۆپیدیا کە "دیدرۆ" نوسیبوی، ساڵی 1750 بڵاوبووەوە. هەرچی گوتاری پێشەکیە بە پێنوسی "دالامبێر" نوسرابوو، لە ساڵی 1751دا بڵاوکرایەوە.

ئینسیکلۆپیدیا بە هەموو بەشەکانیەوە، کۆکردنەوەی دەسکەوتەکانی ڕۆشنگەرییە کە لە ماوەی نیو سەدەی ڕابردوودا ڕویان دابوو. واتە دەرەنجامی کۆتایی سەرجەم ئەو زانیاری و زانستانەیە کە لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا لە ئارادا بوو.

لە وتاری پێشەکیدا کە شایستەی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتە، "دالامپێر" (1717–1783) پێیوایە سەردەمی ڕێنیسانس یەکەمین چەرخی ڕۆشنگەرییە زەمینەسازی بۆ سەدەی هەژدەهەم کرد، بەم پێیە ئێمە قەرزار باری ئەو ڕۆژگارەین. پاشان دادگاکانی پشکنین لە سەدەی حەڤدەهەمدا و هەروەها ئاقاری کاتۆلیکی توندڕەوو دژە ڕیفۆرمی ئایینی هاتنە ئارا، بەڵام نەیانتوانی ڕۆشنگەری خەفە بکەن کە سەرەتاکانی لەسەردەمی ڕێنیسانسەوە بەدەرکەوتبوو.

مەشخەڵی ڕۆشنگەری سەرەڕای هەوڵی زۆری دەمارگیرەکان بۆ خەفەکردنی، هەر بەدرەوشاوەی مایەوە. لە ئینسیکلۆپیدیادا چەمکی ڕۆشنگەری بە زۆری دێت. لە یەکێك لە وتارەکانیدا "دیدرۆ" جیاکاریەك دەکات لە نێوان سەردەمی ڕۆشنگەری و سەردەمی جەهل و تاریکیدا، لە

جێگەیەکی دیکەشدا بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە ترسی ئەوەیان هەبوو مرۆڤی ئەوروپی دوچاری نوچدان بێت و جارێکی دیکە لە تاریکیدا ڕۆبچێت، لەمبارەیەوە دەڵێت: (پێویست بەم ترسە ناکات، هیچ کاتێك هێندەی ئەم سەردەمەی ئێمە تاریکی و نەزانی لە پاشەکشەدا نەبووە، فەلسەفەش هەنگاوی گەورە دەنێت و بەرەوپێش دەچێت، لەم پرۆسەیەشدا ڕۆشنگەری هاوشان لەگەڵیدا ڕێدەکات). لە جێگایەکی دیکەدا "دیدرۆ" دەڵێت: (فەلسەفەی ڕاست و دروست کە ڕووناکی خۆی بە هەموو جێگەیەکدا پەخش دەکات و لە هەموو شوێنێك دەدرەوشێتەوە، خەریکە زیاتر و زۆرتر دەچێتە دێر و کلێساکانەوە).

لەلایەکی ترەوە "گریم" (1723-1807)، خاوەنی گۆڤاری (نامە گۆڕینەوەی ئەدەبی) و هاوڕێی "دیدرۆ" و "ڕۆسۆ" ستایشی ڕۆشنگەری دەکات، بەڵام لە گروپی ئینسیکلۆپیدیا کەمتر گەشبینی پێوە دیارە. شایەنی باسە "گریم" بەچەند قۆناغێکدا ڕۆیشتووە. سەرەتا زۆر لەوان خوێنگەرمتر بوو، پێیوابوو هاوڕێکانی زیاد لە پێویست نەرم و شەرمنن. ساڵی 1755 ڕەخنەی ئاڕاستەی ئەو گوتارە کرد کە "دالامپێر" لە ئەکادیمیای فەرەنسی پێشکەشیکرد، کاتێك وەکی ئەندامێکی ئەکادیمیاکە پێشوازی لێکرا، لەبەرئەوەی وەکی پێویست جەختی لەسەرکەوتنی ڕۆشنگەری نەکرد بووەوە. پێدەچێت "دالامپێر" لە پەرچەکرداری کۆنسێرڤاتیڤەکان ترسا بێت، بە تایبەت ئەوان زۆرینەی ئەو دەزگا فەرەنسیە دێرینەیان پێکدەهێنا. لە ڕەخنەکەیدا "گریم" نوسیبوی: (دەبوو باسی لە نەهامەتی سەردەمە تاریك و بەربەریەکانی پێشو بکردایە، سەردەمێك جەهل و نەزانی بەسەر ئەقڵیەتی مەسیحیەکاندا زاڵ بوو. هاوکات دەبوو باس لەو روناکیە نەرم و نیانەش بکات کە مرۆڤی ئەم سەردەمەی ڕوناك کردۆتەوە، مەبەستم لەوەش ڕوناکی فەلسەفە و زانستە). لە جێگایەکی تردا باس لە ڕۆڵی پرۆتستانتەکان دەکات، لە بڵاوکردنەوەی تۆلێرانس و ڕۆشنگەری و بەگژاچونەوەی دەمارگیری ئاینی و مەزهەبی. لەژێر کاریگەری ئەواندا ڕۆشنگەری هات بۆ ئەوەی دڕ بە تاریکیەکان بدات، کەچی دواتر "گریم" ساردبووەوە و ئەو حەماسەتەی سەرەتای نەما. بەڵام داخۆ ماندووبوو یان بێئومێد بوو لە دژایەتیکردنی دەمارگیری و دەمارگیرەکان؟ بۆ نمونە ساڵی 1757 دەڵێت: (جۆرە مرۆڤێك هەن زۆرینەن، ڕۆشنگەری فیکری هیچ کارێکیان تێناکات و سورن لەسەر کاڵفامی و دەمارگیری خۆیان).

تەنانەت کار دەگاتە ئەوەی سەدەی هەژدەهەم بەسەدەیەکی نا ڕۆشنگەری بداتە قەڵەم. بۆ نمونە دەرهەق بە یەسوعییەکان (دوژمنانی سەرسەختی فەیلەسوفان) دەڵێت: (بێگومان نەوەکانی تاریکی لە روناکی دەترسن و ڕقیشیان لەوانەیە روناکی لە نێو مرۆڤەکاندا بڵاودەکەنەوە). لە جێگایەکی تردا دەنوسێت: (ئەوانە یەکەمین ئامانجیان سرینەوەی ڕۆشنگەری و زانست لەسەر گۆی زەوی). بەڵام پاش ساڵی 1765 شتێك لە ناخ و دەرونی "گریم"دا گۆڕاو وەکی پێشتر گەشبین نەماو نائومێد بوو، ئەمەش لەبەرئەوە

نەبوو کە گومانی لە ڕۆشنگەری هەبێت، بەڵکو لەبەرئەوەبوو گومانی لە توانی مرۆڤ دەکرد لەوەی توانای تێگەیشتن و قبوڵکردنی ڕۆشنگەریان هەبێت. لەمبارەیەوە دەڵێت: (چرکەساتەکانی ڕۆشنگەری لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئێجگار کورتن)، یاخود دەڵێت: (ڕۆشنگەری گەلێك لە گەلان پەیوەستە بە ژمارەیەکی کەم یان دەستە بژێرێکی دیاریکراو، هەرچی زۆرینەشە ئەوا ئەستەمە ڕۆشنگەر بکرێن). بەڵام بۆچی نائومێدی تەنگی پێهەڵدەچنی؟ لەبەرئەوەی ئەو ڕوداوە مەزهەبیانەی ئەوکات لە فەرەنسادا ڕویدا ناهەموار بوو، بەڵگەی ئەوە بوو دەمارگیری لە ناخی مرۆڤەکاندایە و ئەستەمە ریشەکێش بکرێت. لەو ماوەیەدا کێشەی بنەماڵەی (کالاس) ڕویدا، کە بنەماڵەیەکی پرۆتستانتی بوون و لە شاری تولۆز لەلایەن زۆرینەی کاتۆلیکیەکانەوە بەشێوەیەکی ترسناك سەرکوتکران. هاوکات کێشەگەلێکی دیکەی وەك کێشەی (سیرڤین) و (لابار) و.. هتد، ڕویدا.

ئەمانە مرۆڤ گەلێك بوون بە تاوانی وازهێنان لە ئاینی مەسیحی یاخود پابەندنەبوون بە سروت و ڕێوڕەسمە ئاینییەکان، سوتێنران یاخود کوژران. ئەم ڕوداوانە دەریخست زۆربەی گەلی فەرەنسی تا ئەو کاتەش دوور بوون لە ڕۆشنگەری و ڕۆشنگەریش تەنها تایبەتە بە دەستەبژێرێك لە فەیلەسوفان و ڕۆشنبیران. لەم سەروبەندەدا کارگەیشتە ئەوەی یەکێك لە دادوەرەکانی شاری تۆلۆز ستایشی سزادان بکات، بەو پێیەی ئامرازێکی لەبارە بۆ ناچارکردنی کەمینەی پرۆتستانتی تا دەستبەرداری ئاینزای خۆی بێت و باوەڕ بە ئاینزای زۆرینە بێنێت کە ئاینزای کاتۆلیکییە. سەبارەت بەم بۆچونە "گریم" شێتگیر بوو وتی: (نەوەکانی داهاتوو نەفرەتمان دەکەن و بە تۆمەتی بەربەریەت و دڕندایەتی تاوانبارمان دەکەن، لە کاتێکدا ئێمە لاف ئەوە لێدەدەین سەر بە ڕۆژگارێکی فەلسەفی ئەقلانین)! بەڵام هەردوای ئەمە لەو ڕەشبینیە پاشگەزبووەوە و گەڕایەوە سەر گەشبینی سەرەتای و دەڵێت: (ئێمە لە باوکانمان چاکترین، ئەڵبەتە ڕۆڵەکانیشمان لە خۆمان چاکتردەبن، لە ڕوی ڕۆشنگەری و دورکەوتنەوە لە دەمارگیری)، بەڵام سەرلەنوێ و لە ساڵی 1770 دوچاری ڕەشبینی دەبێتەوە! پێدەچێت ئەمجارەیان ڕەشبینی بەری نەدابێت، چونکە ڕێگای ڕۆشنگەری دورو درێژە و پڕی کەند و کۆسپە و ئاکامیشی پێشوەخت مسۆگەر نییە، وەکی هەندێك مەزەنەیان دەکرد. لەبەرئەوەی تاریکخوازان لە بۆ سەدان بۆ فیکری ئازاد و هەر کاتێك هەلیان بۆ بڕەخسێت، بەبیانوی دژایەتیکردنی ئیلحاد و بێباوەڕییەوە یاخود بەرگریکردن لە بیروباوەڕ (بیروباوەڕی باب و باپیران)، دەست لە ڕۆشنگەری دەوەشێنن، بەمکارەشیان دژایەتی ئازادی فیکر و ویژدان دەکەن.

سەروەختێك یادی دوسەد ساڵەی قەسابخانە بەناوبانگەکەی (سانت بارتیلمی، 24ی ئابی 1772) کرایەوە، "گریم" دەنوسێت: (ئێمە هەموو رۆژێك شانازی بەو پێشکەوتنەوە دەکەین کە رۆحی فەلسەفی و ئەقلانی لە وڵاتەکەماندا بەدەستی دێنێت، بەڵام ئەم

پێشکەوتنە تا هەنوکەش هەموو چین و توێژەکانی نەگرتۆتەوە و تایبەتە بە دەستە بژێرێك لە بیریاران. دەبێت ئەوەش بڵێین کە تەنها فێندەمێنتالیستەکان نەفرەت لە ڕۆشنگەری ناکەن، بەڵکو حکومەتیش ترسی لێیەهیە و دەیەوێت پەکیبخات و کۆسپی بۆ دروست بکات).

لە جێگایەکی دیکەدا کە تەعبیر لە نائومێدی و پەستی ئەو دەکەن دەڵێت: (بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤایەتی بۆ ئازادی و حەقیقەت نە خوڵقاون، ئەگەرچی بەردەوام باسیان لێدەکەن، بەڵام لە ڕاستیدا ئازادی و حەقیقەت تەنها بۆ ئەو دەستەبژێرەی مرۆڤ خوڵقاوە کە دەتوانێت بەهرەمەند بێت لێیان، بەمەرجێك زۆر خۆیی پێوەبانەدات. هەرچی مرۆڤەکانی دیکەیە واتە زۆرینە، ئەوا تەنها بۆ کۆیلایەتی و گومڕایی دروست بوون).

**سەرچاوە**

الشرق الاوسط، 2002/6/14.

## ئەدرنۆ




**ستیڤان مۆلیر**

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

ژمارەی لاپەڕە: 712لاپەڕەی قەبارە مامناوەندی

لەبڵاوکراوەکانی بلاك وێل بۆبلشنگ/لەندەن/2005

دانەری ئەم کتێبە "ستیڤان مۆلێر"ی توێژەرە کە یەکێکە لە پسپۆڕانی فیکری ئەدرنۆ و قوتابخانەی فرانکفۆرت بەشێوەیەکی گشتی، دانەر لەم کتێبە تازەیەدا سەرگوزشتەی ژیانی یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانە فیکریە بەناوبانگە(تیۆدۆر ئەدرنۆ)دەگێڕێتەوە. ئاشکرایە (هۆرکهایمەر) یەکێکی دیکەیە لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و دانەر لێرەدا توێژینەوەیەکی وردمان سەبارەت بەکارە فەلسەفیەکانی پێشکەش دەکات.

(ستیڤان مۆلێر) لە دەستپێکی کتێبەکەدا ئاوا دەڵێ: ئەدرنۆ ساڵی 1903 لەشاری فرانکفۆرت لەنێو خێزانێکی دەوڵەمەندی بۆرجوازی هاتۆتەدنیاوە، (ئۆسکار)ی باوکی جولەکەیەکی ئەڵمانی و بازرگانی عارەق"مەی" بووە، (ماریا)ی دایکی مەسیحییەکی کاتۆلیك بووە و ڕەگەزنامەی فەرەنسی هەبووە و زۆری حەز لە مۆسیقا کردووە. ئەدرنۆ هەر لە سەرەتایی منداڵییەوە ژیان بەدەمیەوە پێکەنیوە و لەماڵەوەش هەموو شتێکی بۆ دەستەبەرکراوە، پارە، ڕۆشنبیری، گۆرانی و مۆسیقا، دەسەڵات و پێگەی کۆمەڵایەتی بۆرجوازی.

ئەدرنۆ هەر لە سەرەتای ژیانیەوە سەلماندی کە خاوەنی بلیمەتیەکی گەورەیە، بەتایبەتی لە بواری مۆسیقا و فەلسەفە، زۆر زوو دەستیکرد بە گفتوگۆ کردن لەسەر ئەو تێزەی خۆی سەبارەت بە(کیرکجارد) باوکی وجودیەتی مەسیحی، پاشان لەشاری فرانکفۆرت پەیوەندیکرد بە پەیمانگای توێژینەوەی کۆمەڵایەتی، هەر ئەم پەیمانگایەش بوو دواتر دەبێتە قوتابخانەی فرانکفۆرت. قوتابخانەی فرانکفۆرت لەلایەن (ماکس هۆرکهایمەر)ەوە دامەزرابوو کە لە ئەدرنۆ بەتەمەنتر بوو، پاشان دەبنە هاوڕێی یەکتر.

ئەو پرسیارە سەرەکییەی قوتابخانەی فرانکفۆرت

خستییەڕوو، ئەمەی خوارەوەیە: چۆن لەوە تێبگەین کە کۆمەڵگای سەرمایەداری توانی هێزە ئۆپۆزسیۆن و نارەزاییەکان بێلایەن بکات و بیانگۆڕێت بۆ هێزی بەرخۆر و تێکەڵ بە کۆمەڵگایان بکات؟ لەواقعدا گەروانەبوایە، ئەوا پرۆلیتاریا دەیتوانی ڕژێمی سەرمایەداری هەڵبگێڕێتەوە و بیگۆڕێ بە ڕژێمێکی سۆسیالیزمی. ئەوە توانای خۆگونجاندنی سەرمایەداریە لەگەڵ بارودۆخە تازەکە، وایکرد سەرمایەداری لە پێشبینیەکەی (مارکس) ڕزگاری ببێت، مارکس پێشبینی ئەوەیدەکرد سەرمایەداری دوای ئەوەی ناکۆکیەکانی ناوەوەی دەگاتە دوا ئاست، ئیدی هەرەسدێنێت و نامێنێت.

دانەر لەبەشێکی دیکەی کتێبەکەدا دەڵێ: بەسەرهاتی ژیانی ئەدرنۆ لەبەسەرهاتی ژیانی هەندێ لە ڕۆشنبیرە بۆرجوازییە گەورەکان دەچێ. ئەو ڕۆشنبیرانەی مارکسیەت سەرسامی کردبوون و دژی چینە کۆمەڵایەتیەکەی خۆیان هەڵگەڕانەوە. ئەم گەنجە سەرکەوتووە، واتە ئەدرنۆ، هەموو شتێکی هەبوو، ئیدی هیچ پێویستی بەوەنەدەکرد پەیوەندی بە بزوتنەوە کۆمەڵایەتیەکانەوە بکات کە دژی ڕژێم بوون. بەڵام ئەدرنۆ وەک هەندێ لە ڕۆشنبیرە بۆرجوازییە گەورەکان بۆ نمونە (سارتەر) خیانەتی لە چینە کۆمەڵایەتیەکەی خۆی کرد.

دواتر لە سییەکانی سەدەی بیستەم دیاردەیەکی تازە سەریهەڵدا، ئەویش هەڵکشانی نازیەت و گەشتنی هێتلەر بوو بە دەسەلات بەشێوەیەکی دیموکراسی ساڵی 1933. سەرەتا ئەدرنۆ بایەخێکی زۆر بە نازیەت نەداو وایدەبینی دیاردەیەکی تێپەڕە و بەخێرایی دەڕەوێتەوە و نامێنێت، ئەویش دوای ئەوەی خەڵکی هیچ و پوچی سەرکردەکانیان بۆ دەردەکەوێت. بەدرێژایی ساڵ و نیویێک ئەدرنۆ لەو باوەڕەدا بوو گەرچی نازیەکان لە ئەڵمانیادان، ئەو دەتوانێ هەر لە ئەڵمانیا بمێنێتەوە و، دەتوانێ درێژە بە بەردەوامی تویژینەوە فەلسەفی و مۆسیقیەکانی بدات، بەڵام لە ناوەڕاستی ساڵی 1934دەرکی بەوەکرد هەڵەیە و ئاستی تاریک و تۆقێنەری ئایدۆلۆژیای هێتلەری بۆ ئاشکرابوو، ئەودەم جانتاکانی کۆکردەوە و خۆی ئامادەکرد بەرەو لەندەن ڕابکات.

ئیدی دوای ئەوە دەچێتە قۆناغی تاراوگە کە پازدە ساڵی خایاند (1934- 1949). ساڵانی بەرایی تاراوگەی لە زانکۆی ئیکسفۆرد بەسەربرد (1934- 1938)، دواتر ساڵی 1938سەفەردەکات بۆ نیویۆرک و تاکو ساڵی 1941تێیدا دەمێنێتەوە، پاشان لە نێوان ساڵانی (1941 -1949) دەچێت بۆ شاری (لۆس ئەنجلۆس) و لە زانکۆکانیدا دەستدەکات بە خوێندن. ئیدی دوای ڕوخانی ڕژێمی نازی و گەڕانەوەی ڕژێمی دیموکراسی بۆ ئەڵمانیا، ئەدرنۆ دەگەڕێتەوە نیشتیمانەکەی و نزیکەی بیست ساڵێك تێدا دەژی و ساڵی 1969 لە ئەڵمانیا کۆچی دوایی دەکات.

ئەدرنۆ لە (پاریس)ەوە نامەیەك بۆ هۆرکهایمەری هاوڕێی دەنوسێ و پێیڕادەگەیەنێ کە لەگەڵ هاوسەرەکەی بەنیازن بێن بۆ ئەمریکا، لەو نامەیەدا هاتووە: "بارودۆخی ئەوروپا تەواو نائومێدە و تێکچووە، هێتلەر سەرکەوتن دوای سەرکەوتن بەدەستدەهێنێ و بە دڵنیاییەوە

(نەمسا)ش داگیردەکات. هاوکات ئەو جولەکانەی لە ئەڵمانیا ماونەتەوە ئەوا لەڕەگوڕیشەوە پاکتاودەکرێن، بۆچی؟ چونکە ڕژێمی نازی دەستیگرتووە بەسەر موڵك و ماڵیاندا و هەژار کەوتون و هیچ وڵاتێکیش لە جیهاندا نییە پێشوازی لە هەژار بکات، بەڵام ئێمە توانیمان تەنها بە سەڵتی خۆمان ڕزگاربکەین".

لە (نیویۆرك) هۆرکهایمەر و هەندێ لە ڕۆشنبیرانی دیکە پێشوازییان لێکرد. ئاشکرایە لە میانەی جەنگی جیهانی دووەمدا، قوتابخانەی فرانکفۆرت لە ئەڵمانیاوە گواستیەوە بۆ نیویۆرك. ئەدرنۆ هەستیکرد ئەو لە دەستەی ڕزگاربووە بەختەوەرەکانە و ئەم پەرەگرافەی وت: "ئێمە بەختەوەرانی نێو ئەو نەهامەتییە گشتی و سەرتاپا گیرەین کە لە هەموو لایەکەوە دەوریداوین". دواتر قوتابخانەی فرانکفۆرت جارێکی دیکە لە نیویۆرکەوە دەگوازرێتەوە بۆ لۆس ئەنجلس و هۆرکهایمەری سەرۆکی قوتابخانەکە لەوێ نیشتەجێ دەبێت، ئەدرنۆش گەرچی نیویۆرکی خۆشدەویست و تێدا ڕاهاتبوو، بەڵام ناچاربوو بکەوێتە دوای هاوڕێکەی، ئەدرنۆ نەدەبوو لە هاوڕێ گەورەکەی دابڕێ، چونکە پێکەوە خەریکی ئامادەکردنی کتێبێکی گرنگ بوون بە ناونیشانی "جەدەلیەتی ڕۆشنگەری، یان جەدەلیەتی عەقڵ". ئەم کتێبە ساڵی 1947 لە هۆڵەندە چاپکرا، زۆرێك پێیانوایە ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە گرنگانەی دوای جەنگی جیهانی دووەم بڵاوبووەتەوە.

هەندێ لە بیرمەندەکان وایدادەنێن ئەو کتێبەی سەرەوە لەگەڵ کتێبێکی دیکەی ئەدرنۆ بە ناونیشانی "دیالەکتیکی سلبی" گرنگترین دوو کتێبێکە ئەم فەیلەسوفە بە درێژایی ژیانی نوسیویەتی. ئەدرنۆ لەو دوو کتێبەدا شۆڕشێکی سەختگیر لە دژی عەقڵی خۆرئاوا ڕادەگەیەنێ، عەقڵێك خیانەتی لە پرنسیپەکانی ڕۆشنگەری کردووە یاخود لەو پرنسیپانە لایداوە و فاشیزم و نازیزمی بەرهەمهێناوە.

بەم شێوەیە ئەدرنۆ وازی لەو تێڕوانینە خۆشباوەڕییەی خۆی هێنا بۆ مێژوو کەلەسەرەتادا تەبەنی کردبوو، لەشوێنیدا تێڕوانینێکی ڕەشبین شوێنی گرتەوە، ئیدی جامی توڕەبونی خۆی بەسەر عەقڵی ئامێرگەرای نەفعی شارستانیەتی خۆرئاوا قڵپکردەوە و بە عەقڵێکی تۆتالیتار لەقەڵەمیدا.

هەندێ لە بیرمەندان دەڵێن ئەدرنۆ لەژێر کاریگەری کاولکارییەکانی جەنگی جیهانی دووەم، زیاد لە پێویست هێرشی کردە سەر مۆدێرنە و عەقڵی ڕۆشنگەری، لێرەوە ئەدرنۆ بێ ئەوەی پێیبزانێ کەوتە داوی فاشیزمەوە کە دوژمنێکی سەرسەختی ڕۆشنگەرییە. لەبەرژەوەندی کێ ئەدرنۆ هێرشی کردە سەر ڕۆشنگەری و عەقڵ و مۆدێرنە؟ ئەی کەواتە بەدیلی عەقڵ چییە؟

ڕاستە لەسەر دەستی سەرمایەداری و بزوتنەوە فاشیستیەکان عەقڵی ڕۆشنگەری سروشتە جەدەلی و دیالەکتیکیەکەی خۆی لەدەستدا و گۆڕا بۆ عەقڵێکی سەرکوتکەر. بەڵام ئەمە نابێ وامانلێبکات هێرشبکەینە سەر خودی عەقڵ. یاخود لە هەوڵی ئەوەدابین عەقڵ تێکوپێك بشکێنین، وەك ئەوەی ئەدرنۆ و هۆرکهایمەر لەژێر کاریگەری شۆکی نازیەت و جەنگی جیهانی دووەمدا جێبەجێیان کرد.

هاپرماس کە قوتابی و هاوڕێی ئەدرنۆ بوو، دەڵێ "هیچ بەدیلێك بۆ عەقڵ نییە تەنها عەقڵ خۆی نەبێت" لێرەوە هەموو فیکری هاپرماس هیچ نییە تەنها هەوڵدانێکە بۆ تێپەڕاندنی ئەو قەیرانەی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەسەر دەستی دامەزرێنەرانی تێیکەوتبوو، ئەو قەیرانەش لە ئەنجامی نەمانی متمانە بە عەقڵی ڕۆشنگەری هاتبووە ئاراوە. عەقڵێك ئەم هەموو شارستانییەتەی بەرهەمهێناو پاشان لە میانەی دوو جەنگی جیهانییەوە ئەو شارستانیەتەی وێران کرد.

هاپرماس وایدەبینێ ئەدرنۆ بەهەڵەدا چوبوو کاتێ خۆی لەنێو تێڕوانینێکی ڕەشبینیانە بۆ مێژوو قەتیسکردبوو، زیاتریش بەهەڵەدا چوو کاتێ تەنها یەك ڕووی شارستانیەتی دەبینی، ڕووە ڕەگەزپەرست و تۆتالیتارییەکەی، عەقڵی خۆرئاوا جگە لەو ڕووە دزێوە ڕویەکی دیکە هەیە، ئەویش ڕووە زانستی و فەلسەفی و ژیارییەکەیەتی. لێرەوە نابێ فیکرەی ڕۆشنگەری و شارستانیەت بکەینە قوربانی، تەنها لەبەر ئەوەی لە ڕۆژگاری فاشیزم و نازیزمدا لە ڕێگا ڕاستەقینەکەی خۆی لایداوە، ئەم ڕوداوە دڵتەزێنە (مەبەست جەنگی جیهانی دووەمە-و.ك)، هیچ نییە تەنها فاسیلەیەکی کورت نەبێت لە کاروانە دووروردرێژەکە، کە پڕە لە دەستکەوت بۆ شارستانیەتی خۆرئاوا.

دواتر هاپرماس دەڵێ: لێرەوە هێرشکردنە سەرعەقڵ زیاد لە پێویست مەترسیدارە، چونکە تەنها لە بەرژەوەندی هێزە تاریکگەرا و فاشی و فەندەمینیتالیزمەکاندا کۆتایی پێدێت. ئەمەش ئەو ئاستەنگەیە هەریەك لە ئەدرنۆ و هۆرکهایمەر تێیکەوتن، گەرچی ڕەخنەکانیان کە ئاراستەی شارستانیەتی خۆرئاوایان کرد، ڕەخنەیەکی دروست بوو.

پاشان دانەر جەخت لەسەر قۆناغی دووەمی ژیانی ئەدرنۆ دەکات، ئەویش ئەو قۆناغەیە کە دەکەوێتە دوای گەڕانەوەی بۆ ئەڵمانیا، گەرچی ئەو لەمەنفا ڕەگەزنامەی ئەمریکی وەرگرتبوو، کەچی تەنها لە کۆتایی پەنجاکاندا ڕەگەزنامە ئەڵمانیەکەی بەدەستهێنایەوە. هۆرکهایمەر بە ساڵێك پێش ئەدرنۆ گەڕایەوە بۆ نیشتمانەکەی، واتە ساڵی 1948. ئەودەم تێبینی کرد ئەڵمانیا بۆ دووبەش دابەشبووە: ئەڵمانیای خۆرئاوا و ئەڵمانیای خۆرهەڵات. دوای گەڕانەوەی بۆ ئەڵمانیا، یەکەم شت کە هۆرکهایمەر جێبەجێی کرد، قەناعەتکردن بوو بە زانکۆی فرانکفۆرت کە مەڵبەندی توێژینەوەکەی وەربگرێ.

ئەدرنۆ ئەو بیست ساڵەی دوایی تەمەنی لە ئەڵمانیا بەسەربردو زۆر بەدەگمەن لێی دووردەکەوتەوە. بوو بە مامۆستای گەنجان، ئیدی لە سەرتاپای ئەڵمانیای خۆرئاوا دەنگی دەبیسرا. ئەدرنۆ هەوڵیدەدا ئامۆژگارییەکانی پێشکەش بە نەوەی نوێ بکات، تاکو ئەڵمانیا جارێکی دیکە نەکەوێتە بەرچنگی نازیەت و فاشیزم، یاخود نەکەوێتە بەردەمی ئایدۆلۆژیای تۆتالیتاری.

جگە لە هێربرت مارکۆزە و یۆرگن هاپرماس و ئەوانی دیکە، ئەدرنۆ لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی بیستەمدا بووە ویژدانی بیرکردنەوەی ئەڵمانیا. هەر هەمویان

دەستیانکرد بە لێکهەڵوەشاندنەوەی ئایدۆلۆژیای مۆدێرنی سەرمایەداری کە بووە هۆی ئەو هەموو ماڵوێرانی و کاولکارییە. ئەدرنۆ بۆ ئەوەی خۆی وەك ڕۆشنبیرێکی بە هەڵوێست پیشانبدات، دەستیکرد بە ڕوخاندنی سەردەمەکەی و کێشەکانی، تەواو وەك جان پۆل سارتەر.

لەوسەردەمەدا شۆڕشی خوێندکاران ڕویدا کە سەرجەم کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکانی گرتەوە، هەر لە فەرەنساوە بۆ ئەڵمانیا و وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، خوێندکاران داوای ئازادییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت سێکسیەکانیان دەکرد. لەو سەروبەندەدا قوتابخانەی فرانکفۆرت کە ڕەوتێکی مارکسیانەی هەبوو، بووە پێگەی ئایدۆلۆژی بۆ بزوتنەوە ناڕەزاییەکانی قوتابیان و کرێکارە چەپە توندڕەوەکان و ئەو دەستەواژە فیکرانەی پێدەبەخشین کە پێویستیان بوو، تاکو لێیەوە دژایەتی سەرمایەداری پێشکەوتوی پێبکەن.

جگە لەوداواکاریانە، شۆڕشی خوێندکاران کە ساڵی 1965 لە ئەوروپادا بەرپابوو، داوای چاککردنی زانکۆکان و شێوازی وانە وتنەوەیان دەکرد کە تەواو کۆن ببوو، هەروەها داوای ڕاوەستانی شەڕی دەکرد دژی ڤێتنام، ئەمە جگە لەو داواکاریانەی دیکە کە تێیدا داوای ڕوخاندن و نەمانی پەیوەندییە سەرکوتکردنەکانی نێو خودی کۆمەڵگایان دەکرد، ئەو پەیوەندیانەش پەیوەندی نێوان باوك و کوڕ، مامۆستا و خوێندکار، خاوەنکار و کرێکار، سەرۆك و ڕەعیەتەکەی بوو. بەڵام ئەدرنۆ وەك ڕۆشنبیرێك لەگەڵ سروشتی ڕادیکاڵانەی شۆڕشی خوێندکاراندا نەبوو، ئەو دەیویست هێمنیان بکاتەوە، هەربۆیە بە تۆمەتی ئەوەی گوایە ژێر بەژێر پەیوەندی لەگەڵ بۆرجوازیەتی سەرمایەداردا هەیە، تۆمەتباریان کرد. بەم شێوەیە لە دیدی خوێندکارانەوە ئەدرنۆ لە ڕۆشنبیرێکی شۆڕشگێڕی کۆدەتاچییەوە بووە ڕۆشنبیرێکی کۆنەپەرستی کۆنزەرڤاتیڤ!

ئەدرنۆ دوای ئەوەی تەواو بێزار و نائومێد بوو، لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵیدا بە سەکتەی دڵ گیانی لەدەستدا.

### سەرچاوە

بیان الکتب 2005/8/22.

# فایلی ژمارەی داهاتوو

# یۆرگن هابرماس

وەرگێڕە بەڕێزەکان ئاگادار دەکەینەوە کە لە ژمارەی داهاتوودا فایلێك لە بارەی یورگن هابرماس بڵاودەکەینەوە، هیواداریت بە بەرهەمی بە پێز و دانسقە دەوڵەمەندی بکەن.

